چاکەو خراپە، ئەنجامی دەدەن، کارێکە لەسەرەتاوە، لەپێش دروستکردنی بوونەوەردا، لەسەریان نووسراوە، یا ئەمەی کە ئەمڕۆ ئەو خەڵکە ئەنجامی دەدەن، بەپێی چارەنووسی دێرین‌و نەخشەو پلانی پێشین نییە، بەڵکوو بەپێی پێشهاتەکانە لە ئاییندەداو خەڵکەکە خۆیان سەربەخۆ نەخشەو پلانی بۆ دادەڕێژن‌و بەپێی ئەو نەخشەو پلانە نوێیە ئەنجامی دەدەن؟ ئەمەیش لەسەر ئەو بنەڕەتە: کە پێغەمبەری خودا ئەوەی پێیان ڕاگەیاندووەو بووە بە بورهان‌و قەواڵەو بەڵگەی ڕۆشن لەسەریان؟

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وەڵامی ئەم پرسیارەی ئەم دوو پیاوەدا فەرمووی: (نەخێر! بەپێی نەخشەی نوێ نییە، بەڵکوو بەپێی پلان‌و نەخشەی چارەنووسی پێشینە، کە لەپێش دروستکردنی بوونەوەردا، ڕەنگی ڕێژراوەو ئێستا ئەوان هەنگاو بەهەنگاوو قۆناغ بەقۆناغ، زۆر بەوردی، بەبێ زیادوکەم پیادەی دەکەن). ئەوجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ پشتیوانی‌و پشتگیریی فەرموودەکەی خۆی فەرمووی: (پێوەری ڕاستی‌و دروستی ئەوە، کەکار ئێستا بەپێی نەخشەی چارەنووسی پێشینە، ئەم فەرمایشتەی قورئانی نامەی خودایە کە دەفەرموێ: {وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا-الشمس-٩١ - ٧/٨}. واتە:

سوێندم بەگیان‌و بەوەی کە ڕێکی خستووە، ئەوجا یا خستوویەتیە سەر ڕێگەی بەدکاری‌و خراپە، یا خستوویەتیە سەر ڕێگەی چاکەو لەخوا ترسی).

{تاج/٥، زنجیرە: ٦، لاپەڕە: ٣٥١، ژمارە: ٥١٦١ ج/٤}. باسی: خواکردو چارەنووس.

١٦٩٩- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْتَقَى هُوَ وَالْمُشْرِكُونَ فَاقْتَتَلُوا فَلَمَّا مَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى عَسْكَرِهِ وَمَالَ الاخَرُونَ الَى عَسْكَرِهِمْ وَفِي اصْحَابِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى

اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ لا يَدَعُ لَهُمْ شَاذةً وَلا فَاذةً الا اتَّبَعَهَا يَضرِبُهَا بِسَيْفِهِ فَقِيلَ: مَا اجْزَا مِنَّا الْيَوْمَ احَدٌ كَمَا اجْزَا فُلانٌ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) امَا انَّهُ مِنْ اهْلِ النَّارِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْقَوْمِ: انَا صَاحِبُهُ. قَالَ: فَخَرَجَ مَعَهُ كُلَّمَا وَقَفَ وَقَفَ مَعَهُ وَاذا اسْرَعَ اسْرَعَ مَعَهُ قَالَ: فَجُرِحَ الرَّجُلُ جُرْحًا شَدِيدًا فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ فَوَضعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بالارْض وَذبابَهُ بَيْنَ ثدْيَيْهِ ثمَّ تَحَامَلَ عَلَى سَيْفِهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَخَرَجَ الرَّجُلُ الَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: اشْهَدُ انَّكَ رَسُولُ اللّٰهِ قَالَ: وَمَا ذاكَ: قَالَ الرَّجُلُ الَّذي ذكَرْتَ انِفًا: انَّهُ مِنْ اهْلِ النَّارِ فَاعْظَمَ النَّاسُ ذلِكَ فَقُلْتُ: انَا لَكُمْ بِهِ فَخَرَجْتُ فِي طلَبِهِ ثمَّ جُرِحَ جُرْحًا شَدِيدًا فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ فَوَضعَ نَصْلَ سَيْفِهِ فِي الارْض وَذبابَهُ بَيْنَ ثدْيَيْهِ ثمَّ تَحامَلَ عَلَيْهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): عِنْدَ ذلِكَ انَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ اهْلِ الْجَنَّةِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ وَهُوَ مِنْ اهْلِ النَّارِ وَانَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ اهْلِ النَّارِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ وَهُوَ مِنْ اهْلِ الْجَنَّةِ.

(الحديث: ٤٢٠٣، اطرافه في: ٤٢٠٢، ٤٢٠٧، ٦٤٩٣، ٦٦٠٢)؛ [١٦٩٩]

**سەهلی کوڕی سەعدی ئەل ساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەگەڵ دوژمنی هاوبەشکارانا ئاوقەدی یەك بوون و بوو بەجەنگ لە نێوانیان دا، جا کاتێ هەردوولا بەرەو بەرەی خۆیان کشانەوە، پیاوێ هەبوو لەناو یارانی پێغەمبەردا لەکاتی شەڕەکەدا بەرەنگاری هەریەکێ لە لەشکری دوژمن ببوایە، بوارەی نەدەدا، بەشمشێر دایدەگرت، یارانی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر پێغەمبەر و ڕەزای خوا لەوان) فەرموویان: بەڕاستی ئەمڕۆ فیسارە کەس فریامان کەوت، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (دەی ئەو زەلامە لە ئەهلی دۆزەخە) پیاوێ لەهاوڕێیان**

---

**[١٦٩٩] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٧١ - ٤٢٠٣ بخاری. مسلم: ٦٦٨٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٦ رقم الباب/٧٧).**

فەرمووی: دەبێ ئەم نهێنییە بدۆزمەوە. فەرمووی: جا شوێنی دەکەوێ لەکاتی شەڕکردن و هەڵمەت بردن دا، پیاوە ئازاکە لە کوێ دەویستێ ئەویش لەگەڵی دەوێستێ، لەکوێ خێرادەڕوا ئەویش خێرا دەڕوا، جالەکاتی جەنگین دا پیاوە ئازاکە زامار دەکرێ، زامێکی سەختی لێ دەکرێ جا پەلە لەمەرگی خۆی دەکا، مشتووی شمشێرەکەی لەسەرزەوییەکە دادەنێ و نووکەکەی لە نێوانی هەردوو مەمکی خۆیا دادەنێ و ئەوجا بە هەموو هێزی خۆی بە حوججەت خۆی دەدا بەسەر شمشێرەکەی دا و خۆی دەکوژێ! جا پیاوەکەی کە شوێنی کەوتبوو هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) وە عەرزی کرد: شایەتی بەحەق دەدەم کە تۆ پێغەمبەری ڕەوانە کراوی خودای بۆ سەر بەرەی ئادەمیزاد، فەرمووی (دروودی خودای لێ بێ) (چۆن؟) گوتی: چونکە ئەوەی فەرمووت لەبارەی ئەو پیاوەوە هاتەدی، ئەوە بوو کەتۆ فەرمووت ئەو پیاوە لەخەڵکی دۆزەخە، مەر دومەکە ئەوەیان بەلاوە زەحمەت بوو، ئەو ئەوەندە ئازاو سوودمەندبێ بۆ سوپای ئیسلام کەچی دۆزەخیش بێ!! منیش پێیانم گوت: لێی گەڕێن بۆ من و من ئەم نهێنییەتان بۆ دەردەخەم، ئیتر شوێنی کەوتم، جا پیاوە کە چۆن زامار بوو، وەچۆن خۆی کوشت ئاوا لەنووکەوە گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) . جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پاش بیستنی ئەم داستانە فەرمووی: (پیاوی واهەیە کردارو ڕەفتاریوەك کردارو ڕەفتاری بەهەشتی وایە، لەخەڵك وایە بەهەشتییە، بە لام خۆی دۆزەخییە، پیاوی وایش هەیە بەپێچەوانەوە، لەخەڵك وایە کە دۆزەخییە، بەڵام خۆی بەهەشتییە). خوایە! بمانپارێزی لەشتی وا. (بڕوانە: تاج/١ ل/٤٠ ز/٦ ف/٤ - باسی باوەڕ بەچارەنووس).

وفي رواية عن ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ فَقَالَ رسول اللله صلى الله عليه وسلّم قُمْ يَا فُلانُ فَاذنْ انَّهُ لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ الا مُؤْمِنٌ انَّ اللّهَ لَيُؤَيِّدُ الدِّينَ بالرَّجُلِ الْفَاجِرِ (الحديث: ٤٢٠٤، اطرافه في: ٣٠٦٢، ٤٢٠٣، ٦٦٠٦)[١].

لەگێڕانەوەیەکدا، لەئەبوهورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (جا خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی:(ئەی فیسارەکەس! ئادەی هەڵسە، بەفەرمانی خواو پێغەمبەری‌خوا، جاڕبدەبە ناو خەڵکەکەدا و بانگەواز هەڵدەکە: بێجگە لەموسوڵمان کەسی تر ناچێتە بەهەشت، بەهەشت لەسەر کافری بێباوەڕ حەرامە، زۆر جاریش وا دەبێ کە خودای گەورە بەهۆی پیاوی بەدکارەوە یاریدەی ئەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە دەدات). (بڕوانە: ژ:١٣٨٠ تجرید).

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

ئەم جۆرە فەرموودەیە لە زۆر ڕووەوە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە:

١- وەك: پیاو نموونەیە نەوەك مەرج و قەید، ژنیش هەروایە لە کاتی وادا، واتە: کەسەکە ژن بێ یان پیاو جیاوازی نییە.دووەم: مەبەست لەم جۆرە تەعبیرانە (ئەوە دۆزەخییە) یا (ئەوە لەئاگردایە) ئاگری هەتاهەتایی نییە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە: کە بەهۆی هەندێ کاری گوناهەوە، شایانی ئەوەیە کە بچێتە ناو دۆزەخەوە، وە بەپێی تاوان و گوناهەکەی لەدۆزەخا بمێنێتەوە، دوایی لە دۆزەخ دەرچێ و بچێتە ناو بەهەشت، مەگەر لەهەندێ حالا کە کابرا کافر، یامونافق، یامولحید بێ. هەتا ئەمڕۆکەش زۆر جار خودا بەهۆی پیاوی بەدکارەوە، ئیسلام سەردەخا. دەڵێن: ئەم پیاوە ناوی

(١) راجع الرقم السابق . - المترجم .

قزمان بووه، راڤەنووسان وایان لەقەڵەم داوە، کە قەزمان بەکافری مردبێ، یابە فاسقی.

٢- زانایان دەفەرموون: خۆ کوژ بەدکارو فاسقە، بەڵام بە خۆکوژین کافر نابێ، کەواتە: ئەبەدی نابێ لەدۆەخا.

٣- ناونیشانی باش ئاشکرا بکرێ باشە، وەك: ئەوە بگوترێ: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە زانایەکی گەورەیە، کاکە احمد شێخ وەلی خوابووە، خەواریقی شەرعی لێ بینراوە بۆ ئەم بڕگەیە ئیمامی عەسقەلانی لە فەتحولباریدا بەدەق دەفەرموێ: (وفي الحديث جواز اعلام الرجل الصالح بفضيلة تكون فيه).

٤- بەبێ ڕاجیایی، بەپێی دەقی ئایەتی قورئان، هەموو گوناهێ بێجگە لە هاوڕێ بڕیاردان بۆ خودای گەورە، ئەگەری لێ خۆشبوونی هەیە وە زۆربەی ئەم هەوالانەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەم بارەیەوە ڕایگەیاندوون لەم جۆرەن، لەبەر ئەوە بۆ ئێمە واباشە لەم کاتا نەداعیبرەت و پەندو دەرس و وانە لەفەرموودەکە و ناوەڕۆکەکەی وەربگرین، نەوەك گومانی بە دوقسەی خراپ بەم جۆرەکەسانەی لەم جۆرە فەرموودانە دا ناوبراون بکەین، چونکە زۆرینەیان لەوە دوا ئیسلام بوون مرۆی باشیان لێ دەرچووە.

## (٢) باب حجاج آدَم وَ موسى عليهما السلام
## باسی دهمهقالێی ئادهمو مووسا (درودی خودایان لهسهر بێ)

١٧٠٠- حديث أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ « احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى ، فَقَالَ لَهُ مُوسَى يَا آدَمُ أَنْتَ أَبُونَا خَيَّبْتَنَا وَ أَخْرَجْتَنَا مِنَ الْجَنَّةِ . قَالَ لَهُ آدَمُ يَا مُوسَى اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِكَلاَمِهِ ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَ اللَّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً . فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى ، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى» ثَلاَثًا.[1700]

ئـهم فهرموودهیـه لـه ژمـاره: (١٨٤٢)ی پوختـهی موسـلیمدا ئاوایـه، زۆر روونو ئاشکرایه:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ عِنْدَ رَبِّهِمَا، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى. قَالَ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الَّذِى خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَسْجَدَ لَكَ مَلاَئِكَتَهُ، وَأَسْكَنَكَ فِى جَنَّتِهِ، ثُمَّ أَهْبَطْتَ النَّاسَ بِخَطِيئَتِكَ إِلَى الأَرْضِ، قَالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى الَّذِى اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ، وَبِكَلاَمِهِ، وَأَعْطَاكَ الأَلْوَاحَ فِيهَا تِبْيَانُ كُلِّ شَىْءٍ وَقَرَّبَكَ نَجِيًّا، فَبِكَمْ وَجَدْتَ اللَّهَ كَتَبَ التَّوْرَاةَ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ؟ قَالَ مُوسَى: بِأَرْبَعِينَ عَامًا. قَالَ آدَمُ: فَهَلْ وَجَدْتَ فِيهَا: (وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى)؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَفَتَلُومُنِى عَلَى أَنْ عَمِلْتُ عَمَلاً كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ أَنْ أَعْمَلَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِى بِأَرْبَعِينَ سَنَةً»، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى». {الحديث: ٦٦٨٤ = ٦٧٠٠. بخاری. قدر: ٦٦١٤. أبو داود. السنة: ٤٧٠١}:

ئـهبو هـورهیره (رهزای خـودای لێ بـێ) فـهرمووی: خۆشهویـست (درووودی خودای لهسـهر بـێ) فـهرمووی: (ئـادهمو مووسـا (درووودی خودایـان لهسـهر بـێ)

[1700] بخاری. قدر: ٦٦١٤، پوختهی موسلیم/٥، ژماره: ١٨٤٢ = ٦٦٨٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٢ رقم الباب/١١).

لەخزمەتی پەروەردگاریاندا بوو بە دەمەقاڵێیان، لە ئەنجامدا ئادەم مووسای بۆردا، مووسا فەرمووی: تۆ ئەو ئادەمەی کە خودای گەورە بەدەستی خۆی دروستی کردیو لەگیانو رەحمەتی خۆی گیانی کرد بە بەرتاو، بە فریشتەکانی خۆی فەرموو کورنووشیان بۆ بردیو، لە بەهەشتی خۆیدا دایناو، کەچی بەتاقە گوناهێ ئەم خەڵکەت لە بەهەشت دەرکردو، داتپەڕاندن بۆسەر زەوی!).

ئادەمیش فەرمووی: تۆیش ئەو مووسایەی کە خودا پەسەندی کردیو هەڵیبژاردیو کردیتی بە پێغەمبەرو قسەی لەگەڵدا کردیو لەچەند تەختە لەوحێکا تەوراتی بۆ ناردی، کە باسو خواسی هەموو شتێکیان تیادا بوو، سەرەڕای ئەمانەیش نزیکی کردیتەوە لەخۆیەوەو رازو گوفتوگۆی لەگەڵ کردی. ئادەم فەرمووی: باشە، ئەدی وەك لە تەوراتا دیوتە بەچەند ساڵ لەپێش دروستکردنی مندا خودا تەوراتی نووسیوە؟ مووسا فەرمووی: بەچل ساڵ. ئادەم فەرمووی: باشە ئەم ئایەتەت لە تەوراتا دیوە کە دەفەرموێ: {وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى - طه — ٢٠/١٢١}. واتە: ئادەم لە فەرمانی خودا دەرچوو، وە ئەو ئاواتە جوانە، کە برێتی بوو لە مانەوەی ئێجگاری لە بەهەشتا، لەدەستی دەرچوو، فەرمووی: بەڵێ. فەرمووی: دە ئیتر چۆن سەرزەنشتم دەکەی لەسەرکردنی کارێ کە خودا بەر لەوە کەمن دروست بکا، بەچل ساڵ لەسەری نووسیوم کە ئەوکارە بکەم؟).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جا ئاوا ئادەم مووسای بەزاندو بۆڕیدا). {تاج/١، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٩، ج/٤}. باسی: باوەڕ بەچارەنووس.

## (٥) باب قَدَّرَ عَلَى إبنِ آدَم حَظَهُ مِنَ الزِنَا وَغَيْرِه
## هەموو نادەمیزادێ بەشی خۆی داوێنپیسی، یان گوناهی تری لە چارە نوسراوە

١٧٠١- حديث أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - « إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَا ، أَدْرَكَ ذَلِكَ لاَ مَحَالَةَ ، فَزِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ ، وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ ، وَالنَّفْسُ تَمَنَّى وَتَشْتَهِي ، وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ كُلَّهُ وَيُكَذِّبُهُ» [١٧٠١]

لە ژمارە: (١٨٥٠)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «كُتِبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ نَصِيبُهُ مِنَ الزِّنَا مُدْرِكٌ ذَلِكَ لاَ مَحَالَةَ، فَالْعَيْنَانِ زِنَاهُمَا النَّظَرُ، وَالأُذُنَانِ زِنَاهُمَا الاسْتِمَاعُ، وَاللِّسَانُ زِنَاهُ الْكَلاَمُ، وَالْيَدُ زِنَاهَا الْبَطْشُ، وَالرِّجْلُ زِنَاهَا الْخُطَا، وَالْقَلْبُ يَهْوَى وَيَتَمَنَّى، وَيُصَدِّقُ ذَلِكَ الْفَرْجُ وَيُكَذِّبُهُ». {الحديث: ٦٦٩٦ = ٦٧١٠ فم. تجريد البخاری بالکوردی/٥، رقم: ١٩٦٧ = ٦٢٤٣، ٦٦١٢ فتح الباری}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو ئادەمیزادێ خودا بەشی خۆی داوێنپیسی لەچارەی نووسیوە، خواە ناخواە دەشێ تووشی ئەوە ببێ، داوێنپیسی چاو برێتییە لە روانینی نارەوا، وە داوێنپیسی گوێ برێتییە لە گوێگرتن لەشتی نادروست، وە داوێنپیسی زمان برێتییە لە گوتەو قسەکردنی نادروست، وە داوێنپیسی دەست برێتییە لەدەست وەشاندنو شت بەناهەق بردن، وە داوێنپیسی پێ برێتییە لە رۆیشتن بۆ ئیشی نارەوا، وە داوێنپیسی دەم برێتییە لە ماچو مۆچ، وە دڵ ئارەزووی ئەو بێ شەرعییە دەکاو، دەروونو نەفسیش

---

[١٧٠١] تجريد البخاری بالکوردی/٥، ژمارە: ١٩٦٧ = ٦٢٤٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٥٠ - ٦٦٩٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٩ رقم الباب/١٢).

ئاواتی ئەوە دەخوازێ. جا ئینجا دامەن (فەرج – عەورەت - شەرمگا)یش ئەمە بەدی دەهێنێ، بە کردەوە، یا رەفزی دەکا). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٩٠، ژمارە: ١٦٢٢ – تەماشاکردنی ناڕەوا}.

لەژمارە (١٩٦٧)ی تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُما قَالَ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا أَشْبَهَ بِاللَّمَمِ مِمَّا قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَا أَدْرَكَ ذَلِكَ لَا مَحَالَةَ فَزِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ وَالنَّفْسُ تَتمَنَّى وَتَشْتَهِي وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ أَوْ يُكَذِّبُهُ. (الحديث ٦٢٤٣ طرفه في: ٦٦١٢):

لە ئیبنو عەباس -ڕەزای خوایان لێ بێ- پرسیار کرا: مەبەست لە (لَمَمْ) لەم ئایەتەدا چییە، کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ... (٥٣/٣١) سورة النجم – واتە: خودا لەگوناهە وردەکانی ئەوکەسانە خۆش دەبێ، کە لەگوناهە گەورەکانو لەگوناهە ناشیرینە حەیابەرەکان خۆیان دەپارێزن﴾. لێیان پرسی مەبەست لە (لەمەم) لەم ئایەتەدا چییە؟ فەرمووی: شتێکی وام نەدیوە کەلە (لەمەم) بکا، وەك ئەمەی، کە ئەبوهورەیرە، لە پێغەمەرەوە دەیگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (هەموو ئادەمیزادێ خودا بەشی خۆی داوێنپیسی لەچارەی نووسیوە، خواە ناخواە دەشێ ئەوەی تووش ببێ، جا داوێنپیسی چاو برێتییە لەتەمشا کردنی نادروست، داوێنپیسی زمان بریتیە لەقسەکردنی نادروست وە دڵیش ئارەزووی ئەوە دەکاو، دەروونیش ئاوات بۆ ئەو بێ شەرعییە دەخوازێ، لەئەنجاما دامەن (فەرج = عەورەت = شەرمگا)یش ئەمە بەکردەوە بەدی دەهێنێ، یا رەفزی دەکا. (ریاض/٤ ل/١١٩٨ ز/٢٩٠ ژ/١).

## (٦) باب معنى: كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الفِطرَةِ وَحُكم مَوت أطفَال الكفَّارِ وَ أطفَال المُسلِمين

## هەموو منداڵێ، كاتێ لە دايك دەبێ، بە سروشت، بە خوداكرد، ئامادەیە بۆ خوداناسی، بڕیاری مناڵانی بێباوەڕانو مناڵانی موسوڵمانان، كەكاتێ بە منداڵی دەمرن

١٧٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ، وَيُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ»؟ ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: (فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ) الآيَةَ. {الحديث: ٦٦٩٧ = ٦٧١١ فـم. تجريد البخاري بالكوردي/ ٢، رقم: ٦٤٤ = ١٣٥٩، ١٣٥٨، ١٣٨٥، ٤٧٧٥، ٦٥٩٩. تحفة الأشراف: ١٣٢٥٨}:[(١٧٠٢)]

ئەبو هورمیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو منداڵێ كاتێ لەدایك دەبێ، بە سروشت، بە خودا كرد، ئامادەیە بۆ قەبووڵی ئایینی پاك، ئامادەیە بۆ خواناسین، ئەگەر وازی لێ بهێنرێ بەردەوام دەبێ لەسەر خواناسی، بەڵام لەوەدوا باوكو دایكیو نەریتو دەستوورو باوی ناو كۆمەڵو دەوروبەر دەیگۆڕنو لەڕێ دەری دەكەن، جا هەیە باوكو دایك، یا دەوروبەر دەیكەن بە جوولەكە، یا دەیكەن بەگاور، یا دەیكەن بە ئاگر پەرست، یا دەیكەن بەشتێ تر.

بەڵێ هەموو منداڵێ لە سەرەتاوە، بە خوداكرد، لەسەر ئایینی ڕاستو دروستو پاكو پوخت لەدایك دەبێو ئامادەیی تەواوی تیایە بۆ وەرگرتنی

---

[(١٧٠٢)] تجريد البخاري - مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكوردية/٢، ژمارە: ٦٤٤ = ١٣٥٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٥٢ - ٦٦٩٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٣ رقم الباب/٨٠).

یەكتاپەرستی، هەروەك چۆن بەچكەی ئاژەڵو ماڵات لەسەرەتاوە، بە شێوەی گشتی، بە تەواوی‌و بەبێ كەم‌و كووڕی لەدایك دەبن، ئەوەتانێ نابینن كە بەچكەیێ لەو بەچكانە، لەكاتی لەدایكبووندا، لووتی بڕابێ، یا گوێی قرتابێ، یا كەمیی‌و كورتی‌و ناتەواوییەكی هەبێ، بەڵام پاش لەدایكبوون لێیان كوڵ دەكرێ، یا لووت‌و گوێ‌و دەست‌و قاچ‌و شاخی هەندێكیان دەكرێ، یا دەشكێ، یا دەقرتێ).

ئینجا ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر حەزیش دەكەن بۆ پشتیوانی ئەم باسە، كەوا لەم فەرموودەیەدا ئەم ئایەتە بخوێننەوە:

{فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ – الروم – ٣٠/٣٠}:

واتە: ئەو رەوشت‌و سروشتە پاكە خوداكردە بگرن، كە خودای گەورە هەر لەسەرەتاوە، بەرەی ئادەمیزادی لەسەر دروست كردووە، ئەوە ئایینی راست‌و دروستی دەستكردی خودا خۆیەتی، بۆیەكا هەرگیزاو هەرگیز گۆڕینی بۆ نییە لەلایەنی خوداوە. {تاج/١، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٨. باوەڕ بەچارەنووس (قەدەر)}:

ئەمەیش ژمارە: (٦٤٤)ی تەجریدی بوخاری‌یە، بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَوَ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ). ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: (فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ). (الحديث ١٣٥٩– اطرافه في: ١٣٥٨، ١٣٨٥، ٤٧٧٥، ٦٥٩٩):

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (هەموو منداڵێ كاتێ لەدایك دەبێ، بەسروشت، بەخودا كرد ئامادەیە بۆ قەبوڵی ئایینی پاك، ئەگەر

وازی لێ بهێنرێ بەردەوام دەبێ لەسەر خوداناسی، بەڵام لەوەودوا باوك و دایكی و نەریت و دەستوورو باوی ناو كۆمەڵ دەیگۆڕن و لەرێ دەری دەكەن، جاهەیە دەیكەن بە جوولەكە، هەیە دەیكەن بەگاور، هەیە دەیكەن بە ئاگرپەرست، هەیە دەیكەن بەجۆرێ تر، بەڵێ هەموومنداڵێ، هەروەك چۆن بەچكەی ئاژەڵ و ماڵات لە سەرەتاوە، بەتەواوی و بەبێ كەم و كوڕی لەدایك دەبن: ئەوەتانێ نابینن كە بەچكەیێ لەو بەچكانە، لەكاتی لەدایكبووندا، لووتی بڕابێ، یا گوێی قرتابێ، یاكەمی و كورتی و ناتەواوییەكی هەبێ، بەڵام پاش لەدایك بوون، لێیان كوڵ دەكرێ، یان لووت و گوێ و دەست و قاچییان، هی هەندێكیان دەقرتێ !) ئینجا ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر حەزیش دەكەن بۆ پشتیوانی ئەم باسە ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ -٣٠/٢٠﴾

واتە: ئەو ڕەوشت و سروشتە پاكە خودا كردە بگرن، كە خودای گەورە لە سەرەتاوە، بەنی ئادەمیزادی لەسەر دروست كردووە، ئەوە ئایینی ڕاستی دروستی دەستكردی خودا خۆیەتی، بۆیە هەرگیزو هەرگیز گۆڕینی بۆ نییە).(تاج/١/٣٨/- س/د/ت).

١٧٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) عَنْ أَطْفَالِ الْمُشْرِكِينَ؟ قَالَ: «اللَّهُ أعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ إِذْ خَلَقَهُمْ».
{الحديث: ٦٧٠٧ = ٦٧٢١ فم. تجريد البخاری بالكوردی/ ٢، رقم: ٦٦٠ = ١٣٨٣، ١٣٨٤، ٦٥٩٧، ٦٥٩٨، ٦٦٠٠ فتح الباری. أبو داود. سنة: ٤٧١١. نسائی. جنائز: ١٩٥٠، ١٩٥١. تحفة الأشراف: ٥٤٤٩} :[١٧٠٣]

---

[١٧٠٣] تجرید/٢، ژمارە: ٦٦٠ - ١٣٨٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٥٣ - ٦٧٠٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٣ رقم الباب/٩٣).

**ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی منداڵانی ناموسوڵمانەکانو بتپەرستانو هاوبەش پەیداکەرەکانەوە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیار کرا: ئایا منداڵی ئەمانە کە بەمنداڵی دەمرن، بەهەشتین یا دۆزەخین؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (خودا خۆی باش دەزانێ کە ئەو منداڵانە ئەگەر گەورە ببوونایەو ئەرکو تەکلیفیان لەسەر بوایە، کارو کردەوەیان چی دەبوو، بەڵام چونکە لەپێش رەسیدە بوونو باڵقبوونا مردوون، ئەوە ئەرکو تەکلیفی ئایینیان لەسەرنییە، کەوابوو لەبەرئەوە بەهەشتین). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠، لاپەڕە: ٣٦٢، ژمارە: ٥١٧٣. ئەوەی لەبارەی منداڵی نا موسوڵمانەکانەوە، لە ئاییندا روونکراوەتەوە}.**

**روونکردنەوە:**

**أ- چەند بڕیاری جیا جیا لەبارەی جێگەی منالانی بێباوەڕانەوە کە بەمنداڵی مردوون، یا دەمرن هەیە، وەك:**

**١- بەهەشتین، ئەمە مەزهەبی راستو دروستی جەماوەری زانایانەو بەڵگەی رۆشن بەزۆری لەسەری هەیە.**

**٢- پاشکۆی باوكو دایکیانن‌و ئەمانەیش وەك ئەوان دۆزەخین، بەڵام بەڵگەی ئەم رایە لاوازە.**

**٣- لەبەرزەخێکا دەبن لەنێوانی بەهەشتو دۆزەخا، ئەم رایەیش بەڵگەی دەقداریان نییە.**

**٤- لە بەهەشتا دەبن بەنۆکەرو کارەکەری بەهەشتییەکان، بەڵگەی ئەم رایەیش دیسان لاوازە. بەڵگەی ئەم رایەیش کێشەی زۆرە.**

**٥- لە دۆزەخدا تاقی دەکرێنەوەو ئەوەی لە ئەزموونەکەدا دەرچوو بەهەشتییە، ئەوەی کە دەرنەچوو دۆزەخییە.**

تاقی کردنەوەکەیش ئاوایە: (پارچەیێ لە ئاگری دۆزەخ جیادەکرێتەوە، لە قیامەتدا، فەرمان دەکرێ بەم چوار جۆرە کەسە: بەمندالّی نابالّق‌و بە شێت‌و بە ئەهلی فەترەت (کە ئەوانەن لەسەردەمی نەمانی پێغەمبەرایەتیدا ژیاون)‌و بەپیری خەلّەفاو، پێیان دەگوترێ: ئادەی بڕۆنە ناو ئەم ئاگرە سوورەوە، خودا خۆی ئەم فەرمانەیان پێ دەکا، جا ئەوانەی کە لەم چوار جۆرە کەسە بەدبەخت‌و چارە رەشبن، ناچنە ناوی‌و دەمە دەمێ لەگەلّ پەروەردگارا دەکەن‌و دەلّێن: ئەی خودایە! چۆن دەمانخەیتە ناو ئەم ئاگرەوە ئێمە لێی دەترسین‌و ناچینە ناوی. خودایش پێیان دەفەرموێ: ئێوە ئێستا فەرمانی خۆم دەشکێنن‌و بەگوێی خۆم ناکەن، دیارە لەدنیادا زیاتر بێگوێیی پێغەمبەرانی منتان دەکرد. جا ئەمانە دۆزەخین. بەلاّم ئەوانەی کە لەم چوار جۆرە کەسە بەختەوەربن بەگوێی خودا دەکەن‌و بەبێ سێ‌و دوو، زوو بەزوو فەرمانەکەی خودا بەجێ دەهێنن‌و خۆیان هەلّ دەدەنە ناو ئاگرەکەوە! ئیتر خودا لێیان رازی دەبێ‌و لە تاقیکردنەوەکەدا سەردەکەون‌و بەهەشتی بەرینی نەبڕاوە مسۆگەر دەکەن بۆ خۆیان هەتا هەتایە).

ب- چەند بڕیارێکی جیا جیایش سەبارەت بە مندالاّنی موسولّمانان، کە بە مندالّی مردوون‌و بەنا بالّقی تەمەنیان تەواو بووە:

١- بەکۆی دەنگی ئەوانەی کە لە زانایانی موسولّمانان، بایەخ‌و نرخ بۆ راکانیان هەیە، منالاّنی موسولّمانان، کە بەمندالّی، پێش رەسیدە بوون دەمرن بەهەشتین، لەزۆر لە مەلّبەندەکانی دوا رۆژا فریای باوك‌و دایکیان دەکەون.

٢- هەندێ لەم پرسەدا ئێست دەکەن‌و دەلّێن: مندالّەکەی حەزرەتی خدری زیندە کوشتی، خۆی کافرو بێ باوەڕ بوو، دۆزەخی بوو، بەلاّم باوك‌و دایکی

موسـولْمان بـوون‌و بەهەشـتی بـوون چـەند رایـێ تـریش هەیـە، پێویـست بـە نووسینیان ناکا، لەبەر زۆر لاوازییان.

١٧٠٤- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَوْلَادِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: (اللَّهُ إِذْ خَلَقَهُمْ، أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ). (الحديث ١٣٨٣- اطرافه في: ١٣٨٤، ٦٥٩٧، ٦٥٩٨، ٦٦٠٠): [١٧٠٤]

ئیبنو عەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی منداڵی ناموسوڵمان و هاوبەش پەیداکەرەکانەوە، لەپێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پرسیارکرا: ئایا منداڵی ئەمانە کە بەمنداڵی دەمرن، بەهەشـتیین یـا دۆزەخـین ؟ فـەرمووی: (خودا خۆی باش دەزانێ ئەو منداڵانە ئەگەر گەورە ببوونایەو تەکلیفیان لەسەر بوایە کاروکردەوەیـان چـی دەبـوو، بـەلاّم مـادەم لـەپێش ڕەسـیدەبووندا مـردوون ئـەوە ئـەرك و تـەکلییفیان لەسـەر نییـە، کەواتـە لەبەرئـەوە بەهەشـتیین). (تاج/١٠/٣٥ ف/٣).

---

[١٧٠٤] تجرید/٢، ژمارە: ٦٦٠ - ١٣٨٤، مسلم: ٦٧٠٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٢٣ رقم الباب/٩٣).

## ٤٧- كِتَابُ العِلْمِ
## نامەی زانینو زانست

{بڕوانە: تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی یەکەم، زنجیرە: ١٤، لاپەڕە: ٦٩، ژمارە: ٩٨ هەتا ژمارە: ١٣٧ لەزنجیرە: ١٤ وە هەتا زنجیرە: ١٩ + ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ٢٤١، لە ژمارە: ١٣٧٦ وە هەتا ژمارە: ١٣٩٢ + تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی/١، لە ژمارە: ٥٣ وە هەتا ژمارە: ١٠٨} + {پوختەی موسلیم لە زنجیرەی نامەکانەوە (٥٥) هەتا نامەی (٥٦) لە لاپەڕە: (٩٧)ەوە هەتا لاپەڕە: (١٠٣) لە ژمارە: (١٨٥٦) هەتا ژمارە: (١٨٦٣)}.

### (١) باب النَّهى عَنِ إتِبَاعِ مُتَشَابَهِ القُرآنِ وَالتَحْذِير مِنْ مُتَبعِيهِ وَالنَّهى عَنِ الإخْتِلاَفِ فِي القُرآن
### پێشگیریی لە شوێنکەوتنی ئایەتە موتەشابیهەکان، بەبێ زانستی تەواو لێیان، هەروەك پێشگری کراوە لە دووبەرەکی لە قورئاندا

١٧٠٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَـتْ تَـلاَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) (هُوَ الَّـذِى أَنْـزَلَ عَلَيْـكَ الْكِتَـابَ مِنْـهُ آيَـاتٌ مُحْكَمَـاتٌ هُـنَّ أُمُّ الْكِتَـابِ وَأُخَـرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَـاءَ الْفِتْنَـةِ وَابْتِغَـاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِى الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَـا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُولُو الأَلْبَابِ) قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) « إِذَا رَأَيْـتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَـمَّى اللَّـهُ فَاحْذَرُوهُمْ ». (الحـديث ٦٧١٧

شيحا = ٦٧٣١ فم. تجريد البخاري/٤ رقم/١٦٤٣ = ٤٥٤٧. أبوداود. سنة/٤٥٩٨. ترمذي. تفسير القرآن: ٢٩٩٣. تحفة الأشراف: ١٧٤٦٠).[١٧٠٥]

عائيشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوەو لەپاشا فەرمووی: کاتێ ئەو کەسانەت دی، کەشوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون، کەچەن واتایێ هەڵ دەگرن، کەپێیان دەگوترێ: ئایەتە موتەشابیهەکانو ڕواڵەتی ئەو ئایەتانە دەکەن بەبەهانەو مەهانەو چاوو ڕاوی لەمەردووم پێ دەکەنو خەڵکی پێ لەخشتە دەبەن، ئەی گوێدار! ئەی کەسێ کەئەم فەرموودەیەی منت پێ دەگات! بزانە کەئەوانە ئەوکەسانەن، کەخودا ناوی بردوونو دەربارەیان لەقورئانا فەرموویەتی: {فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِهِ ...}.

واتە: دەغەز لەدڵەکان لەدووی ئایەتە چەند واتا هەڵگرەکان دەگەڕێنو بەشوێن ئەو ئایەتانەدا دەگەڕێن کەلەیەك دەچنو مانای جۆراو جۆر هەڵدەگرن، بەنیازی ئەوەی کە ئاژاوەو ئاشووب بەرپابکەنو بەکەیفی خۆیان واتایان لێ بدەنەوە.

جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: جا کەواتە ئەی گەلی ئیسلام! خۆتانیان لێ بپارێزنو مەترسیتان لێیان هەبێ! (تاج/٤ ز/٤ ژ/٣٧٥٤ — سوورەتی ئالی عیمران).

١٧٠٦- عَنْ جُنْدَبِ بن عبدالله (رَضيَ اللهُ عنهُ) عنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: اقْرَءوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ عَلَيْهِ قُلُوبُكُمْ فَاذا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ (الحديث ٥٠٦٠- طرفه في : ٥٠٦١): [١٧٠٦]

---

[١٧٠٥] تجريد/٤، ژمارە: ١٦٤٣ = ٤٥٤٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٢٦ = ٦٧١٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٣).

جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ)دەفەرموێ :خۆشەویست (دروودو سلاوو ڕەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەی لێ بێو، سەرو ماڵو منداڵو دایكو باوكو هەستو نەست گشتی بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) دەفەرموێ: (ئەوەندە قورئان بخوێنن کە دڵتان لەسەریەتی، بەلام کەبێ تاقەت بوونو دڵتان لە لای خوێندنەکەتان نەما، یا قورئان خوێندنەکەتان سەری کێشا بۆ ناکۆکیو دوبەرەکیو شتی وا، ئیتر هەڵسنو واز لە قورئان خوێندن لەو کاتەدا بهێننو، ئەو کوڕو کۆمەڵەی کەوابێ چۆڵی کەنو بەجێی بهێڵن.( تاج الاصول في احاديث الرسول (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) بەرگی پێنجەم لاپەڕە: ٢٨٧ ز : ٧٨ ژ: ٧).

## ڕاڤەو شیکردنەوە :

(جوندوبی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سوفیانی بوجەلی)، لە هاوڕێیانە، لە سەردەمی پێغەمبەردا مێرد منداڵ بووە، دەگێڕێتەوەودەفەرموێ: (پێغەمبەری خودا(دروودی خودای لێ بێ) نەخۆش بوو، لەبەر ئەوە شەوێ یان دوو شەو شەونوێژی نەکرد). هەشت فەرموودەی لە بوخاری پیرۆز دا هەیە، گێڕانەوەی لە ئوبەیی کوڕی کەعبو لە حوزەیفەوە ئەنجام داوە. (بڕ: ژمارە: ٥٦٠ = بەرگی یەکەم لاپەڕە: ٥٣٨ + ژمارە: ٦٤٨ = بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٧١).

---

[١٧٠٦] تجريد/٤، ژمارە: ١٧٤٢ = ٥٠٦٠ بخاری. مسلم: ٦٧٢٠ = ٦٧٢٠ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦٦ رقم الباب/٣٧).

## (٢) باب في (الألَدِّ الخَصِم)
## (الألَدُّ الخَصِم) مەبەست لێی کێیە

١٧٠٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللَّـهِ الأَلَدُّ الْخَصِمُ ». {الحديث: ٦٧٢٢ = ، تجريد/٣، رقم: ١٠٦٦ = ٢٤٥٧، ٤٥٢٣، ٧١٨٨. ترمذى. تفسير: ٢٩٧٦. نسائى. آداب القُضَاة: ٥٤٣٨. تحفة الأشراف/١٦٢٤٨} :[١٧٠٧]

حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە، لەهەموو کەسێ زیاتر، ڕقی لەپیاوی شەڕانی شەڕ فرۆشی ڕق ئەستووری ڕەزا قورس و ڕەزا گرانە!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢٢، ژمارە: ٢٤٩٤، ج/٤}.

## (٣) باب إتباع سُنَنِ اليَهُودِ وَالنَصَارى
## بست بە بست لاسکایی ڕەفتارەکانی جوولەکەو گاورەکان، بە کوێرانە دەکەنەوە!

١٧٠٨- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ -صلى الله عليه وسلم- « لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ شِبْرًا بِشِبْرٍ وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِى جُحْرِ ضَبٍّ لاَتَّبَعْتُمُوهُمْ ». قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ آلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى قَالَ « فَمَنْ ». {الحديث: ٦٧٢٣ شيحا – ٦٧٣٧ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٣٧٨ = ٣٤٥٦، ٧٣٢٠. ترمذى. تفسير القرآن: ٢٩٧٦. نسائى. آداب القضاء: ٥٤٣٨. تحفة الأشراف: ١٦٢٤٨} :[١٧٠٨]

---

[١٧٠٧] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٦٦ = ٢٤٥٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٥٢ = ٦٧٢٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤٦ رقم الباب/١٥).

[١٧٠٨] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٧٨ = ٣٤٥٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٠٢ = ٦٧٣٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٩٦ رقم الباب/١٤).

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بست بە بستو هەنگاو بە هەنگاو لاسایی میللەتەکانی پێش خۆتان دەکەنەوەو چاو لە ڕەوشتو ڕەفتاری نالەبارو ناهەمواری ئەوان دەکەن، کوێرانە پەیڕەوییان دەکەن، تەنانەت ئەگەر گریمان ئەوان خۆیان بترنجێننە ناو کونی بزن مژەوە، ئێوەیش چاویان لێ دەکەنو خۆتانی تێ دەترنجێننو دەڵێن: ئەمانە بە بەلاش خۆیان ناکەن بە کونی بزن مژەدا، دیارە کە سوودو کەڵکێکی هەر هەیە!!).

فەرمووی: ئێمەیش عەرزیمان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! مەبەستت لە میللەتەکانی پێش ئێمە کێیە، ئایا مەبەستت لێیان جوولەکەکانو گاورەکانە؟ فەرمووی: (ئەی کێ؟). {تاج/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٦٢ – ڕەفتار کردن بە قورئانو بە سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)}.

**ڕوونکردنەوە:**

سوبحانەڵلا!؟ بەڕاستی ئێستا ئاوایە، ئەو خەڵکە بە بلیۆری ڕۆژئاوا وەك مەیموون، هەڵ دەپەڕێ، ڕێك وەك ئەوان باو باوی سوورو سەماو دەهۆڵو زوڕناو گۆرانیو مەیو بادەو یاریو قومارە، ئەوەی بۆ زوڕنا ژەنێ دەکرێ، بۆ ڕۆستەمی زاڵیش ناکرێ، ئەوەی بۆ گۆرانیبێژێ دەکرێ مەلیك مەحموود زیندوو ببێتەوە بۆی ناکرێ، بە گوێی خۆم گوێم لێ بوو: لە کەناڵێکی لایەنێکەوە، بە بۆنەی هاتنی سەری ساڵی زاینییەوە، کچێ دەیگوت: (بە ماچو بە سەما پێشوازیمان لە ساڵی نوێ کرد!).

قەت قەت وەك ئەمڕۆ فەلسەفەو حیکمەتو ئەدەبو زانستە گیانیو بەهرەییەکان ئاوا ساکارو ساویلکە نەبوون، غەزوی ئەقافیو مێشك شۆردنەوەی جەماوەرو خەریککردن بە فلیمی نێرو مێیو برەودان بە بەرەڵایی، کارێکی

وایان کردووە، جەماوەریان سڕکردووە، گەنجەکان بە زۆری بوون بە عەبەثیو بە هێبی، باوەڕیان بەهیچ نەماوە، نە بەخودا نە بە بەها کۆمەڵایەتیەکان، دوژمنی داگیرکەر پێویستی بە شیرو تیر نەماوە، بۆ گرتنی سەرو ماڵو خاكو نامووسی نەتەوەکان، بۆ غاراتکردنی سەرو ماڵو نامووسیان، لەباتی سوپاو شەڕو شۆڕ، بە مەیو بادەو بەنگو بەرەڵایی سڕی کردوون.

جێگەی داخە لاوەکانی خۆمان بە بەریقی ئەم هێرشە ناهەقە وا شەوارە کەوتوون، زۆربەیان وەك هەویر لە دەستی نانەوادا، خۆیان تەسلیمی ڕاگەیاندنی ڕۆژهەڵات کردووە، بە واتای وشە بوون بە دیلو دەروێشی ئەکتەرو سەماکارو نووسەرەکانی ئەوان، فڕیان بەسەر وڵاتو ئایینو مەردایەتیو کوردایەتیو ئاییندارییەوە نەماوە، هەروەك چۆن مەیموونێ لاسکایی لۆتییەك بکاتەوە ئاوا بەبێ زیادو کەم!

جا لەم ڕوانگەیەوە ئەم چیرۆکە عەنتیکەیەتان عەرزدەکەم کە نموونەیەکی زۆر جوانە، بۆ ئەم بارودۆخە ناهەموارەی کە ئەم موراهیقو دەمڕووتو لەززەت پەرستانە، بەناوی ڕاگەیاندنی ئازادەوە، لە وڵاتدا، بەبێ ڕەقابەو چاودێری کەس، پیادەی دەکەن: (خوا لێخۆشبوو ڕەفیق چالاك، جارێ گێڕایەوە، گوتی: جارێ تەمسیلییەکی جوانمان ڕێك خست، لە هۆڵێکی هونەری ئەنجامماندا، کچمان دەست نەکەوت بۆ شوێنی ڕەگەزی مێ، کوڕێکی لاوی جوان، بە بەرگی ژنانەوە ئەو ڕۆڵەی بینی. گوتی: ئەوا من بە خەیاڵی خۆم هیچم نەهێشتۆتەوە، دەمەوێ گەلی کوردی خۆم فێری ڕەوشتی بەرزو بەها بەرزە کۆمەڵایەتییەکان دەکەم، هانیان دەدەم لەسەر ئایینی پاكو بێگەردو دووریان دەخەمەوە لە کۆنە پەرستیو کۆیلەییو سەر شۆڕیو هانیان دەدەم لەسەر ئازایەتیو مەردایەتیو کوردایەتی پاكو پیرۆزو، شتی قێزەونیان لەبەر چاو

دەخەم، بە هەزارو یەك زمان بۆیان روون دەکەمەوە. لە راستیشدا ئەمە پەیامی هونەری رەسەنو هونەرمەندانی دڵسۆزی گەلو نیشتمانن، وە ئەمە بەشێوەی گشتی لە بەرهەمە پێشکراوەکانیانا رەچاو دەکرێ، وە سوپاس بۆ خودا تا رادەیەکی باش دڵسۆزیو نیاز پاکی، لەکارە هونەرییەکانی وڵاتی خۆماندا دەبینرێ، تەنانەت زۆریشیان پابەندن بە ئایینی خۆیانەوەو ماڵو منداڵیان پابەندن بە دینو رەفتاری بەرزەوە.

جا خوا لێخۆشبوو رەفیق چالاك گوتی: ئەوا ئێمەی دەستەی هونەرمەندەکان، لەپاش پێشکەشکردنی شانۆکەمان، شادمانین بەم خزمەتە جوانە، لە هەموو لایەکەوە پیرۆزباییو دەسخۆشیمان لێ دەکەنو بە چەپڵە رێزان ئافەرینمان دەکەن، تەنانەت چەندین حاجیو شێخو مەلایش، هەریەکی بە شێوەیێ، لەم بەرهەمەدا یارمەتییان داینو کار ئاسانییان بۆ کردین... جا وا ئێمەی دەستەی هونەرمەندەکان لەناو جەماوەرەکەدا مەستی ئەم سەرکەوتنەین، ئەوەندەمان زانی، کۆمەڵێ لاوی دەم رووتو کەللە پووت، کە خۆیان بە دەرەبەگو شتی وا دادەنا، سەر گەورەکەیان لەبەردەم جەماوەرەکەدا، هات بۆلای منو دەستی نایە سەرشانی کوڕەکە، کە رۆڵی کچی دەبینی، وە بەناوی هەموویانەوە، بەبێ شەرمانە، بە دەنگێکی شێرانە، وەك فەرمان دەرکا بۆ خزمەتکارێکی خۆی، دەقاو دەق بەمنی گوت:

(کاکی گەوواد! ئەم قەحبەیە ئەمشەو دابنێ بۆ ئێمە کە ئەم کۆمەڵەین، نەیدەیت بەکەسی تر کرێکەی چەندە بە زیادەوە دەیدەین!).

گوتی: منیش لەوەندە زیاترم پێ نەگوت: (کاکی موراهیقی دەم راستی ئەم کۆمەڵە دەم رووتە، ئەمە قەحبە نییە ئەمە نێرە پیاوە، منیش گەوواد نیم، بەڵام کەرم چونکە دەمەوێ کەرێکی وەك تۆ بکەم بە بەشەر! دانایانی پێشینان

جوانیان گوتووه کە دەڵێن: کەسێ هەوڵ بدا کەر بکا بە بەشەر، بەرە بەرە خۆشی دەبێ بەکەر!).

منی هەژاری دڵسۆزی گەلی کوردی خۆم تەنیا ئەوەندەم لەدەست دێ کە عەرزی دەستەڵاتدارانی دڵسۆزی کورد بکەم: (پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەم گەلی ئیسلامی منە، بە دەستی دەستەیەکی دەم رووتی هەرزەکاری هەرزەی پەتەڕی لەناودەچن).

## (٥) باب رفعُ العلمِ وَقَبْضُه وَظهُورِ الجهل وَالفِتَنِ في آخرِ الزَّمَانِ
## باسی بردنەوەی زانستو وەرگرتنەوەیو دەرکەوتنی نەزانیو ئاژاوە لە دوا زەمانا

١٧٠٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاط السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ وَيَثْبُتَ الْجَهْلُ وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ وَيَظْهَرَ الزِّنَا). (الحديث ٨٠ - أطرافه في: ٨١، ٥٢٣١، ٥٥٧٧، ٦٨٠٨): [١٧٠٩]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا فەرموودەیێ دەگێڕمەوە بۆتان، کەلەپاش من کەس نەیگێڕێتەوە بۆتان: خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (درودی خودای لەسەر بێ): یەکێکە لەنیشانەکانی نزیکبوونەوەی قیامەت: کەبەرەبەرە زانینو عیلمی دینی هەڵدەگیرێو نامێنێو جەهلو نەزانی بەکاروباری ئایینی پەرەدەستێنێو بڵاودەبێتەوەو ئارەق بەزۆریو بەئاشکرا دەخورێتەوەو شەروالپیسی دەبێ بەباوو ئاشکرا دەبێ، وەبەهۆی شەڕو شۆڕو

---

[١٧٠٩] تجرید/١، ژمارە: ٧٠ - ٨٠ بخاری. مسلم: ٦٧٢٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٣ رقم الباب/٢١).

ئاشووبەوە پیاو کەم دەبێ‌و ژن زۆر دەبێ، هەتا وای لێ دێ کەپەنجا ژن یەك پیاو دەبێ بەسەرپەرشکاریان!) (ت-٣ ل-٢٣٧ ژ-٢٣٥١ ز-٩٢).

١٧١٠- حديث أَبِي مُوسَى فَقَالاَ قَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – « إِنَّ بَيْنَ يَدَىِ السَّاعَةِ لأَيَّامًا يَنْزِلُ فِيهَا الْجَهْلُ ، وَيُرْفَعُ فِيهَا الْعِلْمُ ، وَيَكْثُرُ فِيهَا الْهَرْجُ ، وَالْهَرْجُ الْقَتْلُ» (١٧١٠)

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە پێش هاتنی قیامەتدا، بەکەمانێ، ڕۆژگەلێکی پڕ لە ئاشووب‌و خراپە ڕوو دەدەن، زانین — واتە زانینی ئایینی — هەڵ دەگیرێ‌و بەرەبەرە نامێنێ، نەزانی‌و نەفامی دەبێ بە باوو جێگەی زانین دەگرێتەوە، لەو ڕۆژگارەدا ڕۆژی ئاخوران‌و بخۆرانە، واتە: کوشت‌و بڕ!).

١٧١١- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ، وَيُقْبَضُ الْعِلْمُ، وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ، وَيُلْقَى الشُّحُّ، وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ». قَالُوا: وَمَا الْهَرْجُ؟ قَالَ: «الْقَتْلُ». {الحديث: ٦٧٣٣ = ٦٧٤٨ فم. تجريد البخاری بالكوردی/١، رقم: ٧٤ = ٨٥، ١٠٣٨، ١٤١٢، ٣٨٠٨، ٣٦٠٩، ٣٦٤٣، ٤٦٣٥، ٦٠٣٧، ٦٥٠٦، ٦٩٣٥، ٧٠٦١، ٧١١٥، ٧١٢١ فتح الباری. أبو داود. فتن: ٤٢٥٥ تحفة الأشراف: ١٢٢٨٢} :(١٧١١)

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویێ: (ڕۆژگار تەنگ دەبێتەوەو بەری ڕۆژگار تەنگەبەر دەبێت‌و خەڵك لەبەر سەرقاڵی‌و سەر جەنجاڵی‌و هەوڵ‌و تەقەلاو خەم‌و

---

(١٧١٠) بخاری. فتن: ٧٠٦٢. مسلم: ٦٧٢٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٩٢ رقم الباب/٥).

(١٧١١) تجريد البخاری/٣، ژمارە: ١٠٠٥ = ٢٢٧٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٧٥ - ٦٨٨٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٩٢ رقم الباب/٥).

خەفەتو پەرۆشی، هەست بە تێپەڕبوونی ناکەن، بەرە بەرە زانستو عیلمی ئایینی هەڵدەگیرێو نامێنێو جەهلو نەزانی بە کاروباری ئایینی پەرە دەستێنێو بڵاو دەبێتەوە، فەرتەنەو ئاژاوە پەرە دەستێنن، رژدیو چرووکی لەدڵا رەگو ریشە دائەکوتێو مەردوم رژدو رەزیلو چرووك دەبن، راوو رووتو تاڵانیو بڕۆ زۆردەبن، دنیا دەبێ بە ئاخوران‌و بخوران، عەرزیانکرد: قوربان! ئاخورانو بخوران چییە؟ فەرمووی: (کوشتو بڕە!). {تاج/١، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٦. دەستوورو ئادابی زانین + ریاضی صالحین/٢٦٥/٣، زنجیرە: ٢٤١، ژمارە: ١٣٩٢ – نامەی زانین}.

١٧١٢- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ لاَ يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ النَّاسِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يَتْرُكْ عَالِمًا، اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالاً، فَسُئِلُوا، فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا». {الحديث: ٦٧٣٧ = ٦٧٥٢ فم. تجريد البخاري بالكوردي/١، رقم: ٨٥ = ١٠٠، ٧٣٠٧. ترمذي. علم: ٢٦٥٢. ابن ماجة. مقدّمة: ٥٢. تحفة الأشراف: ٨٨٨٣}:[١٧١٢]

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خودا لەخۆیو باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە نەبێ کە خودا لەپڕ، عیلمو زانین لە بەندەکانی خۆی، لەو خەڵکە بگرێتەوە، وەك چۆن جلێ گورج لەبەر دابکەنرێ ئاوا لەناکاوا بەسڕین بیسڕێتەوە لەسینگیان، بەڵام خودا بەرە بەرە، بەرودوا زاناکان دەباتەوە بۆلای خۆی، تا وای لێ دێ عیلمو زانین نامێنێو هەڵ دەگیرێ، جا کاتێ نەزانین ماو نەزانا ما، ئەوجا رەشە

---

[١٧١٢] تجرید/١، ژمارە: ٨٥ = ١٠٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٥٨ = ٦٧٣٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣ رقم الباب/٣٤).

خەڵکەکە سەرۆکی نەزان و نەدان بۆ خۆیان دادەنێن و دەست دەکەن بە پرسیارکردن لێیان، جا ئەوانیش بە نەزانی و نادانی خۆیان فەتوایان بۆ دەدەن، ئیتر هەم خۆیان لەڕێ دەردەچن و هەم خەڵکی تریش لەڕێ دەردەکەن!).
{تاج/١، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٦. دەستوورو ئادابی زانین + ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ٢٤١، ژمارە: ١٣٩٢. نامەی زانین}.

## ٤٨- كِتَابُ الذِّكْرِ وَالدُّعَاءِ وَالتَوْبَةِ وَالإِسْتِغْفَارِ
## نامەی یادی خوداو نزاو پاڕانەوەو تەوبەو پەشیمانی و داوای لێبوردن لە خودا
### (١) باب الحث عَلَى ذكرالله
### هاندان لەسەر یادی خودا

{بڕوانە: تاجول ئوصول بە کوردی، بەرگی پێنجەم، زنجیرە/٥٨، هەتا زنجیرە/٩٤، لە ژمارە: ٤٩٣٩وە هەتا ژمارە: ٥١٥٦م + ریاچی صالحین/٢ بە کوردی لە زنجیرە/٢٤٤وە هەتا زنجیرە/٢٥٤، لە ژمارە: ١٤٠٨وە هەتا ژمارە: ١٥١٠ + تەجرید بوخاری بە کوردی/٥، زنجیرە/٨٣، لە ژمارە: ١٩٧٥وە هەتا ژمارە: ١٩٩٣ + پوختەی موسلیم/٥ لە ژمارە: ١٨٦٤وە هەتا ژمارە: ١٩٣٧ = نامەی نزاو پاڕانەوە + نامەی یادی خودای گەورە + نامەی پەنا گرتن بە خودا + نامەی پەشیمانی}.

١٧١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ): «يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلإٍ هُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ، وَإِنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْرًا، تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا، تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وَإِنْ

أَتَــانِي يَمْــشِي أَتَيْتُــهُ هَرْوَلَــةً». {الحــديث: ٦٧٤٦ = ٦٧٦١ فــم. تجريــد البخــاری بالكوردی/٥، رقم: ٢١٢٩ = ٧٤٠٥، ٧٥٠٥، ٧٥٣٧}:[١٧١٣]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (خـودای گـەورەو سـەروەر، لـە فەرموودەیـەکی پاکی پیرۆز (حەدیثێکی قودسی)دا دەفەرموێ: بەندەی من، خـۆی گومـانی چـۆن بێ، من وادەبم لەگەڵیدا، گومانی باش بێ بەمن، ئەوا منیش باش دەبم بۆی، ئەو گومانی خراپ بێ بەمن، ئەوا منیش خراپ دەبم بۆی. لەو دەمـەدا کەئـەو نـاوی من دەباو یادو زیکری من دەکا، ئا لەودەمەدا من خـۆم وام لەگەڵیـدا، جـا ئەگـەر ئەو بەتەنیا هەر خۆی یادو زیکری من بکا، ئەوا منیش هەرخۆم بـەنهێنی یـادی ئەو دەکەم، ئەگـەر ئـەو لـەناو کۆمـەڵێکا یـادو زیکـری مـن بکـا، ئـەوا منـیش بـە ئاشکرا لەناو دەستەیەکا، لەناو کۆمەڵێکا، کە لـەوان باشـترین، یـادی ئـەو دەکـەم. ئەگەر بەندە بستێ لەمن نزیك ببێتـەوە، مـن باڵێ لـەو نزیـك دەبمـەوە، ئەگـەر ئـەو باڵێ لـەمن نزیـك بێتـەوە، مـن دوو بـاڵ لـەو نزیـك دەبمـەوە، ئەگـەر ئـەو بەرۆیشتنی ئاسایی بـێ بـۆلای مـن، مـن بـە لۆقـە دەچـم بەپیریـەوە. واتـە: هـەتا بەندەی من خۆی بەتاعەت لەمن نزیـك بکاتـەوە، منـیش رەحمـەتی خـۆم زیـاتر لەو نزیك دەکەمەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤٩٣٩ — گەورەیی یادو زیکـری خـودا + ریاضـی صـالحین/٣، لاپـەڕە: ٢٩٣، زنجـیرە: ٢٤٤، ژمـارە: ١٤٣٥ — بـەهرەی زیکرو یادی خوداکردن}.

---

[١٧١٣] تجرید/٥، ژمارە: ٢١٢٩ - ٧٤٠٥ بوخاری. پوختـەی موسـلیم/٥، ژمـارە: ١٨٨٦ = ٦٧٤٦ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٩٧ رقم الباب/١٥).

## (٢) باب في أسماءِ اللهِ تَعالى وَفَضْل مَنْ أحْصَاها

## ناوه پیرۆزەکانی خودای گەورەو بەهرەی کەسێ کە سەرژمێریان بکا

١٧١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مَنْ حَفِظَهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ وَإِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ». {الحديث: ٦٧٥٠ = ٦٧٦٥ فم. بخاري. دعوات: ٦٤١٠، ٧٣٩٢. ترمذي. دعوات: ٣٥٠٨. تحفة الأشراف: ١٣٦٧٤}:[١٧١٤]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە، لەسەد یەك کەم، هەرکەسێ لەبەریان بکاو کار بە واتاو مەبەستیان بکا، دەچێتە بەهەشت! خودا خۆی تاقەو حەز لە تاق دەکا). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤٩٥٨ — ناوە جوانەکانی خودا}.

### ڕوونکردنەوە:

خودا خۆی تاكو تەنهایە، نەهاوەڵی هەیە، نەهاو جووتو نە باوكو دایكو کوڕو کچو نەکەس، بەڵام دروستکراو جووتن، وەك ژنو مێردو باوكو کوڕو دایكو کچ. ئەو شتانەیشی کە تاکنو خودا حەزی لێیانە، وەك: پێنج نوێژە، طەوافو سەعی حەوتن، رەجمی شەیتان حەوت بەردە، خۆ پاك کردنەوە بەسێ بەردە، ئاسمانەکانو زەمینەکان حەوتن، حەفتە حەوت رۆژەو شتانی تری تاکی لەم بابەتە.

---

[١٧١٤] بخاری. دعوات: ٦٤١٠. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٦٤ = ٦٧٥٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٤ رقم الباب/٨١).

## (٣) باب العزم بالدُّعاءِ ولاَ يقُلْ: إنْ شئتَ

## به جەخت نزاكردنو پاڕانەوە لە خودا، وە نزاخوێن نەڵێ: ئەی خودایە ئەگەر حەز دەكەیت ئەم نزایەم گیرا بكە

١٧١٥- حديث أَنَسٍ – رضى الله عنه – قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – « إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ فَلْيَعْزِمِ الْمَسْأَلَةَ ، وَلاَ يَقُولَنَّ اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ فَأَعْطِنِى . فَإِنَّهُ لاَ مُسْتَكْرِهَ لَهُ» [١٧١٥]

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كاتێ یەكێكتان لە خودا دەپاڕێتەوەو نزایەك لە خودا داوا دەكا، با نەڵێ: ئەی خودایە! ئەگەر خۆت ئارەزوو دەكەی، ئەوا ئەو شتەم پێ ببەخشە، با داواكەی یەكلایی بكاتەوەو سوور بێ لەسەری‌و بە جەخت داوا لە خودا بكاو ئەگەرو مەگەر لە نزاو پاڕانەوەدا مەكەن، بەڵكوو بەبێ مەرج‌و بەستنەوە بە شتێكەوە، ڕێك‌و ڕاست داوای شت لە خودا بكەن، وەك ئەوە بەبێ قەید بڵێین: خودایە! لە گوناهمان خۆشبە، زیندوومان سەلامەتكە، لە مردوومان خۆشبە، شیفای نەخۆشمان بدە، دڵ‌و ماڵ‌و وڵاتمان ئاوەدان بفەرموو، مرازمان جێبەجێ بفەرموو، چونكە كەس زۆری لەسەر خودا نیە، تۆ بڵێیت‌و نەڵێیت، ئەگەر خودا مەیلی لەسەر شتێ نەبێ نایكات). {تاج/٥، زنجیرە/٥٠١٩} .

١٧١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمُ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي إِنْ شِئْتَ لِيَعْزِمِ الْمَسْأَلَةَ فَإِنَّهُ لَا مُكْرِهَ لَهُ. (الحديث ٦٣٣٩ طرفه في: ٧٤٧٧): [١٧١٦]

---

[١٧١٥] بخاری. دعوات: ٦٣٣٦. مسلم: ٦٧٥٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٠ رقم الباب/٢١).

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە -درووودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: کەستان مەڵێن، لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا، خودایە! ئەگەر خۆت ئارەزوو دەکەی لێم خۆشبە: خودایە: ئەگەر خۆت ئارەزوودەکەی رەحمم پێبکە، داواکەتان یەك لایی بکەنەوەو سوور بن لەسەری و بەجەخت داوا لەخودا بکەن و ئەگەر و مەگەر لەدووعا و پاڕانەوەدا مەکەن، بەڵکوو بەبێ بەندو مەرجو تەعلیق بەشتێکەوە، داوای شت لەخودا بکەن، وەك ئەوە بڵێن: خودایە: لەگوناهمان خۆشبە، زیندوومان سەلامەتکە، لەمردوومان خۆشبە، شیفای نەخۆشمان بدە، دڵو ماڵو وڵاتمان ئاوەدان بفەرموو، چونکە کەس زۆری لەسەر خودانییە، تۆ بڵێیت و نەڵێیت، خودا ئەگەر مەیلی لەسەر شتێ نەبێ نایکا. (تاج/٩ ل/١٨٦ ز/٦٧ ژ/١٠ — دەستوورو یاسای نزاو پاڕانەوە).

## (٤) باب كَرَهَة تَمَنى المَوْتِ لِضُرٍ نَزَلَ بِهِ

## خۆزگەخواستن بۆ مەرگ لە کاتی ناخۆشیدا ناباشە، بەڵکوو لە هەموو بارودۆخێکا نزای باش باشە

١٧١٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ مُتَمَنِّيًا فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِى مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِى، وَتَوَفَّنِى إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِى». {الحديث: ٦٧٥٥ = ٦٧٧٠ فم. تجريد البخارى بالكوردى/٥، رقم: ١٨٦٦ = ٥٦٧١، ٦٣٥١، ٧٢٣٣. فتح البارى.

[١٧١٦] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٨٣ = ٦٣٣٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٧٨ - ٦٧٥٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٠ رقم الباب٢١).

أبو داود. جنائز: ٣١٠٨. ترمذي. جنائز: ٩٧١. نسائي. جنائز: ١٨٢٠. ابن ماجة. زهد: ٤٣١٩. تحفة الأشراف: ٩٩١}:[١٧١٧]

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر یەکێکتان دووچاری زیانێ بوو، یا تووشی ناخۆشییەك بوو، خۆزگە بۆ مردن نەخوازێو مەرگ بەئاوات نەخوازێ، ئەگەر هەر ناچاربوون، شتی وابکەن بڵێن: خودایە! هەتا ژیانم بۆم باشترە بم ژێنە، کەییش مردنم باشتربوو بۆم بم مرێنە!).

١٧١٨- عَنْ خَبَّابٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ اكْتَوَى سَبْعَ كَيَّاتٍ فَقَالَ: إِنَّ أَصْحَابَنَا الَّذِينَ سَلَفُوا مَضَوْا وَلَمْ تَنْقُصْهُمُ الدُّنْيَا وَإِنَّا أَصَبْنَا مَا لَا نَجِدُ لَهُ مَوْضِعًا إِلَّا التُّرَابَ وَلَوْلَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِهِ.(الحديث ٥٦٧٢ اطرافه في: ٦٣٤٩، ٦٣٥٠، ٦٤٣٠، ٦٤٣١، ٧٢٣٤): [١٧١٨]

خەبباب (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەوت شوێن سکی خۆی داخ کردبوو فەرمووی: هاوڕێ پێشینەکانمان، بەروو سووری مردنو سەریان نایەوە، بەهۆی خۆشیی جیهانەوە لەپاداشی دوا ڕۆژیان بەهیچ جۆرێ کەم نەبۆوە چونکە تێکەڵاوی دنیا نەبوو بوون. بەڵام ئێمە بەپێچەوانەوەی ئەوانەوە، ئەوەندە سامان و دارایمان کەڵەکە کردووە، جێ نەماوە تێی کەین، مەگەر خانووی پێ بکەین، وە لەبەر ئەوە نەبێ کە پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ڕێگری

---

[١٧١٧] تجريد البخاری/٥، ژمارە: ١٨٦٦ = ٥٦٧١ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٨٤ = ٦٧٥٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٠ رقم الباب/٣٠).

[١٧١٨] بخاری: ٥٦٧٢. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٨٥ = ٦٧٥٨، ٦٧٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٠ رقم الباب/٣٠).




کردووه لێمان که مهرگ بهئاوات بخوازین، دهنا مهرگی خۆمم بهئاوات دهخواست). (تاج/١ ز/١٩١ ل/٥١٦ ژ/١).

**(٥) باب مَنْ أحَبَّ لِقَاءَ اللّه أحَبَّ اللّهُ لِقَاءَهُ وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللّهِ كَرِهَ اللّهُ لِقَاءَهُ**
**هەرکەسێ حەز بە دیداری خودا بکات، خودایش حەز بە دیداری ئەو دەکات وە کەسێ حەزی بە دیداری خودا نەبێ، خودایش حەزی بە دیداری ئەو نییە**

١٧١٩- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ. (الحديث):[١٧١٩]

ئەم فەرموودەیە لە ریاض الصالحین دا، لەعائیشە وە ئاوایە: عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر –دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی– فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: هەرکەسێ حەز بەدیداری خودا بکات، خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکا، وەهەرکەسێ حەز لەدیداری خودا نەکات، خودایش حەز لەدیداری ئەو ناکاتو حەزی لەچارەی نییە، عائیشە فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: جا خۆئەی پێغەمەری خودا! کەسمان حەز لەمردن ناکەین، گوایە دەبێ خوداش حەز لەئێمە نەکا؟

خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (مەبەست ئەمە نییە کە تۆ تێ ی گەیشتویت، بەلاٚم مەبەست ئەوەیە کاتێ موسوڵمان لەسەرە مەرگا فریشتەی ڕەحمەت، موژدەی رەحمەتو رەزامەندیی‌و ڕێزلێگرتنی خودای

---

[١٧١٩] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٢٤ - ٦٥٠٧ بخاری. پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ٤٥٤ - ٦٧٦٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/٤١).

دەدمنێ لەگەڵ نازو نیعمەتو بەهرەی بەهەشتا، ئیتر ئەویش هیچی وەك ئەو دنیا پێ خۆش نابێ، وەحەز لەدیداری خودا دەکاو، خوداش حەز بەدیداری ئەو دەکا، ناموسوڵمانیش کاتێ کەمردن قورتمی دەگرێ، وەموژدەی سزای سەختی خودای پێ دەدرێ، ئیتر هیچی تری وەك ئەو جیهان پێ ناخۆش نابێ، وەحەز لە دیداری خودا ناکاو، خوداش حەز لەچارەی ئەو ناکا). (ریاض/٤ ل/١٣٣٦ ز/٣٧٠ ژ/١٨٤٨/٤١ ـموسلیم).

فەرموودەی ژمارە: (٤٥٤)ی موسلیم ڕاگوێز دەکەین بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە:

عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ، أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ، كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ ». فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ؟ فَكُلُّنَا نَكْرَهُ الْمَوْتَ، قَالَ: « لَيْسَ كَذَلِكِ، وَلَكِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا بُشِّرَ بِرَحْمَةِ اللَّهِ وَرِضْوَانِهِ وَجَنَّتِهِ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ، فَأَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا بُشِّرَ بِعَذَابِ اللَّهِ وَسَخَطِهِ، كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ وَكَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ». {الحديث: ٦٧٦٣ = ٦٧٧٨. تجريد/٥/٢٨٠، رقم: ٢٠٢٤ = ٦٥٠٧}:

وَفِي رِوَايَةٍ عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ ». قَالَ: فَأَتَيْتُ عَائِشَةَ. فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَذْكُرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَدِيثًا إِنْ كَانَ كَذَلِكَ، فَقَدْ هَلَكْنَا. فَقَالَتْ: إِنَّ الْهَالِكَ مَنْ هَلَكَ بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ ». وَلَيْسَ مِنَّا أَحَدٌ إِلاَّ وَهُوَ يَكْرَهُ الْمَوْتَ، فَقَالَتْ: قَدْ قَالَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَلَيْسَ بِالَّذِى تَذْهَبُ إِلَيْهِ، وَلَكِنْ إِذَا شَخَصَ الْبَصَرُ، وَحَشْرَجَ الصَّدْرُ، وَاقْشَعَرَّ

الْجِلْدُ، وَتَشَنَّجَتِ الأَصَابِعُ، فَعِنْدَ ذَلِكَ مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ). {الحديث: ٦٧٦٧ = ٦٧٨٢ فم}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ حەز بەدیداری خوا بکا، خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکا، وە هەرکەسێ حەز لە دیداری خودا نەکا، خودایش حەز لەدیدارو چارەی ئەو ناکا). عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ ئەگەر مەبەست لەم حەز پێ نەکردنە حەز نەکردن بێ لەمردن، ئەوە کەسمان حەزمان لەمردن نییە، کەواتە حەزمان لە دیداری خودا نییەو خودایش حەزی لە دیداری ئێمە نییە؟ فەرمووی: (مەبەست ئەوە نییە کەتۆ تێی گەیشتوویت، بەڵام موسوڵمان لە سەرەمەرگا فریشته مژدەی ڕەحمەتو سۆزو ڕەزامەندیی خودای دەدەنێ، لەگەڵ موژدەی شاد بوون بە بەهەشت، ئیتر ئەویش هیچی تری وەك ئەودنیا پێ خۆش نابێ، وە حەز لەدیداری خودا دەکاو خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکا، کافرو بێ بڕواش کاتێ کە مردن قورتمی دەگرێو موژدەی سزاو تۆڵە لێسەندنو تووڕەیی خودای پێ دەدرێ، ئیتر هیچی تری وەك ئەودنیا پێ ناخۆش نابێ، وە حەز لە دیداری خودا ناکاو خودایش حەز بەدیداری ئەو ناکا. لەگێڕانەوەیەکا شورەیحی کوڕی هانی فەرمووی: ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ حەز بەدیداری خوا بکا، خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکا، وە هەرکەسێ حەز لە دیداری خودا نەکا، خودایش حەز لەدیدارو چارەی ئەو ناکا!).

ئەبو شورەیح فەرمووی: جا بەم بۆنەیەوە چووم بۆ خزمەتی عائیشه، عەرزیم کرد: ئەی دایکی باوەڕداران! فەرموودەیەکم لە ئەبو هورەیرەوە

رزگارکردنی مەککەدا، کە لەمێژوودا ناسراوە بە (فەتحی مەککە) لەپاشکۆی پێغەمبەرەوە سوار بوو بوو، زەینەب کچێکیشی هەبوو، ناوی ئومامە بوو، ئەو کچەزایەی پێغەمبەر بوو، کەجاروبار لەنوێژدا دەیکردە قەڵادۆشکانی، کاتێ فاطیمەی پووری مرد، ئومامە شووی کرد بەعەلی کوڕی ئەبو تالیب، خاتوو ئومامە کوڕێکی لەعەلی بوو، ناوی موحەممەد بوو، ساڵی هەشتی کۆچی زەینەب بەمەرگی خودا مرد، ئوم عەتیەو چەند ژنێکی تر شۆردیان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی سەرپەرشتی شۆردنەکەیی کرد، کراسەکەی خۆی هەڵدا بۆ ژنە مردوو شۆرەکان، کە لەژێر کفنەکەوە، لەسەر گۆشتەوە بیکەنە بەری، ئەوانیش وایان کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی شۆردنو کفن کردنی تەرمی ئوم کولثوومی کچیشی بووە، وەخۆی پارچە پارچە کفنەکەی ئوم کولثوومی هەڵ دەدا بۆیان، لەسەر ئەم شێوەیە:

لەیلای کچی قائیفی ئەل – ثەقەفییە، فەرمووی: ئوم کولثوومی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە کۆچی دوایی کرد، خۆم یەکێك بووم لەو ژنانەی کە دەیان شۆرد، پێغەمبەر خۆی لەلای دەرگاکە دانیشتبوو، کفنەکەی ئوم کولثوومی پێ بوو، پارچە پارچە دەیدایە دەستمان: لەپێش پێشا کراسەکەی دایە دەستمان، ئینجا سەرکراس، ئینجا سەرپۆش، ئینجا سەردەریی، لەپاش ئەمانە هەموو چەرچەفێکی ئاودامانیان لەتەرمەکەیەوە پێچا، ئوم کولثووم کە روقیەی خوشکی مرد، شووی کرد بەئیمامی عوثمان، ئەویش لەساڵی نۆی کۆچیدا لەلای عوثمان مرد. زەینەب لەپێش بیعثەت (ناردنی پێغەمبەر)دا بە دە ساڵ لەدایك بووە، نزیکەی (٣٠) سی ساڵ ژیاوە). {بڕوانە: ژمارە: ٥٦٦ لە بلوغ المرام}.

٢- **روقيـه**، سـالّی (٣٣) سـیی‌و سێ لەتەمـەنی پێغەمبـەر روقیـە لـەدایك بووە، واتە (٧) بەحەوت ساڵ لەپێش بوونی پێغەمبـەر، بـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە دایك بووە. هاوسەری ئیمامی عوثمان بوو، عوثمان لەپێشا کۆچی پێ کرد بۆ حەبەشە، منالێکی لە عوثمان بوو ناوی عەبدوڵلا بووو، روقیە زۆر جوان بـوو، دوو کۆچی کـردووە، لەغـەزای بـەدردا کۆچی دوایـی کـردووە، نزیکەی بیست سالێ ژیاوە، دووەم کچی پێغەمبەر بووە.

٣- **ئوم کولثووم** (رەزای خودای لێ بێ) لـەپاش مـەرگی روقیـەی خوشکی، سالّی (٣) سێی کۆچی شووی کرد بە عوثمان، لەسالّی نـۆی کۆچـی لـەلای عوثمـان مەرگ بوو بەمیوانی، مندالّی نەبوو لێی.

٤- **فـاطیمـەی زەهـراء**، راجیـایی سـەبارەت بەسـالّی لـەدایکبوونی هەیـە، هەندێ دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەمـەنی چل‌و یـەك سـاڵ بووە، کەفاطیمە لەدایك بووە، هەنێ تر دەفەرموون: تەمـەنی (٣٥) سـیی‌و پێـنج ساڵ بووە، کەفاطیمە لەدایك بووە، دیارە کەفاطیمەو بـراو خوشـکەکانی، بێجگـە لـە ئیبراهیمیـان، هـەموویان لەدایکـە خەدیجـە بـوون، کـە یەکـەم هاوسـەری پێغەمبـەر بـووە، فاطیمـە شـووی کـرد بەعـەلی تەمـەنی (١٥) پـازدە سـاڵ بـوو، لـەپاش مـەرگی پێغەمبــەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەشـەش مـانگ فاطیمەیش دەمرێ. لەئیمامی عـەلی (٣) سێ کـوڕی بـووە: حەسـەن‌و حوسـەین‌و موحـسین، موحـسینیان بـەمنالّی دەمـرێ، هـەروا (٢) دوو کچیـشی لێـی دەبـێ کەبریتین لە زەینەب‌و ئوم کولثووم.

## (٢٠) باب إستحباب الدُعَاء عِنْدَ صياحِ الدِّيك
## نزاو پاڕانەوە، لە کاتی کەڵەشێرخوێندندا سوننەتە

١٧٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ، فَاسْأَلُوا اللَّهَ تَعَالَى مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا، وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ شَيْطَانًا». {الحديث: ٦٨٥٧ = ٦٨٧٦فم. تجريد البخاري بالكوردي/٣، رقم: ١٣٣٢ = ٣٣٠٣ فتح الباري. أبو داود. أدب: ٥٦٠٢. ترمذي. دعوات: ٣٤٥٩. تحفة: ١٣٦٢٩}: [١٧٤٠]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ گوێتان لە قووقەی کەڵەشێر بوو، داوای بەهرەو بەخشش لە خودای گەورە بکەن، چونکە ئەوە بۆیە دەخوێنێ چونکە فریشتەی دیوە، کاتێ گوێتان لەزەڕەی کەریش بوو، پەنابگرن بەخودا لەشەڕی شەیتان، وەك ئەوە بڵێن: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: پەنادەگرم بە ڕەحمەتی خودا لە شەڕی شەیتانی بێبەش لە ڕەحمەتی خودا) چونکە کەر کە دەزەڕێنێ شەیتان دەبینێ، یا شەیتان دێتە بەرچاوی!). {تاج/٥، زنجیرە: ٧٧، ژمارە: ٥٠٩٦ – گوتەی کاتی خوێندنی کەڵەباب}.

## (٢١) بابُ دُعَاءِ الكَرَبِ
## نزای کاتی مەینەتیو سەخڵەتی

١٧٤١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الأَرْضِ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ». {الحديث:

---

[١٧٤٠] تجريد البخاري بالكوردي/٣، ژمارە: ١٣٣٢ = ٣٣٠٣ بخاری. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٨٨١ = ٦٨٥٧ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٥٩ رقم الباب/١٥).

٦٨٥٨ = ٦٨٧٧ فم. تجريد البخاري بـالكوردی = مختـصر صـحيح البخـاری/٦، رقـم: ١٩٨٥ = ٦٣٤٥، ٦٣٤٦، ٧٤٢٦، ٧٤٣١ فتح الباری. ترمذی. دعوات: ٣٤٣٥}:[١٧٤١]

ئيبنو عەبباس (رەزای خودايان لیّ بیّ) فـەرمووی: دەسـتووری پیّغەمبـەر (درووده‌ی خـودای لەسـەر بـیّ) وابـوو، لـەكاتی سـەخڵەتیو دڵتـەنگیو مەینـەتو ليّقەوماندا، کەخەم دایدەگرت دەیفەرموو:

«لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الأَرْضِ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ». واتە:

خودای راسـتو دروسـتو بەهـەق هـەر یـەزدانی پاکەو بـەس، خـودای تـر نییە بیّجگە لەخۆی، کە خودایەکی گەورەو هیّمنو خاوەنی حیلمو حەوسەڵەیە، خـودای بەهـەق هـەر یـەزدانی پاکە، کـە خـاوەنی عەرشـی مەزنـە، کـە تـەختو بارەگای حوکمڕانی خۆیەتی، خـودای بەهـەق بـەس یـەزدانی پاکـە، کـە خـاوەنی یەك بەیەکی گشت ئاسمانەکانو زەمینە، کە خـاوەنی عـەرشو بارەگـای نـازداری خــودای گــەورەو ســەروەرە!). {تــاج/٥، زنجـيرە: ٧٢، ژمـارە: ٥٠٧٨ – نزاکـانی مەینەتبار}.

---

[١٧٤١] تجريـد البخـاری = مختـصر صـحيح البخـاری/٥، ژمـارە: ١٩٨٥ = ٦٣٤٥ بخـاری. پوختـەی موسليم/٥، ژمارە: ١٨٧٦ = ٦٨٥٨ تـرقيم شيحا لـصحيح مـسلم. (بخاری رقـم الكتـاب/٨٠ رقـم الباب/٢٧).

## (٢٥) باب بيان أنَهُ يُستَجَابُ لِلدَّاعِى مَا لَم يَعجَل فَيَقُولُ: دَعَوتُ فَلَم يُستَجَبْ لِى
## نزاى بەندە گیرا دەبیَ بە مەرجیَ پەلە نەكا، وەك ئەوە بڵیَ: من هەر نزا دەكەمو هەر گیرا نابیَ

١٧٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ فَيَقُولُ قَدْ دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي. (الحديث ٦٣٤٠):[١٧٤٢]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) لەخۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بیٚ- دەفەرمویٚ: نزاو پاڕانەوەو دۆعاتان گیراو قبولٚ دەبیٚ، بەمەرجیٚ پەلە پەل نەكەن، وەك ئەوە بلێن: من هەر دووعا دەكەم و هەرگیرانەبوو!. واتە: بەردەوام بوون لەسەر دووعاو كۆڵ نەدان لەپاڕانەوە نیشانەی گیرابوونیەتی.

(تاج/٩ ز/٦٧ ل/١٨٦ ژ/١١) + (ریاض/٣ ل/١٠٧٠ ز/٢٥٢ ژ/٤).

له ژمارە: (١٨٧٧)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ): عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَنَّهُ قَالَ: «لاَ يَزَالُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ مَا لَمْ يَسْتَعْجِلْ». قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَا الاِسْتِعْجَالُ؟ قَالَ: «يَقُولُ: قَدْ دَعَوْتُ وَقَدْ دَعَوْتُ فَلَمْ أَرَ يَسْتَجِابُ لِى، فَيَسْتَحْسِرُ عِنْدَ ذَلِكَ وَيَدَعُ الدُّعَاءَ». {الحديث: ٦٨٧١= ٦٨٩١ فم. تجريد البخارى بالكوردى/٥، رقم: ١٩٨٤ = ٦٣٤٠ فتح البارى}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) دەیفەرموو: (هەمیشە نزاو پاڕانەوەی بەندە قەبوولٚ دەبیٚو

---

[١٧٤٢] تجريد البخارى/٥، ژمارە: ١٩٨٤ = ٦٣٤٠ بخارى. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٨٧٧ - ٦٨٧١ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٨٠ رقم الباب/٢٢).

خودای گەورە گیرای دەکا، بەمەرجێ دووعای ناهەق نەبێ، وەك ئەوە نزا بۆ بڕینی ڕشتەی خزمایەتی بکا، بەڵام بەمەرجی ئەومیش کە پەلەنەکا).

عەرزی خۆشەویست کرا: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پەلە پەل وەکوو چی؟ فەرمووی: (وەك نزا خوان بڵێ: من هەر دووعاو نزا دەکەمو هەرگیرا نەبوو، ئیتر بەرە بەرە نائومێد دەبێو کۆڵ دەداو واز لە نزاکردن دەهێنێو نزاکەی گیرا نابێ!).

**ڕوونکردنەوە:**

واتە: بەردەوام بوون لەسەر پاڕانەوەو، وڕك گرتن لە خودای گەورەو میهرەبان کە بێت بەهاوارتەوەو کۆڵ نەدان لە نزاو دووعا، نیشانەی گیرابوونیەتی!

## (٢٦) باب أكثر أهل الجنة الفقراءُ، وَ أكثَر أهلِ النَّارِ النساءُ، وَبَيانُ الفِتْنَةِ بِالنِساءِ
## هەژاران زۆرینەی دانیشتوانی بەهەشتن، ژنانیش زۆرینەی دانیشتوانی بەهەشتو دۆزەخن، تووشی ئاژاوەبوون بەهۆی ژنانەوە

١٧٤٣- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينُ وَإِذَا أَصْحَابُ الْجَدِّ مَحْبُوسُونَ إِلاَّ أَصْحَابَ النَّارِ فَقَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ ». {الحديث: ٦٨٧٢ = ٦٨٩٢ فـم. تجريد البخاری/٥، رقم: ١٧٧٥ = ٥١٩٦، ٦٤٤٧. تحفة الأشراف: ١٠٠. رياض/١، زنجيره: ٣٢، ژمارە:٢٥٨} :[١٧٤٣]

[١٧٤٣] تجريد البخاری/٥، ژمارە: ١٧٧٥ = ٥١٩٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٧٧ = ٦٨٧٢ ترقيم شيحا لصحيح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/١٧).

ئوسامەی كوڕی زەید (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە دەرگای بەهەشتدا ڕاوەستام، سەرنجمدا زۆربەی بەهەشتییەكان كە چووبوونە ناوی هەژارانو مسكێنەكان بوون، بەڵام داراو دەوڵەمەندەكان هێشتا ڕاگیرابوون بۆ حسابو لێپرسینەوە لەسەر سامانو داراییەكەیان، گەرچی ئەوەی كە دۆزەخی بوون، بە فەرمانی خودا برابوون بۆ ناو دۆزەخ، لەبەردەرگای دۆزەخیشدا ڕاوەستام، سەرنجمدا زۆربەی خەڵكەكەی ناوی ژنان بوون!). {ریاض/١، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٢٥٨}.

١٧٤٤- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ وَسَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ أَنَّهُمَا حَدَّثَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ قَالَ: « مَا تَرَكْتُ بَعْدِى فِى النَّاسِ فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ ». {الحديث: ٦٨٨١ = ٦٩٠١ فم. تجريد البخاري/٥، رقم: ١٧٥٢ = ٥٠٩٦ فتح الباري}:[١٧٤٤]

ئوسامەی كوڕی زەیدی كوڕی حاریثەو سەعیدی كوڕی زەیدی كوڕی عەمری كوڕی نوفەیل (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموویان: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەپاش مردنی من، خراپترین ئاژاوەو ئاشووب لەناو ئومەتما، ئاژاوەو فیتنەی ژنانە بۆ پیاوان!). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٧، ج/٤ = چاپی چوارەم، لاپەڕە: ٤٦٨}.

---

[١٧٤٤] تجريد البخاري/٥، ژمارە: ١٧٥٢ = ٥٠٩٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٦٧ = ٦٨٨١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب١٧).

## (٢٧) باب قِصَّةِ أصحاب الغار الثَّلاثة وَالتَّوسُّلِ بِصَالِحِ الأعْمَالِ
## داستانی یارانی ئەشکەوتەکە، کە سێ کەس بوون کردنی کاری چاکە، لە کاتی نزاو پاڕانەوەدا، بەدەست کەلاو بەهۆی گیرابوونی مرازا!

١٧٤٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) أَنَّهُ قَالَ: «بَيْنَمَا ثَلاَثَةُ نَفَرٍ يَتَمَشَّوْنَ أَخَذَهُمُ الْمَطَرُ، فَأَوَوْا إِلَى غَارٍ فِي جَبَلٍ، فَانْحَطَّتْ عَلَى فَمِ غَارِهِمْ صَخْرَةٌ مِنَ الْجَبَلِ، فَانْطَبَقَتْ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: انْظُرُوا أَعْمَالاً عَمِلْتُمُوهَا صَالِحَةً لِلَّهِ فَادْعُوا اللَّهَ تَعَالَى بِهَا لَعَلَّ اللَّهَ يَفْرُجُهَا عَنْكُمْ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَ لِي وَالِدَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ وَامْرَأَتِي، وَلِي صِبْيَةٌ صِغَارٌ أَرْعَى عَلَيْهِمْ، فَإِذَا أَرَحْتُ عَلَيْهِمْ، حَلَبْتُ فَبَدَأْتُ بِوَالِدَيَّ فَسَقَيْتُهُمَا قَبْلَ بَنِيَّ، وَأَنَّهُ نَأَى بِي ذَاتَ يَوْمٍ الشَّجَرُ، فَلَمْ آتِ حَتَّى أَمْسَيْتُ، فَوَجَدْتُهُمَا قَدْ نَامَا، فَحَلَبْتُ كَمَا كُنْتُ أَحْلُبُ، فَجِئْتُ بِالْحِلاَبِ فَقُمْتُ عِنْدَ رُءُوسِهِمَا، أَكْرَهُ أَنْ أُوقِظَهُمَا مِنْ نَوْمِهِمَا، وَأَكْرَهُ أَنْ أَسْقِيَ الصِّبْيَةَ قَبْلَهُمَا، وَالصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمَيَّ، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ دَأْبِي وَدَأْبَهُمْ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا فُرْجَةً نَرَى مِنْهَا السَّمَاءَ، فَفَرَجَ اللَّهُ مِنْهَا فُرْجَةً فَرَأَوْا مِنْهَا السَّمَاءَ. وَقَالَ الآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَتْ لِيَ ابْنَةُ عَمٍّ أَحْبَبْتُهَا كَأَشَدِّ مَا يُحِبُّ الرِّجَالُ النِّسَاءَ، وَطَلَبْتُ إِلَيْهَا نَفْسَهَا، فَأَبَتْ حَتَّى آتِيَهَا بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَتَعِبْتُ حَتَّى جَمَعْتُ مِائَةَ دِينَارٍ، فَجِئْتُهَا بِهَا، فَلَمَّا وَقَعْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا، قَالَتْ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَفْتَحِ الْخَاتَمَ إِلاَّ بِحَقِّهِ، فَقُمْتُ عَنْهَا، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا فُرْجَةً، فَفَرَجَ لَهُمْ. وَقَالَ الآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنِّي كُنْتُ اسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا بِفَرَقِ أَرُزٍّ، فَلَمَّا قَضَى عَمَلَهُ قَالَ: أَعْطِنِي حَقِّي، فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ فَرَقَهُ، فَرَغِبَ عَنْهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَزْرَعُهُ حَتَّى جَمَعْتُ مِنْهُ بَقَرًا وَرِعَاءَهَا، فَجَاءَنِي فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَظْلِمْنِي حَقِّي. قُلْتُ: اذْهَبْ إِلَى تِلْكَ الْبَقَرِ وَرِعَائِهَا فَخُذْهَا، فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَسْتَهْزِئْ بِي، فَقُلْتُ: إِنِّي لاَ أَسْتَهْزِئُ بِكَ، خُذْ ذَلِكَ الْبَقَرَ وَرِعَاءَهَا، فَأَخَذَهُ فَذَهَبَ بِهِ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ لَنَا مَا بَقِيَ،

فَفَرَجَ اللَّهُ مَا بَقِيَ). {الحديث: ٦٨٨٤ = ٦٩٠٤ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٣، رقم: ١٠٠٥ = ٢٢٧٢ فتح الباري}[١٧٤٥]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ سێ کەس بە ڕێگایەکا دەڕۆیشتن، لەنەتەوە پێشینەکان بوون، باران دایگرتن، جا شەوێ پەنایان بردە ناو ئەشکەوتێ لەکێوێ، تاوێرێ لە کێوەکەوە بەربۆوەو دەرگای ئەشکەوتەکەی قەپاتکرد، جا لەناو خۆیاندا گوتیان: ئادەی سەیربکەن بزانن چی کردەومیەکی باشتان کردووە بۆ خودا، بەو کردەوانە لەخودا بپاڕێنەوە، سا بەشکوو خودا بەهۆی ئەو کردەوە باشانەوە دەرووتان لێ بکاتەوەو لەم گابەردە رزگارتان بکا.

یەکێکیان گوتی: خودایە! خۆت ئاگات لێیەو ئاگاداریت کە من باوك‌و دایکێکی پیرو ئیختیارم هەبوون‌و لەگەڵ ژنێك‌و چەند منالێکی ورددا، شوانیم بۆیان دەکردو بەشوانی بەخێوم دەکردن، هەموو جارێ کە دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە، رانەکەم دەکردە پەچەوەو شیرم دەدۆشی‌و لەپێشدا دەرخواردی دایك‌و باوکم دەدا، ئەوجا بەشی منالەکانی خۆشم لە شیرەکە دەدا، تا رۆژێ بەشوێن لەوەڕی باشا دوورکەوتمەوەو درەنگم بەسەرهات‌و کە هاتمەوە شەو بوو، روانیم کەوا باوك‌و دایکم نووستوون، منیش وەك جاران شیرم دۆشی‌و بۆیانم بردو بەدیار سەریانەوە راوەستام هەتا کەی خەبەریان بۆوە شیرەکەیان بخۆنەوە، بەڵام حەزم نەکرد کە خەبەریان بکەمەوەو پێشم ناخۆش بوو کە بەرلەوان شیر بدەم بە ژن‌و منالەکانم، منالەکانیش لەو ماوەیەدا لەبەرپێما لەبرساندا هەر

---

[١٧٤٥] تجرید البخاری/٣، ژمارە: ١٠٠٥ = ٢٢٧٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٧٥ = ٦٨٨٤ شیحا = ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/٩٨).

دەزرووكانەوە، هەتا شەبەقیدا ئەمە حاڵمان بوو، جا ئەی خودایە! تۆ خۆت دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر رەزامەندیی تۆ كردووە، ئەوا دەروویەكمان لێ بكەرەوەو كەلەبەرێكمان بۆ بكەرەوە، كە ئاسمانی لێوە ببینین.

جا خودا كەلەبەرێكی بۆ كردنەوەو ئاسمانیان لێوەی بینیو تاوێرەكە تۆزێ خزا بەڵام نەیانتوانی لێوەی دەربچن.

یەكێكی تریان گوتی: خودایە! خۆت ئاگاداری كە كچێكی ئامۆزام هەبوو، چەندە پیاو حەز لە ئافرەت دەكا ئەوەندە حەزم لێی بوو، كە داوای ئیشی خراپەم لێكرد خۆی نەدا بەدەستەوە، هەتا ساڵێكیان دووچاری گرانیو قاتو قڕی بوو، وە بەناچاری خۆی هات بۆلام، دیسان خۆی نەدا بەدەستەوە تاسەد دیناری زێڕی پێ نەدەم، منیش تێكۆشامو خۆم ماندووكرد تا ئەو پارەیەم كۆكردەوەو بۆم بردو دام پێی لەباتی ئەوەی كە خۆیم بدا بەدەستەوە، ئەویش وایكرد، جا كاتێ دەستم لێی گیربوو، وە لەناو كۆشیا دانیشتمو ویستم بەدەستی بگرم، كچەكە گوتی: ئامۆزا! ئەی عەبدەڵلا! ئەی بەندەی خودا! لەخودا بترسەو ئەم مۆرە بەناڕەوا مەشكێنە!

ئیتر منیش هەڵسامو وازم لێ هێناو پارەكەیشم داپێی بەخۆڕایی بۆ خۆی، وە لەو كاتەیشدا لەهەموو كاتێ زیاتر حەزم لێی بوو، جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر رەزامەندیی تۆ كردووە، ئەوا دەروویەكمان لێ بكەرەوەو لەم سەخڵەتییە رزگارمان بفەرموو، ئیتر خودا دەروویەكی تری لێكردنەوەو تا دوو بەش لەسێ بەشی تاوێرەكە خزاو لەسەر دەرگاكە لاچوو، بەڵام كەلەبەرەكە وەها گەورە نەبوو كە بتوانن لێوەی بچنە دەرەوە!

سێیەمیان گوتی: ئەی خودایە! تۆ خۆت ئاگات لێیە، كەمن جارێ بەفڕناخێ برنج كرێكارێكم بەكرێ گرت، كە ئیشەكەی تەواو كرد، گوتی:

کرێکەمم پێ بدە، منیش گوتم: کرێکەت ئـەوەتانێ، کەچی بـەدڵی نـەبوو، وەری نـەگرت، منـیش کەئـەو ڕۆیـی پـارەو کرێـی کرێکارەکـانی تـرم هـەموودا، وە چەڵتووکەکەی ئەویشم هەموو وەرزێ دەچاندو بەرهەمم دەهێنـا، تـاوا زۆر بـوو گاگەلێك‌و وشترو مەڕو چەند بەندەیەکی شوانم پێی کـڕی، تـا ڕۆژێ کرێکارەکـە هاتەوە بۆلام، گوتی: لەخودا بترسە کرێکـەمم پـێ بـدە. منـیش گـوتم پێـی: بـڕۆ ئەو ڕانە وشـترو گاگـەل‌و ڕانـە مـەڕو شـوانەکانیان ببـە بـۆ خـۆت، هـەمووی هـی کرێکەتە، گوتی: ئـەی عەبـدی خـودا! لـەخودا بترسـە گاڵتـەم پـێ مەکـە. منـیش گوتم: بەڕاستمە، گاڵتەت پێ ناکەم، هەمووی هی خۆتە بڕۆ بیبە بۆ خـۆت. ئـیتر ئەویش هـەمووی بـرد بـۆ خـۆی‌و ڕۆیـشت. جـا ئـەی خودایـە! تـۆ خـۆت دەزانـی ئەگەر ئەمەم لەبەر خاتری تۆ کردووە، ئەوا دەرگای ئەشکەوتەکەمان بەتـەواوی بۆ بکەرەوە، جا خودای گەورە بەهۆی ئەم کردەوە باشانەیانەوەو بـەهۆی نیـازی پاکیانـەوە دەرگـای ئەشـکەوتەکەی بـە تـەواوی بۆیـان کـردەوەو تاوێرەکـە تـەواو خزاو هاتنە دەرەوەو بە ڕێگەی خۆیانا ڕۆیشتن!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ١، ژمـارە: ١٢ – باسـی نیـازو نیازپـاکی + تـاج/١، زنجـیرە: ١١، ژمـارە: ٨٥ – نیـازو نیازپاکی}.

لە دواوە بە پـشتی خـودای گـەورەو سـەروەر، یاسـاو دەسـتوورەکانی نـزاو پاڕانـەوە تۆمـار دەکـەین، لەگـەڵ ژیاننامـەی (الحـافظ ابـن حجـر) کـە گـەورەترین ڕاڤەکارو شیکەرەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خـودای گـەورەی لەسـەر بێ).

وَأَخْرَجَ اَلشَّيْخَانِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى اَلرَّحْمَنِ، خَفِيفَتَانِ عَلَى اَللِّسَانِ، ثَقِيلَتَـانِ فِـي اَلْمِيزَانِ، سُبْحَانَ اَللَّهِ وَبِحَمْدِهِ ، سُبْحَانَ اَللَّهِ اَلْعَظِيمِ} .

{پوختەی بوخاری = تەجریدی بوخاری بەکوردی/٥، ژمارە: ٢١٣٤ = ٧٥٦٣، ٦٤٠٦ بوخاری. پوختەی موسلیم = مختصر صحیح مسلم/٥، ژمارە: ١٩٠٤ = ٦٧٨٦ حسب تخریج وترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا لأحادیث صحیح مسلم بشرح الإمام النووی = ٢٦٩٤ حسب ترقیم خادم الکتاب والسند/محمد فؤاد عبدالباقی}:

لە تەجریدی بوخاریو موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ریزکردنی وشەکان ئاوایە:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم دوو وشەیە: (سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللّٰهِ العظیم: خودا بەپاکو پیرۆزو بێ گەرد دەزانمو، سوپاسو ستایشی بێ پایانی دەکەم، دیسان خودای خۆم، یەزدانی پاکو مەزن، بەپاکو پیرۆز دەزانمو، لەمەدا هیچ گومانو سوو وشەکێکم نییە). فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم دوو وشە پیرۆزەیە سووکو خۆشو ئاسانن لەسەر زمانو، قورسو گرانن لەناو شایان (تەرازوو) لەکاتی کێشان، کەهەموو کردەوەیێ لەقیامەتا بەتەرازوو دەکێشرێ، خۆشەویستن لەلای خودای میهرەبان. {ریاض الصالحین/٣، زنجیرە: ٢٤٤، ژمارە: ١٤٠٨ — نامەی ذیکرو یادی خودا}.

ئەم فەرموودەیە دوا فەرموودەیە لە صەحیحی بوخاریدا.

## روونکردنەوەیەکی بەسوود لەبارەی دەستووری نزاو پاڕانەوە:

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ١٢٣ چاپی یەکەم، روونکردنەوەی ژمارە (١٨٨٥)دا دەفەرموێ:

آ- گرنگترین دەستوورەکانی نزاو پاڕانەوەو دووعا کردن:

١- لەکاتی پاڕانەوەو نزاکردندا، بەپێی بواری گونجاو، ئەگەر دەستی دەدا بۆ نزا خوێنو نزاکار، با لەشی پاك بێ، بەرگو جلەکانی حەڵاڵو پاك بن، دەست بەدەستنوێژ بێ، نزاو پاڕانەوە زۆر زۆر بکات.

٢- رووی لە رووگە بێو، بەرەو قیبلە دابنیشێ، یا بەپێوە رابوەستێ، یا بەرێزەوە رابکشێ، بەپێی بارو دۆخو حاڵ خۆی لەگەڵ کەشی نزاکەدا ساز بکاو خۆی بگونجێنێ.

٣- بۆ ژنو بۆ پیاو بەرگی شەرعی حەڵاڵی لەبەردا بێ.

٤- هەردوو دەستی هەتا ناستی هەردوو سەرشانی، لەسەرەتای نزاو پاڕانەوەکەوە، هەتا کۆتایی، هەردوو دەستی هەڵبڕێ، بەپاکی، حیکمەتی ئەم دەست بەرزکردنەوەیش ئەوەیە کە نزا خوێن، بەدڵو بەکوڵ پەنا دەباتە بەرخودا، وەك کەسێکی نوقمبوو لەئاوی دەریادا، دەست بەرزدەکاتەوە هەتا کەسێ، دەستی بگرێو لەخنکان رزگاری بکا.

٥- کە نزاکە تەواو بوو بەری هەردوو دەستی بهێنێ بەدەمو چاویدا.

٦- بەپێی بارودۆخ زیکرو دوعاو نزاو پاڕانەوەکە بە نهێنیو بە شێنەییو بەکوڵو بەدڵ بێو ورکی تیابێ، لەخودا کە نائومێدی نەکاو کارەکەی بۆ بسازێنێو ئیشەکەی بۆ بکا.

٧- ئەگەر سەرمەشقو پێشەوای کەسانی تربوو، ئەوە واباشە کە بەپێی شوێنو کات، دەنگ هەڵبڕێ، هەتا نزاخوێنەکانی تریش شوێن ئەو بکەونو لەشوێن ئەوەوە بەڕەوانی نزاکە بخوێننو هەڵەی تیادا نەکەن، وەك کاتی قونووت لەناو نوێژی بەیانیداو لەنوێژی وەتری مانگی رەمەزاندا، هەرکاتێ خۆیان فێربوون با بەدەنگی نزم نزاکە بخوێنێو پەیڕەوانەکانیشی هەرکەسەیان

بۆ خۆی بەدەنگی نـزم بیخوێنـێ، مەگـەر هۆیـەکی تـر هـەبێ، وەك ئـەوە ئـامین بکەن لەسەر نزای قونوتخوێن.

٨- لەسەرەتای دەسـتپێکردنەوە، سـوپاس‌و ستایـشی خـودا بکـاو بیـسمیللا بکا، وەك ئەوە بڵێ: (بسم الله الرحمن الرحيم) (الحمـدلله رب العـالمين) یـا بـەکوردی بڵـێ: (بـەناوی خـودا، سـوپاس بـۆ خـودا...). باشـترین شـت، لـەم کاتـەدا زیکـری باقیاتو صالحاتە کە ئەمە دەقەکەیەتی: {سُبْحَانَ اللّهِ وَالحَمْدُ لِلّـهِ وَلاَ إِلـهَ إلاَّ اللّـهُ وَاللّهُ أَكْبَرُ}.

٩- هەروا لەسەرەتاوە، لەپاش ناوهێنان‌و سوپاس‌و ستایشی خـودای گـەورە، درووود بنێرێ بۆ گیـانی پـیرۆزی پێغەمبـەرو سـەڵاواتی لـەدیار بـدات، وەك ئـەوە بڵێ:

{اللّهُمَّ صَلِّ عَلَى سَيِّدِنَا محمَّدٍ وَعَلَى آلِ سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ، كَمَا صَـلَّيْتَ وَسَـلَّمْتَ وَبَارَكْتَ عَلَى سَيِّدِنَا إِبْرَاهِيمَ وَآلِ سَيِّدِنَا إِبْرَاهِيمَ فِي العَالَمِينَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ}.

١٠- لــەکۆتاوە حەمــدو سوپاســەکە دووبــارە بکاتــەوە، وەك ئــەوە بەتێگەیشتنەوە، لەناخی دڵەوە بڵێ: (وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحمدُ لِلّهِ رَبِّ العَالَمِينَ).

١١- هــەروا لــەکۆتاوە درووود و ســەڵاوات‌و ســەلامەکە بۆســەر پێغەمبــەر دووبارە بکاتەوە.

١٢- لەکاتێکا کەهێشتا دەستەکانی بەرزەوە کردووەو بـەری هـەردوو لـەپی هەر لە ئاسمانە، کە رووگـەو قیبلـەی نیازمەنـدان‌و نزاکارانـە، بـە کوڵ‌و بـەدڵ، لەناخی دڵەوە بڵێ: (ئامین) ئەگەر چەند جارێکیش دووبـارەی بکاتـەوە قەیـدی نییە. ئامین واتە: خودایە! ئەم نزایەمان گیرا بفەرموو، قبـووڵی بکـە لێمـان، بـە عەرەبیش، یا بەکوردیش دەبێ کە مرۆڤ لەباتی (ئامین) بڵـێ: (اللّهُمَّ تَقَبَّـلْ مِنَّـا = خودایە! وەری بگرە لێمان).

١٣- بەدڵێکی بە ئاگای پڕ لە ئومێدی گیرابوونەوە، نزاکە بکرێ، جەختی تیابکا، ورك لەخودا بگرێ، کە دڵی ئەم بەندە زەبوونەی خۆی نەشکێنێ‌و بەجۆرەها شێوە باسی زەبوونی خۆی بکاو باسی داماوی‌و ئاتاجی‌و بێ دەستەڵاتی خۆی بکاو بە خشوع‌و خضوع‌و سەرکزی‌و ملکەچی‌و دڵی گەرمەوە بپاڕێتەوەو داوای مەبەستەکەی لەخودا بکا.

١٤- وەك گوتمان لەکاتی نزاکردنەکەدا، دەست هەڵبڕێ‌و بە بەری دەست داوای بەخشش‌و خەڵات‌و نازو بەهرە لەخودا بکا، بەلام ئەگەر ویستی خودای گەورە بەڵایەکی لەکۆڵ بخات، یا ویستی پەنابگرێ بەخودا لە ئێش‌و ئازارو دەردو بەڵا، با لەم کاتانەدا، پشتی دەستی بکاتە ئاسمان، وەك کەسێ پاڵ بە بەڵایەکەوە بنێ‌و ئێش‌و ئازارێ لەخۆی دووربخاتەوە ئاوا، بەلام ئەگەر پشتی دەستیشی نەکاتە ئاسمان، لەم کاتانەدا قەیدی نییە.

١٥- لەخۆیەوە دەست پێ بکا، حەزرەتی پێغەمبەر ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەر بێ) بکا بەسەر مەشق بۆ خۆی کە دەفەرموێ: {رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ – إبراهيم/١٤/٤١}.

واتە: ئەی پەروەردگاری گەورەمان! خۆشبە لەخۆم‌و لە باوك‌و دایکم‌و لەهەموو ئیمانداران، لەڕۆژی لێپرسینەوەدا، کە هەموو کەسێ دادگایی دەکرێ‌و لەدیوانی خوادا رادەوەستێ بۆ دادگایی‌و لێپرسینەوە).

١٦- نزاو پاڕانەوەکە تا سێ‌جار دووبارەوە بکرێتەوە.

١٧- هەندێ نزاو پاڕانەوە تایبەتن بە کات‌و بە شوێن‌و بە بۆنەی تایبەتەوە، وەك نزای قنوت، یا نزای طەوافی بەیت‌و طەوافی صەفاو مەڕوەو نزای کاتی ژنهێنان‌و شووکردن‌و منداڵبوون‌و کاتی سەفەرو هاتنەوە لە سەفەرو رۆژی هەینی‌و رۆژی جەژن‌و کاتی سواربوون‌و دابەزین‌و کاتی سەردانی

نـەخۆش‌و ناشـتنی دارو درەخـت‌و روانـدنی بـەروبووم‌و کـاتی دەسـتکردن بـە خوێنـدن‌و بـەدەرس‌و زۆر شـتی تـر، وەك سـواربوونی وڵاخ‌و ماشـێن‌و فڕۆکـەو پـاپۆڕو بەلـەم، لەگـەڵ رەچـاوکردنی دووبـارە بوونـەوەی بۆنـەکانا، نزاکـەیش دووبارە دەبێتەوە، دەنا نا.

١٨- دڵنیابێ‌و باوەڕی وابێ کە خودا دێت بەهاواریەوەو نزاکەی گیرا دەکاو نائومێدی ناکا، جا یا خـودای گـەورە خـودی داواو مەبەسـتەکەیی بـۆ جێبـەجێ دەکا، یا بەشتێ تر هەقی بۆ دەکاتەوە، جا لەم جیهانـدابێ، یـا لـەو جێهانـدا بـێ، خودا هەقی بۆ دەکاتەوە.

١٩- واباشە دووعای مەئثوور، کە ئەو جۆرە نزاو پاڕانەوەو داخوازییانەن، کـە لـە قورئـان‌و فـەرموودەی پێغەمبـەرو فەرمایـشتی هـاوەڵانی پێغەمبـەردا هاتوون، واباشە ئەو نزا بیستراوو مەئثوورانە، بەهەمان شێوەو بەهەمان لەفظو شـەکڵ‌و شـێوەی خۆیـان، کـە لـە قورئـان‌و سـوننەتدا هـاتوون، ئـاوا دووبـارە بکرێنەوە، بەبێ کەم‌و زیاد، وەك:

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّـارِ} وەك {رَبِّـي أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ} وەك {يَاحَيُّ يَا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْـتَغِيثُ} وەك ئەو هەموو نزاو پاڕانـەوەی کـە دەقەکـەیان وا لەپـەڕاوە گـەورەکانی یاسـانامەدا. بـەڵام بـەبێ گومـان دروسـتە بەوەرگـەڕاوو تەرجەمەکەشـیان نزابکـرێ، گـرنگ ئەوەیە کە دڵی لەلای نزاکەی بێت.

ب- گرنگترینی مەرجەکانی گیرابوونی نزاو پاڕانەوە:

١- داواو مەبەسـت (مطلـوب)ەکـە، رەواو شـەرعی بـن‌و، گونـاهو تـاوان‌و ناهەقی نەبن.

٢- نزاخوێن حەڵاڵخۆربێ‌و خۆی لەهەموو حەرام‌و بێ شەرعی‌و گوناهێ بپارێزێ، تەنانەت نابێ نزای باش بۆ کەسێ بکا، کە شایان‌و شایستەی ئەو نزایە نەبێ!

٣- ئەرکە ئایینییەکان بەجێ بهێنێ، وەك: نوێژو ڕۆژوو وحەج‌و زەکات‌و پابەندبوون بە یاسانامەی خوداوە.

٤- پاکی‌و خاوێنی ئاشکراو نهێنی بپارێزێ، وەك: پاکی دڵ‌و دەروون‌و جەستەو جل‌و بەرگ‌و شوێن‌و نیازی پاك.

٥- شتی نەشیاو نەخوات وەك: پیازو سیرو توور، کە بۆنیان دەبێ بەهۆی بێزاربوونی فریشتەکان.

ج- گرنگترین کاتەکانی نزاکردن بەشێوەی گشتی:

١- باشترین کات بۆ نزاو پاڕانەوەو سکاڵای حاڵ، لەلای خودای گەورە، سێیەکی کۆتایی شەوە، بەتایبەتی دەمەو بەیان، کە ناسراوە بە سەحەر.

٢- لەپاش نوێژەکان، بەتایبەتی لەدوا نوێژە فەرزەکان کەپێیان دەگوترێ پێنج فەرزە.

٣- لەنێوانی بانگ‌و قامەتداو، لەڕۆژی عەرەفەداو لەڕۆژی هەینی‌دا.

٤- لەکاتی کوڕنووشداو لەناو سەجدەدا.

٥- شەوو ڕۆژی هەینی‌و مانگی ڕەمەزان‌و ئەحواڵە شەریفەکان‌و دۆخە پیرۆزەکان بەهەل بزانرێ، وەك: کاتی بارانبارین‌و کاتی کردنی نوێژە فەرزەکان.

٦- لەکاتی جێبەجێ کردنی تاعەتدا، وەك کاتی حەج‌و عەمرەو سەردانی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەرو کاتی بەڕۆژوو بوون.

٧- لەکاتی سەخڵەتی‌و خەم‌و خەفەت‌و مەینەت‌و زەبوونیدا.

٨- لەكاتی بۆنەكاندا، ئەو نزایە بخوێنرێ كە ئەو بۆنەیە دانراوە بۆی، وەك لەكاتی سواربووندا بڵێ: {سبحان الَّذِی سَخَّرَ لَنَا هذا وماكنا لَه مقرنين وإِنَّا إلى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ} لەكاتی پژميندا بڵێ: (الحمدلله)...تاد.

٩- لەكاتی دڵ گەرمبوونو هەست كردن بە كەشێكی گيانی پيرۆزی وا كە چاوو دڵی پێ رۆشن دەبنەوەو هەست بە بارينی سۆزو ميهرەبانی خودا دەكرێ.

١٠- لەكاتی رەمەزانو زمانی بەڕۆژووەو كاتی بەربانگ.

١١- لەپاش خوێندنو خەتمەی قورئانی پيرۆزەوە.

١٢- لەپاش خەتمەی زيكری خوداوە، وەك خەتمەی (لا إلـه إلا الله) يا خەتمەی (قُلْ هُوَ الله).

١٣- نزای باشو داوای باش بەرزكردنەوە بۆ بارەگای خودا لەكاتی خوێندنی كەڵەبابدا، چونكە حاڵی پيرۆزەو فريشتەی بينيوە.

١٤- پەناگرتن بەخودا لەكاتی زەڕينی كەردا، چونكە شەيتانی ديوە.

د- باشترين شوێن بۆ نزاكردن:

١- لە مەسجيدولحەرام، لە مەككە، لە دەوری كەعبەو حەجەرول ئەسوەد.

٢- لەجێگە مناسكەكانی حەجدا، وەك: جەبەلورەحمەو كێوی عەرەفەو ميناو موزدەليفەو مزگەوتی عائيشەو شوێنە پيرۆزەكانی تری مەككەو مەدينەو مەسجيدول ئەقصاو مەسجيدول قيبلەتەين.

٣- لەخزمەت ئارامگای پيرۆزی پێغەمبەردا.

٤- لەسەر بەرماڵ، بەتايبەتی لەكۆتايی تەحياتی كۆتاييدا، لەپێش سلاودانەوەدا.

٥- لەناو مزگەوتا بەشێوەی گشتی، بەتایبەتی لەپاش نوێژی تەحییەتول مەسجیدو لەپاش پێنج فەرزەو نوێژی تری سوننەت، وەك: وەترو تەراویح، كە لەناو مزگەوتا بكرێن.

هـ- خوێنەری ئازیزو بەڕێز، ئەمە بەكورتیو بەكوردی، پوختەی دەستوورو مەرجو جێگەی نزاو پاڕانەوە بوو، ئەمەیش دیسان بەكورتی، چۆنێتی نزاو پاڕانەوەو دۆعایە:

١- بەزارو بەدەم بكرێنو بخوێنرێنو بگوترێنو بەدڵو بەكوڵو بەس، وەك: ئەو گشتە نزا مەئثوورانەی كەوان لە قورئانو وان لەم پەڕاوەداو وان لە تاجول ئوصولو ریاضی صالحینو تەجریدی بوخاریو موختەصەری صەحیحی موسلیمو هەموو سەرچاوە نازدارەكانی تردا هەنو تۆماركراون، موسوڵمانان سەرومڕ دەیانخوێنن.

٢- بەنووسین دەنووسرێن، بە قەڵەمی پاكو بە مەرەكەبی پاكو حەلاڵو لەسەر شتی پاك.

٣- دەستوورو مەرجو كاتو شوێنی نزای نووسراو، كەپێی دەگوترێ نووشتە، رێك وەك هینی نزای خوێنراو وەهایە، مەگەر شتەكە نەگونجێ لەگەڵ حاڵی نووسیندا.

٤- دروستە نووشتەكە، یا نووسراوەكە، بەنیازی سوودو بەهرەو كەڵكی، لەشوێنێكا هەڵبگیرێ، یا بە جلو بەرگو سەرینی پەیوەندیدارەوە هەڵبواسرێو بدوورێ، بە مەرجێ نووشتەكە شەرعی بێ. {بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٥١٠٨}.

جا پاش ئەمە عەرزم ئەمەیە:

(برای بەڕێزم! خوشکی ئازیزم! جەنابیشت دەتوانی پەیڕەوی ئەم دەستوورو ئادابانە بکەیتو نزاو نووشتە بکەیتو بە دڵنیاییەوە چاوەڕوانی گیرابوونو هاتنەدی مرازو نیازت بیت ئیتر پەنا بەخودا).

دوا وتە لەم بابەتەوە:

(ئەمەی گوتراو نووسرا، شێوازی هەرە پەسەندی نزاکردنو پاڕانەوەیە، بەڵام بەبێ گومان، دووعای هەموو کەسێ، لەهەر بارودۆخو کاتو شوێنێکا بێت دەبێو دروستە، ئەگەری ئەوەشی هەیە کەخودا لێی قەبووڵ بکات، لەبەرئەوە هەتا دەتوانیت لەنزاو پاڕانەوە، لەکاتو ناکاتدا، درێغیو کۆتایی مەکە، لە ئیحیای ئیمامی غەزالیدا (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (خودا نزای ئیبلیسی گیرا کردووە، کە دەڵێ: {رَبِّ أَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ، قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ}.

ئەمەی کە نووسیومە لەم شوێنەدا، لەبابەتی نزاوە، لەخۆمەوە نەمگوتووە، من شت لەخۆمەوە قەت ناڵێم، بەڵکوو ڕاگوێزم کردوون لەسەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە، بەتایبەتی بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

١- الأذكار للإمام النووى، باب في آداب الدعاء ص٣٥٣.

٢- إحْيَاءُ عُلُومِ الدين - المجلّد الأَوَّلُ - مبحث آداب الدعاء وهي عشرة ص٢٧٤.

٣- غاية المأمول - شرح التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول - المجلد الخامس - الطبعة الرابعة والصفحة/١١ - مبحث (آداب الدّعَاء) لە ژمارە: ٥٠١٠وە هەتا ژمارە: ٥٠٢٧ + تاج/٥، لاپەڕە: ٢٣١، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٥١٠٨ - نزای ترس شکاندنو خەوزڕاندن.

دانــەری پــەڕاوی (بُلُــوغ المَــرَام) کــە (ئەحمــەدی کــوڕی عــەلی کــوڕی موحەممەدی کوڕی حەجەر)ە، دەڵێ: لەڕۆژی یازدەی مانگی ڕەبیعول ئەووەلی ساڵی (٨٢٨) هەشت سەدو بیستو هەشتی کۆچی لە پوختەکردنی ئەم پەڕاوە بوومــەوە، ســوپاس بــۆ خــودای گــەورە، درووددو ڕێــزی زۆری بــێ پایــان بــۆ پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ).

لێرەدا لەشەرحی بلوغ المرامەوە، بەئومێدی بارینی ڕەحمەت، ژیاننامەی مامۆستای مامۆستایان حەزرەتی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، بۆ پیتو فەڕو پیرۆزی دەنووسین، بەئومێدی دووعاو نزای خێر، لەهەموو لایەکمانەوە بۆ هەموو لایێ، وەك گوتراوە: (عِندَ ذِكرِ الصَالحينَ تنزِلُ الرَحمَة: لەکاتی ناوهێنانی چاکانا ڕەحمەت دەبارێ): ژیاننامە (الحافظ ابن حجر):

١- ئەمە کورتەی ناوو شۆرەتیەتی:

(ابن حجر العسقلانى المصرى: هُوَ خَاتِمَةُ الحُفَّاظِ الأَكابِرِ، أبو الفضل، أحمد بن على بن محمد، شهاب الدين الكنانِي، العسقلانى الأصل، القاهرى الدار، والمولِد والمنشأ والوفاة).

لەبنەڕەتدا بنەماڵەکەی خەڵکی عەسقەلان بوون لە فەلەسطین.

٢- لەمانگی کوڵە مانگ (شەعبان)ی ساڵی (٧٧٣ك) حەوت سەدو حەفتاو سێی کۆچی لەمیصر، لە قاهیرە لەدایك بووە، لە قەراخ ڕوباری نیل، بەرابەر بە مانگی شوباطی ساڵی ١٣٧٢ی زایینی.

٣- بەهەتیوی گەورە بووە، بەر لەوە چوار ساڵ لەتەمەنی تەواو بکا باوکی لە ساڵی (٧٧٧)دا مردووە، دایکیشی لەپێش باوکیدا مردووە. ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) خۆی دەفەرموێ: (وەك خەوو خەیاڵ شێوەی

باوکم دێته بەرچاوم!). هەروا دەفەرموێ: (تەنیا ئەم قسەیەی باوکمم لەبیرماوە کە فەرمووی: کونیەی ئەحمەدی کوڕم ئەبولفەزلە).

باوکی زانایەکی گەورە بووە، وە زۆر گرنگی داوە بە ئەحمەدی کوڕی، هەروا لەم ڕوانگەوە بووە، کەخۆی کەسناو (کونیە)ی بۆ دیاری کردووەو کە چووە بۆ حەج و بەسەردانی بەیتولمەقدیس لەشاری قودس لەشام، ئەحمەدی کوڕیشی لەگەڵ خۆیدا بردووە، گەرچی زۆر منالیش بووە!

٤- باوکی لەپێش مەرگیدا، دۆستێکی خۆی ڕاسپارد، کە سەرپەرشتی پەروەردەی ئەحمەدی کوڕی بکا، لەپاش خۆی، ئەو دۆستەی بازرگانێکی گەورەی میصر بوو، ناسراوە بە (زكِيُّ الدين أبوبكر بن نورالدين علي الخَرّوُبِي).

جا ئەم پیاوە باشە، بەشێوەیەکی جوان ئیبنو حەجەری پەروەردە کرد، تەنانەت کاتێ چوو بۆ حەج و بۆ موجاوەرەی بەیت لەمەککە، ئیبنو حەجەریشی لەگەڵ خۆیدا برد، ئیتر زۆر بەجوانی چاودێری ئیبنو حەجەری دەکرد، لەگۆڕەپانی ژیان و خوێندندا، هەتا ئەم سەرپەرشتیارەی لە ساڵی (٧٨٧)دا مرد، کە ئەوسەردەمە ئیبنو حەجەر تازە لاو بوو، تەمەنی (١٧) ساڵان بوو، لاوێکی زۆر ڕەوشت بەرزو زرنگ و وریاو دەرکەوتوو بوو، هەتا بڵێیت بلیمەت بوو.

٥- کە تەمەنی بوو بەپێنج ساڵی تەواو، چووە قوتابخانە، لەتەمەنی نۆ ساڵیدا، هەموو قورئانی بەتەواوی لەبەر کرد، یەکێ لە مامۆستاکانی کە لە قوتابخانە لەلای دەخوێند، شەمسەدینی کوڕی عەللاف بوو، ئەو مامۆستایەی کە قورئانی بەتەواوی پێ لەبەر کرد (صدرالدين: محمد بن عبدالرزاق السفطی) بوو، لەو سەردەمەدا وا باو بوو، ئەگەر کەسێ بەتەواوی قورئانی لەبەر کرد، دەبێ پێشنوێژی تەراویحی ڕەمەزان بۆ خەڵکەکە بکا، بەڵام لەبەر منالی ئیبنو

حەجەر ئەم هەلەی بۆ نەڕەخسا، هەتا لەساڵی (٧٨٥)دا، کە تەمەنی (١٢) دوازدە ساڵ بوو، لەگەڵ سەروسێتەکەیدا (الزکی الخروبی) لەمەککە بوو، لەو ساڵەدا لەمەککە، لەمەسجیدولحەرام، لەتەمەنی دوازدە ساڵیدا، بەرنوێژی تەراویحی ئەو ساڵەی بۆیانکرد، وە بوو بەشانازییەکی زۆر گەورە کە مێردمناڵێ لە (بیت اللهالحرام)دا، پێش موسوڵمانان بکەوێ‌و نوێژی تەراویحیان بۆ بکا!!.

وە لەو بەرنوێژییەدا گەلێ سەرکەوتوو بوو، زۆر بەڕێکوپێکی ئەو قۆناغەی بڕی، وە بەشێوازێکی جوان پێی هەڵسا، وا ڕێکەوت حەجی ئەو ساڵە ڕێکەوتی ڕۆژی هەینی دەکا، لەپاش کردنی حەج، لەجیواری بەیتا ماوەیێ خواپەرستی جوان دەکا، ئەوجا بەرەو بەیتولەقدیس دەڕۆن‌و لەوێش نوێژو پەرستش‌و سەردان ئەنجام دەدەن!.

٦- نیشانەی زیرەکی‌و بلیمەتی‌و زەینڕۆشنی پێوە دیار بوو، ئەوە بوو کە لەگەڵ ئەلخەروبیدا، کە لەساڵی (٧٨٦)دا لەگەشتی حەج گەڕانەوە، ئەم پەڕاوە گرنگ‌و مەزنانەی، لەماوەیەکی پێوەری (قیاسی)دا لەبەر کرد:

١- (عمدة الأحکام) دانراوی مەقدیسی.

٢- (الحاوی الصغیر) هی قەزوینی.

٣- (مختصر ابن الحاجب) الأصلی. زانستی ئوصولی فیقە.

٤- (مُلحَةُ الإعراب) هی هراوی.

٥- (منهج الأصول) هی بەیضاوی.

٦- ألفِیَةُ ابن مالِك. نحو.

٧- (التنبیة فی فروع الشافعیة) هی شیرازی.

٧- لەناو هاوڕێکانیدا بەوەوە ناوی دەرکردبوو، کە زەینی زۆر ڕۆشنەو بەزوویی شت لەبەر دەکا، ئەوانەی ژیاننامەی ئەویان تۆمار کردووە دەڵێن:

سوورەتی مەریەمی بەیەك ڕۆژ لەبەر كردووە، لاپەڕەیەكی لەپەڕاوی (الحاوی الصغیر)بەسێ جار خوێندنەوە دەهاتە بەر!!

٨- بەرە بەرە وا ئەشقی چووە سەر زانستو بابەتەكانی زانینو زانیاریو ڕۆشنبیریو ئەدەبو وێژەو مێژوو، هەوڵی دەدا كە بەهەر نرخێ بووە، سەرچاوەكانی ئەم بابەتە گرنگانە پەیدا بكاو سوودو بەهرەیان لێ وەربگرێ، تەنانەت زۆر جاران، هەندێ پەڕاوی بۆ ماوەیەكی دیاری كراو بەرابەر بەنرخێكی گونجاو بەكرێ دەگرتو لەپاشا دەیبردەوە بۆ خاوەنی، گەلێ جاریش بۆ هەمان مەبەست پەڕاوی لەخاوەنەكەی دەخواستو دوایی دەیبردەوە بۆی، وە هەروەها.

٩- لەدەوروبەری ساڵی (٧٩٠)دا، كەمێ لەخوێندن ساردەوە بوو، وە لەم ماوەیەدا، لەگەڵ ئامۆزاو مامەكانیدا خەریكی كاروباری بازرگانی بوو، بەتایبەتی مردنی خەڕووبی لەم لایەنەوە كاریگری لەسەری هەبوو، چونكە دەبوو خۆی خۆی بەخێو بكاو سەرچاوەیەكی گوزەرانو ژیان بۆ خۆی دابین بكا.

١٠- لە (٧٩٠ك)دا، حەڤدە ساڵی تەواو كرد لەتەمەنی، وە هەموو قورئانی لەبەر كرد، وەكۆمەڵێ پەڕاوی پوختەی لەزانستەكاندا لەبەر كرد، بەپێی ڕۆژگاری خۆی، وە دەستی كرد بەخوێندنی قیرائەتەكانی قورئان بە تەجویدەوە، لەلای (الشهاب أحمد الخیوطی)وە هەر لەم ساڵەدا سەماعی صەحیحی بوخاری كرد، وەگرنگی دا بەوێژەو ئەدەبو زانستی مێژوو، بەتایبەتی ئامادەی دەرسەكانی (العلامة شمس الدین محمد بن القطان المصری) دەبوو، كە لەبابەتی فیقهو نەحوو صەرفو بەلاغەو ڕەوانبێژیو ئەم جۆرە شتانە بوون.

١١- له تهمهنی نۆزده ساڵیدا، سهرقاڵی هونهرهکانی وێژهو ئهدهب بوو، وهکۆمهڵێ شیعری جوانو پهخشانی ناسکی نووسی، چهندین مهدحنامهی پێغهمبهری بهشیعر دانا.

١٢- لهساڵی (٧٩٣ك)دا، کهتهمهنی (٢٠) بیست ساڵ بوو، که ئهو ههموو زانستو هونهرانهی لهههموو باسو بابهتێ لهبهر کردبوو، وهشارهزایان بوو بوو، لهخواوهو بهتهوفیقی خوایی، ئهشقی چووه سهر زانستی فهرموودهو سوننهتی پێغهمبهر، ئیتر بهشێوهی تایبهتی خووی دایه ئهم زانسته پیرۆزهو بهره بهره بهناخیدا چووه خوارهوه، تهنانهت لهساڵی (٧٩٦ك)دا، خۆی دهفهرموێ:

{رُفِعَ الحِجَابُ، وَفُتِحَ البَابُ} . واته: (پهرده لابرا، دهرگا سهرپشت خرا).

مامۆستاکهی لهزانستی فهرموودهدا (زینهدینی عێراقی) بوو، ده ساڵ بهردهوام لهخزمهتیدا بوو، وه زانیارییهکی پڕ سوودی زۆر لهبابهتی فهرموودهدا، لهخزمهتیدا فێر بوو، لهبارهی ڕشته (سهنهد)و دهق (مهتن)و دهغهز (عیلله)وه، ئهلفییهکهی مامۆستاکهیو شهرحهکهی لهلا خوێند، لهماڵی مامۆستاکهی، کهلهسهر قهراخی روباری نیل بوو، واته: لهماڵی (زین الدین العراقی)دا.

ههتا مامۆستاکهی مۆڵهتی پێ دا، لهساڵی (٧٩٧ك)دا، کهوانهکانی فهرموودهشوناسی بهدهرس بڵێتهوه لهزانستی فهرموودهدا لهقهبی (أمیر المؤمنین)ی پێ درا.

١٣- بنهماڵهی ئیبنو حهجهر، خهریکی بازرگانی بوونو لهههمان کاتدا گرنگیو بایهخی تهواویان دهدا بهبواری زانستو زانسته شهرعییهکان. زانای گهوره گهورهیان تیادا بوو، باپیرهی کهناوی (قطب الدین محمد بن محمد بن علی) بوو، زانایهکی گهوره بوو، وه چهند کوڕێکی ههبوو، ههموویان خهریکی بازرگانی بوون، تهنیا عهلییان،که باوکی ئیبنو حهجهره، بوو به زانا، گهرچی

باوكی ئیبنو حەجەریش كەناسراوە بە (نورالدین علی) ئەویش هەر خەریكی بازرگانی دەبوو، بەڵام زانایەكی گەورە بوو، لەفیقهی شافیعیدا پسپۆڕ بوو، شاعیر بوو، ئیبنو حەجەر دەفەرموێ: (باوكم لەزانستەكانی فەرموودەدا شارەززایی نەبوو، بەڵام شیعری زۆرە!).

سەرچاوەكان ئاوا باسی دەكەن: باوكی ئیبنو حەجەر پیاوێكی هۆشیار بوو، زۆر بەدین بوو، تا بڵێی دەستپاكو دڵپاكو زمانپاك بوو، وە زۆر رەوشت بەرز بوو، وەحەزی لە هاوڕێیەتیو تێكەڵی پیاوچاكان بوو، وە حەجی زۆری كردووە، وە موجاوەرەی زۆری كردووە. باوكی ئیبنو حەجەر لەدەوروبەری ساڵی (٧٢٠ك)دا لەدایك بووە، لەساڵی (٧٧٧ك)دا مردووە.

دایكی ئیبنو حەجەر ناوی (تجار كچی الفخر أبی بكر الرفتاوی).

١٤- لەساڵی (٧٩٨ك)دا، كە تەمەنی بووە بە (٢٥) بیستو پێنج ساڵ، ئیبنو حەجەر ژنی هێنا، ناوی ژنەكەی ئەمە بوو (أنس ابنه القاضی كریم الدین بن عبدالعزیز – ناظر الجیش) ژنەكەی لەبنەماڵەیەكی ناسراو بوون بەسەرۆكایەتیو هێژاییو زانستپەروەری ناسراو بوون، لەگەڵ ئیبنو حەجەری مێردیدا چوو حەجی كرد، زانایەكی هۆشمەندی گەورە بوو، لەلای مێردەكەی دەیخوێند، گەلێ جار ئیبنو حەجەر پێی دەگوت بەسوعبەتەوە (قد صرتِ شَیْخَةْ: بەڕاستی بوویت بە مەلایەكی گەورە) ئەم ژنەی دوعای زۆر گیرا بوو.

١٥- لەم ژنەی (أنس خان) ئەم كچانەی هەبوو:

١- زین خاتوون.

٢- فرحە خاتوون.

٣- عالیە خاتوون.

٤- رابیعە خاتوون.

٥- فاطمه خاتوون. چارەنووسی خودایی وابوو، هەرچەندە سکەکەی کوڕ دەبوو لەباری دەچوو.

لەبەر ئەوەی حەزی لەوە بوو کە کوڕی ببێ ژنی دووەمی هێنا، تاقە کوڕێکی لێی بوو، کەناسراوە بە (بدرالدين أبو المعالي محمد) لەهەژدەی مانگی سەفەری ساڵی (٨١٥ك)دا لەدایك بوو، مناڵەکانی ئیبنو حەجەر کە پێنج کچ و کوڕێ بوون.

١- زین خاتوون نۆبەرەی بووو، لەرەبیعی یەکەمی ساڵی (٨٠٢ك) دا لەدایك بووە، لەسەردەستی باوکی‌و لەسەردەستی کۆمەڵێ زانای گەورەدا، بوو بەزانایەکی باش، شووی کرد بە ئەمیر (شاهی العلائی الكركی) کۆمەڵێ مناڵی لێی بوو هەموویان مردن، لەژیانی دایکیاندا، تەنیا یەك کوڕی بۆ ماوە کە ناسراوە بە (أبو المحاسن يوسف بن شاهين) ناسرا بەکچەزای ئیبنو حەجەر، دووگیان بوو کە لەساڵی (٨٣٣ك)دا بەتاعوون مرد.

٢- فەرحە خانی کچی لە ساڵی (٨٠٤ك)دا لەدایك بوو، شووی کرد بە شیخ الشيوخ محب الدين بن الأشقر، کەپیاوێ بوو لەناودارەکانی میصر، لەساڵی (٨٢٨ك)دا بەتاعوون مرد، لەپاش ئەوە کە لەگەڵ مێردەکەیدا لەحەج گەڕانەوە.

٣- عالیە خانی کچی، لەساڵی (٨٠٧ك)دا لەدایك بوو، خۆی‌و فاطیمەی خوشکی لەگەڵ زۆر کەسی تر، لەکەسوکاری باوك‌و دایکیان بەتاعوونەکەی ساڵی (٨١٩ك) مردن.

٤- رابیعە خانی کچی لەساڵی (٨١١ك)دا لە دایك بوو، زیارەتی مەککەی کردووەو لەگەڵ باوکیدا حەجی کردووە، شووی کرد بە (الشهاب أحمد بن محمد) کچێکی لێی بوو ناوی نا (عالیە) لەژیانی خۆیانا مرد، مێردەکەشی لەساڵی (٨٣٠ك)دا مرد.

٥- تاقه کوڕەکەی کەناسراوە بە (أبو المعالي محمد) باوکی زۆر هەوڵیدا کەبیکات بە زانایەکی باش، ومزۆر بەجوانی پەروەردەی کرد، هەموو قورئانی لەبەر کرد، بەرنوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد، باوکی ئەوەندەی خۆشدەویستو ئەوەندە مەبەستی بوو کەپێی بگەیەنێ پەڕاوی (بُلُوغُ الْمَرَامِ فِي أدِلَّةِ الأحْكَام)ی لەبەر خاتری ئەو دانا، بەڵام کەمێکی بۆ لەبەر کرا، لەکاروباری ئەوقافدا یاریدەدەری باوکی بوو، دەڵێن: بەهۆی ئەم کوڕەیەوە، ئیبنو حەجەر تووشی کێشەو بەرەو خەمو خەفەتو مەینەتی زۆر بوو!

١٦- ئیبنو حەجەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) بەڕاستی زانا بوو، دانا بوو، هۆشمەند بوو، بلیمەت بوو، موحەدیث بوو، وتاربێژی ئەزهەر بوو، هەروا لەزۆری تر لەمزگەوتە گەورەو وناودارەکانی قاهیرە، خەتیبو وتاربێژ بووە، پیاوێکی زۆر هێمنو سەلارو لەسەرەخۆ بوو، هەتا بڵێی بێ هەواو خاکیو بێ نەفس بوو، زۆر بە سەبرو ئارام بوو، رۆژووی سوننەتی زۆری دەگرت، شەونوێژی زۆری دەکرد، ئەوەندە شارەزابوو لە فەرموودەو سوننەتدا، هەتا نازناوی (أميرالمؤمنين في الحديث) پێ بەخشرا بەشوێن زانستا ئەم شوێنانە گەڕاوە:

ولاتی شامو ولاتی میصرو ولاتی حیجازو شوێنانی تریش.

١٧- دانراوەکانی:

ژمارەی دانراوەکانی زیاترە لە (١٣٢) سەدو سیو دوو دانراو، کە ئەمە ناوی هەندێکیانە:

١- الإتقان في علوم القرآن.

٢- أسباب النزول.

٣- الإصابه في تمييز الصحابه.

٤- أمالي ابن حجر.

٥- البدايه والنهايه.

٦- بلوغ المرام بأدلةِ الأحكام.

٧- تقريب التقريب.

٨- تقريب التهذيب.

٩- تهذيب التهذيب.

١٠- ديوان شعر.

١١- شرح سنن الترمذى.

١٢- شرح منهاج النووى.

١٣- طبقات الحُفاظ.

١٤- فتح البارى بشرح صحيح البخارى.

١٥- لسان الميزان.... تاد.

١٨- نەخۆشی سەرەمەرگی:

وا دەردەکەوێ تووشی گرفتێکی گەدەیی بووە، بەرە بەرە تووشی تادەبوو، گەدەی زۆر دەئێشا، پزیشکەکان زۆری لەگەڵ خەریك بوون کە چارەسەری بکەن، بەڵام سوودی نەبوو، نزیکەی مانگێ تووشی سکچوونێکی سەخت بوو، گەڵێ جار خوێنی لەگەڵدا بوو، کە پێی دەگوترێ (دیزانتری).

لەسەر فەرمایشتی سەخاوی کە دەفەرموێ: (بەدووری نازانم، کە خودا خەڵاتی شەهیدبوونی پێ بەخشیبێ، چونکە تاعوون پەیدا بوو بوو) واتە: بە تاعوون شەهید بووە.

لەکۆتایی مانگی قوربانا، لەساڵی (٨٥٢ك)دا، مەرگ بوو بەمیوانی، تەمەنی بەچەند مانگێ، لە حەفتاو حەوت ساڵ تێپەڕی بوو. کاتێ وەفاتی کرد،

سـولّتان خـۆیو كاربەدەسـتانی دەوڵـەتو جـەماوەرێكی زۆر ئامـادەی سـەر تەرمەكەی بوونو بەشدارییانكرد لە ڕێو ڕەسمی نوێـژ لەسەر تەرمەكەیو لـە ناشـتنی تەرمەكـەی، نزیكـەی پـەنجا هـەزار كـەس زیـاتر لەسـەر تەرمەكـەی نوێژیانكرد. هەندێ ئەوەندە خۆشیان دەویست تەنانەت دەیانگوت: كۆمەڵێ وەلی خوا دیویانە كە خدری زیندە نوێژی لەسەر تەرمەكەی كردووە!

گـەورە پیـاوانو ئـەمیرو شـازادەكان كـێ بڕكێیـان دەكـرد بـۆ هـەڵگرتنی تەرمەكـەی لـە (القرافـة الـصُغری) لـە قـاهیرە بـەخاك سـپێررا، نزیكـەی (١٥٠٠) هەزارو پێنج سەد مەترێ لە ئارامگای شافعیـیەوە دوورە، واتە: كیلومەترو نیوێ لە مەقامی شافیعیـیەوە دوورە.

دەڵێن: نەرمە بارانێ باریوە لە تەرمەكەی، كەشتی وا لـە قـاهیرە جێگـەی سرنجە. (هەزار هەزار ڕەحمەتو ڕەزای خودای لێ بێو پڕگۆڕی پیرۆزی لەنووری خودا بێو خودا، بەڕەحمەتی خۆی لەخاكو پای ئەودا حەشـرو نەشـرمان بكـات (ئامین – ٢٠١٤/٩/٢٧) سلێمانی ماڵی خۆمان گەڕەكی قازی موحەممەد، ڕەحمەتی خودای لێ بێ - ئامین).

١٦٠٠- بەنـدەیش لێرەدا، لەكۆتایی ئەم پەڕاوە پیرۆزەدا، ئـەم زانیارییانـەم، ڕاگـوێزكردووە، لـەكۆتایی (بلـوغ المـرام مـن أدلـە الأحكـام)وە، بۆیـە ئێـستایش بـەدڵێكی پـڕ لەخـەمو پـەژارەوە، بـۆ حـاڵی شـڕی ئـەهلی سوننەتو جەماعـەت، بەدەستی ڕافضەوە، لە شامو عێراقو یەمەن، دەڵێم: عەرزی خۆشەویستانی خۆم دەكەم: ئەم دەمە كە سەعات شەشـی ئێـوارەی ڕۆژی ١٥/ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٣٣)ی كۆچییە، بەرابەر ٢٠١٢/٨/٤ زایینـیـیە، لـەماڵی خۆمـان، لـە گـەڕەكی مامۆسـتایان، گەڕەكی قازی موحەممەد، لەشاری سلێمانی، لە كوردستانی عێراق، لە وەرگـەڕانو

بەکوردی کردنو روونکردنەوەی ئەم پەڕاوی (بُلُوغُ الَمَرَامِ مِنْ أَدِلَّةِ الأَحْكَام)یە (للحافظ: أحمد بن علی بن محمد العسقلانی) لەسایەی خوداوە لێ بوومەوە.

بەندەیش لەم شوێنە پیرۆزەدا، لە پایانی ئەم پەڕاوە پیرۆزەدا، لە خودای گەورەو مەزن داوا دەکەم کە ببێ بە مایەی رەحمەتی دینو دونیامان، بۆ خۆمانو بۆماڵو منداڵمانو بۆ منالّی منالّو وەچەو نەوەمان، هەروا بۆ خوێنەریو بۆ چاپکاری، هەروا بۆ وڵاتو شارمان، هەروا لەم جێگەیەدا، شایستەی باسە، کە لەم بۆنە پیرۆزەدا، نزایەکی باشو دوعایەکی خێر بۆ جەنابی (مامۆستا محمود أحمد محمد) بکەین، کە بەڕاستی ئەم زاتە، خزمەتێکی گەورەی ئەم بەرهەمە قەڵەمییە پیرۆزانەی بەندەی هەژاری کردووە، لە خودای گەورەو مەزن داواکارم کە لەهەردوو جیهانا سەر بەرزو کامەرانو شادمان بێ، خۆیو ماڵو منالّی.

هەروا لەکۆتادا، لە خودای گەورەو سەروەر داواکارم کە پیتو فەڕو بەرەکەت، بخاتە قەڵەمو تەمەنو زمانو دڵو چاوو هۆشو ئەندامو تەندروستیو عیففەتو عافیەتمان، بۆ خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامو بۆ خزمەتی گەلی کوردی سەرجەم موسوڵمانی، سەرجەم ستەمبار، هەتا ئاخر چرکەساتی ژیانمان ئامین.......

ئێستایش لەم شوێنە پیرۆزەدا، بە ئومێدی گیرابوونو قەبووڵ بوونو وەرگرتنی ئەم طاعەتی خزمەتی سوننەتی پێغەمبەرە، ئەم پارچە شیعرە دەنووسم، کە دوعایەکە ئومێد دەکەم کە گیرا بووبێ، لە (١٩٨٩/٦/٢١)دا گوتوومە: ئێستایش دووبارەی دەکەمەوەو لەخودا داواکارم کەبێت بەهاوارمانەوەو کێشەکانمان سەرجەم بۆ چارەسەر بکات. ئاخ لەدەست (شەیتانی بیدعە) چۆن بوو، بەزەهری کوشندەی ئەهلی سوننەتو جەماعەتو کردنی بەهەزار

**پارچەوەو سێ دوژمنەکەیش، سێ (ص) صادەکەیش ئەمـەیان بەهـەل زانـیو وا خەریکمانن قەلاچۆمان دەکەن، ئەوان خەریکی کوشـتنی ئێمـەنو ولاتمـان داگیر دەکەن، ئێمەیش خەریکی بیدعەی کۆڵەکەو بیدعەی قنوتو بدعەی صلّەواتین.**

**إنا لله وإنا إليه راجعون (٢٠١٥/١/٢٥).**

سووره‌ی مانیده، سفره‌ی ره‌حمه‌ته

خوانێکی گه‌وره‌ی، به‌بێ زه‌حمه‌ته

پڕ سه‌ر له‌میوه‌ی، پڕ له‌نیعمه‌ته

چی موسوڵمانه له‌وێ ده‌عوه‌ته!

خوا به‌ره‌حمی خۆی، له‌نانی سه‌ری

له‌باده‌ی به‌هه‌شت، له‌ره‌زو به‌ری

ده‌ممان شیرینکاو، چاوو دڵ رۆشن

بیکا به‌جێمان، کام جێگه‌ی خۆشن

گۆڕمان گوشادکاو باخی به‌هه‌شت بێ

هه‌شت ده‌رگای له‌سه‌ر چه‌قی هه‌ر هه‌شت بێ!

دوور له هاڵاوی حه‌و ده‌رگای دۆزه‌خ

نه‌بێ به چاڵمان له‌ژینی به‌رزه‌خ!

خۆمان و دۆسمان له‌گه‌ڵ که‌س و کار

له‌گه‌ڵ خوێنه‌ری ئازیزی نازار

له‌ژێر سێبه‌ری سووره‌ی مانیده

خودا تو قورئان! په‌نامان بده!

ئه‌م گه‌لی کوردمش له‌سایه‌ی تۆوه

سه‌رپاک نیسلامه، له‌کۆن و نۆوه

له‌تۆڵه‌ی ئه‌وه چاکه‌ی به‌ره‌وه

به‌ختی ژێرکه‌وتووی بخه سه‌ره‌وه

لەسەر سفرەی خۆت، جێی بکەرەوە

بەدەستی رەحمەت پێی بکەرەوە!

خۆت ئاگات لێیە، تۆی هەر لەبیرە

گەرچی دەستو پێی لەناو زنجیرە

لەسەر زمانی دەنگی تەکبیرە

موسوڵمانی پاک، وەک چوری شیرە!

هەر کوردێ دەگری، لاوە یا پیرە

حوسەین بابیەتی‌و حەسەن باپیرە!

خۆشی دەرویشی تاهای دەسگیرە

چاوی لەقاپی خوای بێ وەزیرە

ئەی کوردی بێکەس، ئای بێکەسی تۆ

بۆمن بوەتە خەمی کۆن‌و نۆ

ئەی گەلی کوردم! من بەقوربانتم

ئاشق بەدین‌و خاک‌و زبانتم

بێکەسی وەک من، بۆیە بێ نازی

دەنا بۆ جوانی دەڵێی نازنازی!

کوردە! لەناو تۆ ژیانم تاڵە

بە شەوو بەرۆژ تۆم لە خەیاڵە

هەرچی دەبێژم بۆیە واکاڵە

لەبەر بێ کەسیت، حاڵم بێ حاڵە

بووی بە گۆی مەیدان، رۆژگاری نامەرد

پێت دەکا شەقێن بەدارشەقی بەرد
ڕۆژی ئینگلیزو، ڕۆژی ئەمریکا
ڕۆژی کوردی خۆت، یاریت پێ دەکا
هەروا سێ قۆڵی: عەرەب، تورک، عەجەم
خوێنت دەمژن، وەک زالووی ناودەم!
کەسێ شک نابەم، بتدەمە دەستی
جگە لەو خوایەی تۆ دەیپەرستی
کوردە! سەبرکە باری خودایە
خوا یاربێ ڕۆژان، ڕۆژی لەدوایە

وَصَلَّى اللّهُ تَعَالى عَلَى سَيِّدِنَا محمدٍ وآلِهِ وَصَحْبِهِ وَتابِعيهِ بِإِحْسَانٍ إلى يَوْمِ الدين وَسَلَّمَ.

غَفَرَ اللّهُ لي وَلِوَالِدَيَّ وَلِسَائِرِ المُسْلِمِينَ، وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُ للّهِ رَبِّ العَالَمِينَ.

بەئومێدی دوعای خێرتان
نوری فارس حەمە خان حەسەن موستەفا حەنیف
خَادِمُ العُلَمَاءِ وَالمَشَايِخِ وَالفُقَرَاءِ
سلێمانی – کوردستان – مامۆستایان – ماڵی خۆمان
شازدەی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٤٣٣ی کۆچی
٢٠١٢/٨/٥ = ١٧/ڕەمەزان – ١٤٣٣ کۆچی.

ئەمە دوا وتەی (بلوغ المرام) بوو، لەم جێگەیەدا بەئومێدی گیرابوونی ئەم نزایە دووبارەمان کردەوە

# ٤٩- كِتَابُ التَّوْبَةِ
# نامەی پەشیمانی

{بڕوانە: سەرەتای نامەی ژمارە (٤٨) = كتاب الذكر والدعاء، كەوا لەپێش ئەم نامەی ژمارە (٤٩)یەوە}.

## (١) باب في الحَضِّ عَلَى التَّوْبَةِ وَالفَرَحِ بِهَا
## هاندان لەسەر تەوبەكردنو پەشیمانبوونەوە لە گوناه بە زوویىو دڵخۆشبوون پێی

١٧٤٦- وَ عَنْهُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُ وَإِنِ اقْتَرَبَ إِلَيَّ شِبْرًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا وَإِنِ اقْتَرَبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا اقْتَرَبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً). (الحديث ٧٤٠٥ طرفه في ٧٥٠٥، ٧٥٣٧): [١٧٤٦]

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لەسەر بێ- دیسان فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لێ بێ- فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: بەندەی من گومانی چۆن بێ بەمن، من وا دەبم لەگەڵی. لەودەمەدا كەئەو ناوی من دەباو یادی من دەكا، خۆم وام لەگەڵیدا، جا ئەگەر ئەو بەتەنیا هەرخۆی یادو زیكری من بكا، ئەوا منیش هەرخۆم بەنهێنی یادی ئەو دەكەم، ئەگەر ئەو لەناو دەستەیەكا یادو زیكری من بكا، ئەوا منیش بەئاشكرا لەناو دەستەیەكی باشتردا

---

[١٧٤٦] تجريد/٥، ژمارە: ٢١٢٩ - ٧٤٠٥ بخارى. مسلم: ٦٨٨٧ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا (بخارى رقم الكتاب/٩٧ رقم الباب/١٥).

یادو باسی ئەو بەچاکە دەکەم، ئەگەر بەندە بستێ لەمن نزیك ببێتەوە، من باڵێ لەو نزیك دەبمەوە، ئەگەر ئەو باڵێ لەمن نزیك بێتەوە من دوو باڵ لەو نزیك دەبمەوە، کاتێ ئەو بەڕۆیشتنی ئاسایی بێ بۆلای من، من بەلۆقە دەچم بەپیریەوە، واتە: تابەندە، نێربێ، یامێ، بەتاعەت خۆی لەمن نزیك بکاتەوە من رەحمەتی خۆم زیاتر لەو نزیك دەکەومەوە. (تاجی کوردی/٩ ل/١٣٦ ز/٥٨ ژ/١ – باسی گەورەیی یادی خوا).

١٧٤٧- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه أَنَّهُ حَدَّثَ حَدِيثَيْنِ أَحَدُهُمَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْآخَرُ عَنْ نَفْسِهِ قَالَ إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَأَنَّهُ قَاعِدٌ تَحْتَ جَبَلٍ يَخَافُ أَنْ يَقَعَ عَلَيْهِ وَإِنَّ الْفَاجِرَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَذُبَابٍ مَرَّ عَلَى أَنْفِهِ فَقَالَ بِهِ هَكَذَا ثُمَّ قَالَ لَلَّهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ رَجُلٍ نَزَلَ مَنْزِلًا وَبِهِ مَهْلَكَةٌ وَمَعَهُ رَاحِلَتُهُ عَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ فَوَضَعَ رَأْسَهُ فَنَامَ نَوْمَةً فَاسْتَيْقَظَ وَقَدْ ذَهَبَتْ رَاحِلَتُهُ حَتَّى إِذَا اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْحَرُّ وَالْعَطَشُ أَوْ مَا شَاءَ اللَّهُ قَالَ أَرْجِعُ إِلَى مَكَانِي فَرَجَعَ فَنَامَ نَوْمَةً ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَإِذَا رَاحِلَتُهُ عِنْدَهُ. (الحديث ٦٣٠٨): [١٧٤٧]

حاریسی کوڕی سوومید -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (رەزای خوای لێ بێ) دووفەرموودەی گێڕایەوە بۆمان: یەکێکیان فەرمایشتی پێغەمەر بوو، ئەوی تریان قسەی خۆی بوو، ئیبنو مەسعوود فەرمووی: مرۆی موسڵمان، گوناهی خۆی وەك کێوێ دەبینێ، کەلەبنیا دانیشتبێ، مەترسی ئەوەی هەبێ کە بڕوخێ بەسەریا. واتە: موسوڵمان دڵی رووناکە هیچ گوناهێ بەبچووك نازانێ، لەبەرئەوە هەمیشە پارێزدەکا لەگوناە.

---

[١٧٤٧] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٧٨ = ٦٣٠٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩١٧ = ٦٨٩٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨٠ رقم الباب/٤).

بەڵام بەدکار، گوناهی خۆی بێ ئەهمیەت دەبینێ، دەربەستی نییە بەلایەوە وەك مێشێ بەلای لووتیا بڕواو بەدەستی ئاوایەکی لێ بکا ئاوایە!!

ئەوجا ئیبنو مەسعوود فەرموویە وە: خودا پتر شادمان دەبێ بەتەوبەی بەندەی خۆی، کاتێ پەشیمان دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا، هەتا ئەو پیاوە، کە لەهەوارێ دادەبەزێ، شوێنێکی تالووکەی لێدەبێ، نان و ئاوەکەی بەسەر وڵاخەکەیەوە دەبێ، سەرێ دەنێتەوە، تاوێ دەخەوێ، سەرخەوێ دەشکێنێ، کاتێ خەبەری دەبێتەوە، لەخەو هەڵ دەستێ، دەڕوانێ وڵاخەکەی بەنان و ئاوەکەیەوە ڕۆیشتووەو نەماوە! جاکاتێ بەدوای دا دەگەڕێ و لێی نائومێد دەبێ و گەرماوتوونێتی زۆری بۆ دێنێ، یا ئەوەی کە حەزی خودای لەسەر بوو بەسەری دێ، وە دەگاتە حاڵی مردن. لەبەرماندوویی و شەکەتی و توونێتی و برسێتی، دەڵێ: بابگەڕێمەوە بۆ جێگەکەی پێشووی خۆم، دەگەڕێتەوە بۆئەوێ، لەوێ دەنوێ، لەپاشا کەخەبەری دەبێتەوە و سەری هەڵ دەبڕێ، دەبینێ وڵاخەکەی بەنان و ئاوەکەیەوە لەدیاری لەلایا ڕاوەستاوە، خودا بەتۆبەی بەندەی خۆی شادمانتر دەبێ، هەتا ئەم پیاوە لێقەوماوە بەدۆزینەوەی وڵاخەکەی بەنان و ئاوەکەیەوە، لەو بیابانە چۆڵ و هۆڵەدا. (تاج/٩ ز/٩٠ ل/٢٥٨ ژ/١-باسی گەورەیی تەوبەو پەشیمانی) + (ریاض/١ ز/٢ ل/٢٢ ژ/١٥/٣).

ئەم فەرموودەیە لە ژمارە: (١٩١٧)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە، بەهرەی پتری واتیادا، ڕاگوێزکردنی سوود بەخشە:

عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ أَعُودُهُ وَهُوَ مَرِيضٌ، فَحَدَّثَنَا بِحَدِيثَيْنِ: حَدِيثًا عَنْ نَفْسِهِ، وَحَدِيثًا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ مِنْ رَجُلٍ فِي أَرْضٍ دَوِيَّةٍ مَهْلَكَةٍ مَعَهُ رَاحِلَتُهُ عَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ، فَنَامَ، فَاسْتَيْقَظَ،

وَقَدْ ذَهَبَتْ، فَطَلَبَهَا حَتَّى أَدْرَكَهُ الْعَطَشُ ثُمَّ قَالَ: أَرْجِعُ إِلَى مَكَانِى الَّذِى كُنْتُ فِيهِ فَأَنَامُ حَتَّى أَمُوتَ. فَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَى سَاعِدِهِ لِيَمُوتَ فَاسْتَيْقَظَ وَعِنْدَهُ رَاحِلَتُهُ وَعَلَيْهَا زَادُهُ وَطَعَامُهُ وَشَرَابُهُ، فَاللَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ الْعَبْدِ الْمُؤْمِنِ مِنْ هَذَا بِرَاحِلَتِهِ وَزَادِهِ». {الحديث: ٦٨٩٠ = ٦٩١٠ فم = ف.م = فتح الملهم. تجريد البخارى = الترجمة الكردية/٥، رقم: ١٩٧٨ = ٦٣٠٨. ترمذى. صفة القيامة: ٢٤٩٧. تحفة: ٩١٩٠}:

حاریثی کوڕی سوومید فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) نەخۆش بوو، چووم بۆلای بۆ سەردانو هەواڵپرسینی، دوو فەرموودەی گێڕایەوە بۆمان، یەکێکیان فەرمایشتی خۆی بوو، ئەوی تریان فەرموودەی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ).

عەبدوڵلا فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خودای گەورە زیاتر شادمان دەبێ، بەژێوانو پەشیمانیو تەوبەی بەندەی باوەڕداری خۆی، کاتێ پەشیمان دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆلای خودا، هەتا ئەو پیاوەی کە لەچۆڵەوانییەکی کاکی بەکاکی، پڕمەترسی دادەبەزێ، وڵاخێکی پێ دەبێ، نانو ئاوەکەی بەسەر وڵاخەکەیەوە دەبێ، سەرخەوێ دەشکێنێ، کە هەڵ دەستێ دەڕوانێ وڵاخەکەی بەنانو ئاوەکەیەوە، ڕۆیشتووەو گوم بووەو نەماوە!

جاکاتێ بەدوایدا دەگەڕێو تەواو ماندوو وشەکەت دەبێو توونێتی زۆری بۆ دەهێنێ، لەدڵی خۆیدا دەڵێ: دەگەڕێمەوە بۆ شوێنەکەی خۆم کەلێی بووم، لەوێ دەخەوم هەتا دەمرم!!

جا سەری لەسەر باسکی دادەنێ هەتا بخەوێو بمرێ، خەوی لێ دەکەوێ، کە خەبەری دەبێتەوەو سەری هەڵدەبڕێ، دەبینێ وڵاخەکەی بەنانو ئاوەکەیەوە، لەلایا، بەدیاریەوە ڕاوەستاوە، خودای گەورە بەتەوبەی بەندەی

ئیمانداری خۆی زیاتر شادمان دەبێ، هەتا ئەم پیاوە بەدۆزینەوەی ولاخەکەیو نانو ئاوو توێشووەکەی!).

**روونکردنەوە:**

فەرموودەکەی ئیبنو مەسعوود خۆی لە بوخاریدا ئاوایە: ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: مرۆی موسوڵمان، لەخودا دەترسێ، گوناهی خۆی وەك کێوێ دەبینێ، کە لەبنیدا دانیشتبێ، مەترسی ئەوەی هەبێکە لەپرێکا برووخێ بەسەریدا. واتە: موسوڵمان دڵی رووناکە، هیچ گوناهێ بەکەم نازانێ، لەبەرئەوە هەمیشە پارێزدەکا لە گوناهو خۆی دەپارێزێ لەتاوان. ئەوجا ئیبنو مەسعوود فەرمووی: بەڵام مرۆی بەدکار، گوناهی خۆی بەکەم دەبینێ، دەربەستی نییە، بەلایەوە کە گوناهێ دەکا، وەك مێشێ بەلای لووتیدا بڕواو، بەدەستی ئاوایەکی لێ بکاو دووری بخاتەوە ئاوایە. {بڕوانە: ریاضی صالحين/١، زنجیرە: ٢، ژمارە: ١٥ — تەوبەو پەشیمانی + تاج/٥، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٥١٣٦. م — گەورەیی تەوبەو پەشیمانی}.

١٧٤٨- أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قال النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): «اللَّهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ أَحَدِكُمْ سَقَطَ عَلَى بَعِيرِهِ ، وَقَدْ أَضَلَّهُ فِي أَرْضِ فَلاَةٍ»[١٧٤٨]

واتاو مەبەست لێی لە ژمارە: (١٧٤٧)دا ڕابورد.

---

[١٧٤٨] بڕوانە ژمارە: (١٧٤٧) (بخاری رقم الكتاب/٨٠ رقم الباب/٤).

## (٤) باب في سعة رحمة الله تعالى و أنها سبقت غضبه
## باسی گوشادیو بێ سنووری ڕەحمەتو میهرەبانی خودای گەورەو سەروەر، ڕەحمەتی خودا پێش ڕقو خەشمی خودای گەورە کەوتووە

١٧٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لَمَّا قَضَى اللَّهُ الْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ إِنَّ رَحْمَتِي غَلَبَتْ غَضَبِي) (الحديث ٣١٩٤، أطرافُهُ في: ٧٤٠٤، ٧٤٢٢، ٧٤٥٧، ٧٥٥٣، ٧٥٥٤): [١٧٤٩]

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ خودای گەورە بڕیاری دا ئەم بوونەوەرە دروست بکا، لەنامەیەکا نووسی ڕەحمەتو میهرەبانی من پێش ڕقو خەشمم دەکەوێ، بەحری ڕەحمەتم هەرکاتێ هاتە جۆشو خرۆش، ئاگرو بڵێسەی کورەی ڕقو غەضەبم دەکوژێنێتەوە، وەئەو نامەیەش کەئەمەی تیا نووسراوە لەلای خودا خۆیەتی، لەسەرو تەختو بارەگا(عەرشە) وە دایناوە!) (تاج/١ل- ٣٧ز —٦- باسی باوەڕ بەچارەنووس-ش/ت).

١٧٥٠- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ جَعَلَ اللَّهُ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزْءٍ فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ جُزْءًا وَأَنْزَلَ فِي الْأَرْضِ جُزْءًا وَاحِدًا فَمِنْ ذَلِكَ الْجُزْءِ يَتَرَاحَمُ الْخَلْقُ حَتَّى تَرْفَعَ الْفَرَسُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ. (الحديث ٦٠٠٠ طرفه في: ٦٤٦٩): [١٧٥٠]

---

[١٧٤٩] تجرید/٣، ژمارە: ١٢٨٩ = ٣١٩٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٢٣ = ٦٩٠٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٩ رقم الباب/١).

[١٧٥٠] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٢٢ = ٦٠٠٢ بخاری. (بخاری رقم الکتاب/٧٨ رقم الباب/١٩).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە زاری پیرۆزی خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: خودای گەورە ڕەحمەتو سۆزو میهرەبانی خۆی دابەش كردووە بەسەد بەشەوە، نەوەدو نۆ شیانی لای خۆی هێشتۆتەوە، وە تاقەیەك بەشیانی ناردۆتە خوارەوە بۆ ناو زەوی، ئیتر ئەمەی كە دەیبینین مەخلووقات و دروستكراوانی خودا، لەناو خۆیانا ڕەحم بەیەكتری دەكەن‌و، بەزەییان بەیكتریدا دێتەوە، ئەمە هەمووی لەوتاقە بەشەیە، تەنانەت ئەوەیشە كەوڵاخ سمی خۆی دەپارێزێ، نەبادا بەر بەچكەكەی بكەوێ، ئەوەیش هەر لەو بەشەیە.

لەگێڕانەوەیەكی ریاض الصالحین‌دا دەفەرموێ: خودا سەد ڕەحمەتی هەیە، یەك ڕەحمەتی لەوسەدە داناوە، لەناو پەری‌و جنۆكەو ئادەمیزاد و گیانلەبەران‌و جانەوەرو مارو مێروودا، ئیتر بەهۆی ئەم تاقە ڕەحمەتەوەیە، كەئەم شتانە لەناو خۆیاندا میهرو بەزەیی لەگەڵ یەكتر دەنوێنن و بەزەیی یان بەیەكتریدا دێتەوە، تەنانەت ئەوەیش كەدڕندە بەزەیی بە بەچكەی خۆیدا دێتەوە، هەر بەهۆی ئەم تاقە ڕەحمەتەوە یە، بەڵام نەوەدو نۆ ڕەحمەتی تری هەیە، هەڵی گرتوون بۆ ڕۆژی قیامەت، لەو ڕۆژەدا بەورەحمانە ڕەحم دەكا بەبەندەكانی خۆی. (ریاض/٢ ل/٩ ژ/٥١ ژ/٤٢٠ —ش).

١٧٥١- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِسَبْيٍ، فَإِذَا امْرَأَةٌ مِنَ السَّبْيِ تَبْتَغِي، إِذَا وَجَدَتْ صَبِيًّا فِي السَّبْيِ أَخَذَتْهُ فَأَلْصَقَتْهُ بِبَطْنِهَا، وَأَرْضَعَتْهُ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَتَرَوْنَ هَذِهِ الْمَرْأَةَ طَارِحَةً وَلَدَهَا فِي النَّارِ؟». قُلْنَا: لاَ وَاللَّهِ وَهِيَ تَقْدِرُ عَلَى أَنْ

لاَ تَطْرَحَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَلَّهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ هَذِهِ بِوَلَدِهَا». {الحديث: ٦٩١٢ = ٦٩٣٣ فم}:[١٧٥١]

عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: جاریٚ برِکەییٚ ژنی دیلیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) ژنێکی منالٚ بەبەریان تیادابوو، منالەکەی خۆیی لیٚ بەجێمابوو لە عەزرەت بەچکەکەی هەرگڕی دەخواردو چەرخەی دەکرد، بەناو ژنە دیلەکاندا، لەکویٚ کۆرپەیەکی مەمکە خۆرەی دەست دەکەوت هەلٚی دەگرت‌و دەینووساند بەسینگ‌و بەرۆکی خۆیەوەو مەمکی پێی دەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) بەئێمەی فەرموو: (ئایا بەڕای ئێوە ئەم ژنە پەرۆشە، ئەگەر ساواکەی خۆی دەست بکەوێتەوە، لەم بارو دۆخی پەرۆشییەیدا بۆی، فڕەی دەداتە ناو ئاگرەوە؟). گوتمان: نەخێر نەبەخوا هەتا بتوانیٚ شتی واناکا، هەرگیز ئەو جگەر گۆشەیەی خۆی کەئێستا ئاوا پەرۆشە بۆی تووڕ نادات، چ جای ئەوەی کە فڕێی بداتە ناو ئاگرەوە! فەرمووی: (دەسا زۆرباش بزانن کەخوا گەلیٚ بەرەحمترە لەگەلٚ بەندەکانی خۆیدا هەتا ئەم ژنە لەگەلٚ ساواکەی خۆیدا!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥١٥٥.م}.

١٧٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «قَالَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ حَسَنَةً قَطُّ لأَهْلِهِ: إِذَا مَاتَ فَحَرِّقُوهُ، ثُمَّ اذْرُوا نِصْفَهُ فِي الْبَرِّ، وَنِصْفَهُ فِي الْبَحْرِ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ لَيُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا لاَ يُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ، فَلَمَّا مَاتَ الرَّجُلُ فَعَلُوا مَا أَمَرَهُمْ، فَأَمَرَ اللَّهُ الْبَرَّ، فَجَمَعَ مَا فِيهِ، وَأَمَرَ الْبَحْرَ فَجَمَعَ مَا فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: مِنْ خَشْيَتِكَ يَا رَبِّ وَأَنْتَ أَعْلَمُ،

---

[١٧٥١] بخاری. أدب: ٥٩٩٩ - تجرید/٥، ژمارە: ١٩٢١. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٢٦ = ٦٩١٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٨ رقم الباب/١٨).

فَغَفَرَ اللَّهُ لَهُ». {الحديث: ٦٥١٤ = ٦٩٣٥ فم = ف‌م = فتح الملهم. تجريد البخاري = الترجمة الكردية/٤، رقم: ١٣٧٦ = ٣٤٥٢، ٣٤٧٩، ٧٥٠٦ فتح الباري. نسائي. جنائز: ٢٠٧٩. تحفة الأشراف: ١٣٨١٠}:[١٧٥٢]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوێ دەبێ، کفن دز دەبێ، هەرگیز کردەوەی چاکەی نەکردبوو، لەسەرە مەرگدا، کاتێ لەخۆی نائومێد دەبێو دەزانێ کەئیتر ناژی، کەسوکارەکەی رادەسپێرێو پێیان دەڵێ: کەمن مردم،، دارێکی زۆر کۆبکەنەوەو ئاگری تێ بەردەنو لەناو ئەو ئاگرە مەشقەڵانەدا، لەشەکەم تەواو تەواو بسووتێنن، کاتێ گۆشتو ئێسکەکەم داپڵۆخانو بووم بە خەڵووز، لەناو دنگدا ورد ورد بمهاڕنو بمکەن بە ئاردو، لە رۆژێکی رەشەبادا، نیوەم بچێنن بەدەشتو دەرداو ئەو نیوەکەی تریشم بچێنن بەناو دەریادا، چونکە بەو خودایە، ئەگەر خودا دەستی لێم گیرببێ سزایەکی وەهام دەدا، کە سزای کەسی تر وابەسەختی نادا، جا کەپیاوەکە دەمرێ کەسوکارەکەی راسپێریو وەسێتەکەی بەجێ دەهێنن، دەیسووتێننو تۆزو خۆڵە سووتاوەکەی بەرووی زەویو بەسەر رووی دەریادا دەدەن بەدەم باوەو دەیچێنن. ئەوسا خودای گەورە ئاردو گەردو تەپو تۆزەکەی کۆدەکاتەوەو، سەر لەنوێ زیندووی دەکاتەوەو دەیکاتەوە بە پیاوەکەی جارانو پێی دەفەرموێ: لەبەرچی وات لەخۆت کرد؟ دەڵێ: لەترسی سزای تۆ ئەی خوایە! وە خۆشت باشتر ئاگات لە نیازی دڵم هەیە، ئەگەر درۆ دەکەم ئەم وەڵامەم لێ قەبووڵ مەکە. ئیتر خودا باوەڕی پێ دەکاو دەزانێ کە لەترسی ئەو ئەو راسپێرییەی کردووەو وای لەخۆی کردووە،

---

[١٧٥٢] تجريد البخاري/٤، ژمارە: ١٩٣٤= ١٣٧٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٣٤ = ٦٩٣٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٩٧ رقم الباب/٣٤).

لەبەرئەوە لێی خۆش دەبێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥١٤٥. م — هەرچەندە بەندە لەرادە بەدەر تاوانی هەبێ...}.

١٧٥٣- حديث أَبِي سَعِيدٍ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): « أَنَّ رَجُلاً كَانَ قَبْلَكُمْ رَغَسَهُ اللَّهُ مَالاً فَقَالَ لِبَنِيهِ لَمَّا حُضِرَ أَيَّ أَبٍ كُنْتُ لَكُمْ قَالُوا خَيْرَ أَبٍ . قَالَ فَإِنِّي لَمْ أَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ ، فَإِذَا مُتُّ فَأَحْرِقُونِي ثُمَّ اسْحَقُونِي ثُمَّ ذَرُّونِي فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ . فَفَعَلُوا ، فَجَمَعَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ، فَقَالَ مَا حَمَلَكَ قَالَ مَخَافَتُكَ . فَتَلَقَّاهُ بِرَحْمَتِهِ»[1752]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوێ لە پێشینان، خودای گەورە ماڵی ڕژاندبوو بەسەریدا، لە کاتی سەرەمەرگیدا، بە کوڕەکانی خۆی گوت: ئایا من چۆن باوکێ بووم بۆتان؟ گوتیان: باشترین باوك بووی بۆمان، گوتی: دەی بزانن کە من هەرگیز کاری خێرم نەکردووە، کاتێ کە مردم، لاشەکەم بسووتێننو بیهاڕنو لە ڕۆژێکی بای سەختی ڕەشەبادا، خۆڵەمێشی لاشەکەم بدەن بە دەم باوە، ئەوانیش وایان کرد، جا خودا لاشەکەی کۆکردەوەو فەرمووی پێی: چی ئەمەی پێت کرد؟ گوتی: لە ترسی تۆ، جا خودای گەورە بە میهرەبانی خۆی دایپۆشی لێی خۆشبوو).

[1752] بڕوانە ژمارە: (١٧٥٢) (بخاری رقم الکتاب/٦٠ رقم الباب/٥٤).

## (٥) باب في قبُولِ التَّوْبَةِ مِنَ الذُّنوبِ، وَإِنْ تكَرَّرتِ الذُّنوبُ وَالتَّوْبَةُ
## تەوبە لە گوناهـ گیرا دەبێ، با چەند جاریش تەوبەو گوناهەکان دووبارە ببنەوە

١٧٥٤- حديث أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ « إِنَّ عَبْدًا أَصَابَ ذَنْبًا – وَرُبَّمَا قَالَ أَذْنَبَ ذَنْبًا – فَقَالَ رَبِّ أَذْنَبْتُ – وَرُبَّمَا قَالَ أَصَبْتُ – فَاغْفِرْ لِي فَقَالَ رَبُّهُ أَعَلِمَ عَبْدِى أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِهِ غَفَرْتُ لِعَبْدِى . ثُمَّ مَكَثَ مَا شَاءَ اللَّهُ ، ثُمَّ أَصَابَ ذَنْبًا أَوْ أَذْنَبَ ذَنْبًا ، فَقَالَ رَبِّ أَذْنَبْتُ – أَوْ أَصَبْتُ – آخَرَ فَاغْفِرْهُ . فَقَالَ أَعَلِمَ عَبْدِى أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِهِ غَفَرْتُ لِعَبْدِى ، ثُمَّ مَكَثَ مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ أَذْنَبَ ذَنْبًا – وَرُبَّمَا قَالَ أَصَابَ ذَنْبًا – قَالَ قَالَ رَبِّ أَصَبْتُ – أَوْ أَذْنَبْتُ – آخَرَ فَاغْفِرْهُ لِي . فَقَالَ أَعَلِمَ عَبْدِى أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِهِ غَفَرْتُ لِعَبْدِى – ثَلاَثًا – فَلْيَعْمَلْ مَا شَاءَ»[1754]

ئەمە گێڕانەوەی ژمارە: (٢١٣١)ی تەجریدی بوخارییە بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا فَقَالَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ اعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ قَالَ عَبْدُ الْأَعْلَى لَا أَدْرِي أَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ اعْمَلْ مَا شِئْتَ قَالَ أَبُو أَحْمَدَ حَدَّثَنِي

---

[1754] تجرید/٥، ژمارە: ٢١٣١ = ٧٥٠٧ بخاری. مختصر صحیح مسلم = پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٣٥ = ٦٩١٩ ترقیم شیحا = ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم. (بخاری رقم الکتاب/٩٧ رقم الباب/٣٥).

مُحَمَّدُ بْنُ زَنْجُوَيَةَ الْقُرَشِيُّ الْقُشَيْرِيُّ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ النَّرْسِيُّ بِهَذَا الْإِسْنَادِ حَدَّثَنِي عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ حَدَّثَنِي أَبُو الْوَلِيدِ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ حَدَّثَنَا إِسْحَقُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ قَالَ كَانَ بِالْمَدِينَةِ قَاصٌّ يُقَالُ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي عَمْرَةَ قَالَ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِنَّ عَبْدًا أَذْنَبَ ذَنْبًا بِمَعْنَى حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ وَذَكَرَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ أَذْنَبَ ذَنْبًا وَفِي الثَّالِثَةِ قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي فَلْيَعْمَلْ مَا شَاءَ. (الحديث ٧٥٠٧):

**ئەم فەرموودەیەش لە رياض الصالحين دا ئاوایە:**

**ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (درودو سڵاوو صەڵاواتو رەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێ و سەرو ماڵو منداڵو حاڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی تۆزی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ) لەفەرموودەیەکی قودسیدا، لە پەروەردگاری گەورەو سەروەری خۆیەوە دەگێڕێتەوە، کەخودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: بەندەیێ گوناهێ دەکا، لەپاشا پەشیمان دەبێـەوە و دەڵێ: خودایە! پەشیمانم، لێم خۆش بە، خودای پیرۆزو گەورەش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من، وەك ئەم گوناهەی کردووە، هەق دەیشزانێ، کەخودایەکی وای هەیە دەتوانێ: هەم لەگوناه خۆش بێ و هەم لەسەر گوناه تۆڵە بستێنێ، دیسان ئەو بەندەیە تێ هەڵ دەچێتەوە و گوناهێکی تر دەکاتەوە دەڵێتەوە: خودایە! پەشیمانم لەگوناهم خۆش بە.دیسان خودای پیرۆزو گەورەیش دەفەرموێتەوە: ئەم بەندەیەی من، وەك ئەم گوناهەی کردووە، دەیشزانێ کە خودایەکی وای هەیە، میهرەبانو لێبوردەیە، دەتوانێ هەم لەگوناه خۆش بێ و هەم لەسەر گوناه تۆڵە لەگوناهکار بستێنێ، دەی ئیتر هەرچی ئارەزوو دەکا با بیکا، مادام ئەمە حاڵیەتی: گوناه دەکاتو تەوبەی بەڕاستی لێ دەکا، والێی خۆش بووم —**

ش. (ریاض/٢ ل/١١ ژ/٤٢١/١٠ – باسی هیوا و ئومێد بەمیهرو ڕەحمەتی خودای گەورە زنجیرە/٥١).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە: (١٩٣٥)ی موختەصەری صەحیحی موسلیمە، بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِيمَا يَحْكِى عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ: «أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى ذَنْبِى. فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِى ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ: أَىْ رَبِّ اغْفِرْ لِى ذَنْبِى، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: عَبْدِى أَذْنَبَ ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَىْ رَبِّ، اغْفِرْ لِى ذَنْبِى، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِى ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، وَاعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ». قَالَ عَبْدُ الأَعْلَى: لاَ أَدْرِى أَقَالَ فِى الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ: «اعْمَلْ مَا شِئْتَ». {الحديث: ٦٩١٩ = ٦٩٤١ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ٢١٣١ = ٧٥٠٧. تحفة/١٣٦٠٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودو سڵاوو صەڵاواتو ڕەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو حاڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی تۆزی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزو نازداری بێ) لە فەرموودەیەکی قودسیدا، لە پەروەردگاری گەورەو سەروەری خۆیەوە دەگێڕێتەوە، کە خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: (بەندەیێ گوناهێ دەکا، لەپاشا پەشیمان دەبێتەوەو دەڵێ: خودایە! پەشیمانم لێم خۆشبە، خودای پیرۆزو گەورەیش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من، وەك ئەم گوناهەی کردووە، هەق دەیشزانێ، کە خودایەکی وای هەیە دەتوانێ کە هەم لە گوناه خۆش بێو هەم لەسەر گوناه تۆڵە بستێنێ.

دیسان ئـەو بەندەیـە تێهـەڵ دەچـێتەوەو گونـاهێکی تـر دەکاتـەوەو دەڵێتـەوە: خودایـە! پەشـیمانم لـە گونـاهم خۆشـبە، دیـسان خـودای پـیرۆزو گـەورەیش دەفەرموێتەوە: ئەم بەندەیـەی مـن، وەك ئـەم گوناهـەی کـردووە، دەیـشزانێ کـە خودایەکی وای هەیە، میهرەبانو لێبوردەیـە، دەتوانـێ هـەم لـە گونـاه خۆشـبێو هەم لەسەر گوناه تۆڵە لـە گوناهکـار بـستێنێ، دەی ئـیتر هەرچـی ئـارەزوو دەکـا، بابیکـا مـادام ئەمـە حاڵیـەتی، گونـاه دەکـاتو تەوبـەی بەڕاسـتی لێ دەکـا، والێـی خۆشبووم). {ریاض/٢، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٤٢١ — باسـی هیـواو ئومێـد بـە میهـرو ڕەحمەتی خودای گەورە}.

لێرەدا ئەمەی پترە: مامۆستاکەی موسلیم کەناوی عەبدول ئـەعلای کـوڕی حەممادە، دەڵێ: نازانم کە لەسەری جاری سێیەمدا یا لەسەری جـاری چـوارەمدا، دەفەرموێ: (چی دەکـەیت بیکـە، مـن لێـت خـۆش بـووم!). {تـاج/٥، زنجـیرە: ٩٢، ژمارە: ٥١٤٤. م}.

## (٦) باب غيرةُ اللهِ وَتَحْرِيمُ الفَوَاحِش
## بە تەنگەوەبوونی خوداو جووڵانی تووڕەیی خودا لە کاتی ڕوودانی تاوانە نادروستو نا ڕەواکانا

١٧٥٥- عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود – رضى الله عنه – قَالَ «لاَ أَحَـدَ أَغْيَـرُ مِـنَ اللَّـهِ ، وَلِذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ، وَلاَ شَىْءَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِـنَ اللَّـهِ ، لِذَلِكَ مَدَحَ نَفْسَهُ» (وَلاَ تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ) [١٧٥٥]

---

[١٧٥٥] تجريد البخاري/٥، ژمارە: ١٧٧٩ - ٥٢٢٣ بخاري. پوختـەی موسـلیم/٥، ژمـارە: ١٩٢٩ - ٦٩٢٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٦).

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كەس وەك خودا بە تەنگی ئاپینی خۆیەوە نیە، هەر لەبەر ئەوەیە كە هەموو خراپەو بێ یاسایەكی نادروست كردووە، چی بە ئاشكرا بكرێن، وە چی بە نهێنی، وە كەسیش وەكوو خودای گەورە وەسپی جوانو پیاهەڵگوتنی باشی پێ خۆش نییە، هەر لەبەر ئەوەیە كە مەتحو وەسپی جوانی خۆی دەكا).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە: (١٩٢٩)ی پوختەی موسلیمە، بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ مَدَحَ نَفْسَهُ، وَلَيْسَ أَحَدٌ أَغْيَرَ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ، وَلَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ الْعُذْرُ مِنَ اللَّهِ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ أَنْزَلَ الْكِتَابَ وَأَرْسَلَ الرُّسُلَ». {الحديث: ٦٩٢٦ = ٦٩٤٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٧٧٩ = ٥٢٢٣ م فتح الباري} :

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كەس وەك خودای باڵا دەستو خاوەن شكۆ، وەسپی جوانو پیاهەڵگوتنی پێ خۆش نییە، هەر لەبەرئەوەیە كە مەدحو وەسپی جوانی خۆی دەكا، لە ئایەتەكانی قورئاندا، وەك سوورەتی فاتیحاو قولهووەڵڵا و زۆر ئایەتو سوورەتی تر، وە كەسیش وەك خودای باڵا دەستو خاوەن شكۆ بەتەنگی ڕێزی ئاپینی خۆیەوە نییە، هەر لەبەر ئەوەیشە كە هەموو خراپەو بێ شەرعییەكی ناڕەوا كردووە، وە كەسیش وەك خودای گەورە مەهانە (عوزر)ی ڕەوای پێ خۆش نییە، هەر لەبەرئەوەیە كە نامە ئاسمانییەكانو پێغەمبەرو ڕەوانەكراوو فروستادەكانی ناردووە، هەتا خودای

گەورە چی پێ خۆشەو چی پێ ناخۆشە رونی بکەنەوە بۆ پەیوەندیداران!).
{تاج/٢، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٢٢٠٤}.

١٧٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللَّهَ يَغَارُ، وَإِنَّ الْمُؤْمِنَ يَغَارُ، وَغَيْرَةُ اللَّهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ عَلَيْهِ».
{الحديث: ٦٩٢٧ = ٦٩٥٠ فم. تجريد البخاري بالكوردی/٥، رقم: ١٧٧٩ = ٥٢٢٣ م. ترمذي. رضاع: ١١٦٨ تحفة الأشراف: ١٥٣٦٣}:[1756]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورە بەتەنگەوە دێو غیرەت دەیگرێ، هەروەها موسوڵمانیش بەتەنگەوە دێو غیرەت دەیگرێ، لەکاتی روودانی کاری ناشایستەدا بە تەنگی شەرەفو ئابڕوو ناموسەوە دێن، خودای گەورە لەسەر ئەوە غیرەت دەیگرێو هەڵدەداتێ کە موسوڵمان شتی ناڕەوا بکاو ئەوەی کە خودا نادروستو ناڕەوایکردووە ئەو بیکات). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٢٢٠٢ – مەردایەتیو بەتەنگەوە بوونی ناموس...}.

١٧٥٧- حديث أَسْمَاءَ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – يَقُولُ « لاَ شَيْءَ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ» [1757]

له ژمارەکانی پێش خۆی واتاو مەبەست لێی زانراوە.

[1756] تجريد البخاري بالكوردی/٥، ژمارە: ١٧٧٩ = ٥٢٢٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٣ - ٦٩٢٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/١٠٧).

[1757] بڕوانە ژمارەی پێش خۆی ژمارە: (١٧٥٦) (بخاری رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/١٠٧).

## (٧) باب في قَوْلِ اللهِ تعالى ﴿إِنَّ الحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾
## باسی مەبەست لە فەرمایشتی خودای گەورە ﴿إِنَّ الحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾

١٧٥٨- عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَجُلًا أَصَابَ مِنْ امْرَأَةٍ قُبْلَةً فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَقِمْ الصَّلَاةَ طَرَفَيْ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنْ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذهِبْنَ السَّيِّئَاتِ فَقَالَ الرَّجُلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِي هَذا قَالَ لِجَمِيعِ أُمَّتِي كُلِّهِمْ). (الحديث ٥٢٦ ـ طرفه في: ٤٦٨٧)[١٧٥٨]:

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ ماچێ لەئافرەتێ دەسەنێ، لەپاشان هاتە خزمەتی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) وەئەمەی باس کرد بۆی، جاخودا ئەمەی ناردەخوارەوە: (أقم الصلاة طرفى النهار وزلفاً من الليل إن الحسنات يذهبن السيئات) ١١٤/١١ ـ واتە: هەموو شەوو ڕۆژێ پێنج نوێژە فەرزەکان لەکاتی خۆیاندا بەڕێك و پێکی بکەن، دڵنیا بن کەئەم نوێژانە لەکردەوەهەرەباشەکانی ئێوەن، بەڕاستی کارێکی فرەجوان و شیرینن، بزانن کەیاسایەکی دامەزراوی خودایی یە، کەکردەوەی باش و کاری چاکەو ڕەفتاری جوان، هەمیشە کردەوەی خراپ و تاوان لادەبەن و گوناه دەسڕنەوە. پیاوەکەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە بەتایبەتی هەر بۆمن وایە؟ فەرمووی: (ئەم بڕیارە بۆگشت ئۆمەتەکەمە بۆهەموویان هەروایە). (ت/١/١٨٥/٩ ز-٤٣ ژ-٣٣١ ج-٤ = ش/د/ ت).

وعنه في رواية: (لمن عمل بها من أمتى):

دیسان لەوەوە لەگێڕانەوەیەکا: (بۆهەموو کەسێ لەنەتەوەی من ـ واتە لەگەلی ئیسلام سەرجەم ـ کەکار بەم ئایەتە بکەن).

---

[١٧٥٨] تجريد/١، ژمارە: ٣١١ = ٥٢٦ بخاری. مسلم: ٦٩٣٢ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٩ رقم الباب/٤).

١٧٥٩- حديث أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضى الله عنه – قَالَ كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْهُ عَلَىَّ . قَالَ وَلَمْ يَسْأَلْهُ عَنْهُ . قَالَ وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – الصَّلاَةَ قَامَ إِلَيْهِ الرَّجُلُ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أَصَبْتُ حَدًّا ، فَأَقِمْ فِىَّ كِتَابَ اللَّهِ . قَالَ « أَلَيْسَ قَدْ صَلَّيْتَ مَعَنَا » . قَالَ نَعَمْ . قَالَ « فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ ذَنْبَكَ». أَوْ قَالَ «حَدَّكَ»[١٧٥٩]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم، پیاوێ هات، عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تاوانێکم کردووە، بە هۆیەوە شایانی حەددی یاساییم، بفەرموو کە حەدم لێ بدرێ، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە بارەی ئەوەوە کە حەدەکە چییەو چی نییە، هیچی لێ نەپرسی، جا کاتێ نوێژ داهات، پیاوەکە لە خزمەت پێغەمبەردا ئەو نوێژەی بە کۆمەڵی کرد، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جەماعەتەکەی تەواو کرد، پیاوەکە هاتەوە بۆلایو عەرزیکردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! شایستەی حەددی شەرعیم، بە پێی نامەی خودا، کە قورئانی پیرۆزە، ئەو حەددەم بەسەردا جێبەجێ بکە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (ئەرێ تۆ ئەم نوێژەت لەگەڵ ئێمەدا بە جەماعەت نەکرد؟) پیاوەکە گوتی: (با) فەرمووی: (دەی لەبەر ئەوە خودا لێت خۆش بوو لەو شتەی کە کردووتە)، یا فەرمووی: (خۆش بوو لەو حەددەی کە لەسەرتە).

[١٧٥٩] تجريد البخاری = الترجمە الكرديە/١، ژمارە: ٣١١ - ٥٢٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٤٣ - ٦٩٣٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٦ رقم الباب/٢٧).

ئەم فەرموودەیە لە ژمارە: (٢١٤٣)ی پوختـەی موسـلیم (مختـصر صـحیح مسلم)دا، لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە ئاوایە:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود قَالَ جَاءَ رَجُـلٌ إِلَـى النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى عَالَجْتُ امْرَأَةً فِى أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَإِنِّى أَصَـبْتُ مِنْهَـا مَـا دُونَ أَنْ أَمَسَّهَا فَأَنَا هَذَا فَاقْضِ فِيَّ بِمَا شِئْتَ. فَقَالَ لَـهُ عُمَـرُ: لَقَـدْ سَـتَرَكَ اللَّـهُ، لَـوْ سَـتَرْتَ نَفْسَكَ - قَالَ - فَلَمْ يَـرُدَّ النَّبِـيُّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) شَـيْئًا فَقَـامَ الرَّجُـلُ فَـانْطَلَقَ فَأَتْبَعَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً دَعَاهُ وَتَـلاَ عَلَيْـهِ هَـذِهِ الآيَـةَ (أَقِـمِ الـصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ الـسَّيِّئَاتِ ذَلِـكَ ذِكْـرَى لِلـذَّاكِرِينَ ) فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ هَذَا لَهُ خَاصَّةً؟ قَالَ: « بَـلْ لِلنَّـاسِ كَافَّـةً ». (الحـديث ٦٩٣٥ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٦٩٥٩ فم = فـم = ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح الإمام مسلم. تجريد البخـاري بـالكوردي = مختصر صحيح البخاري/١ رقم:٣١١=٥٢٦ ، ٤٦٨٣ ترقيم فتح الباري. أبوداود. حدود: ٤٤٦٨. ترمذي. تفسير القرآن: ٣١١٢. تحفة الأشراف/٩١٦٢).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، کە ناسراوە بە ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خـوای لـێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ ماچێ لە ئافرەتێ دەسەنێ، لەپاشان هـات بـۆلای پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! لەوپـەڕی مەدینەوە، ڕامبوارد لەگڵ ژنێ، هەموو شتێکم لەگـەڵ دا کـرد، وەك مـاچو مـۆچو دەستکردنە مل، تەنیا زینام لەگـەڵ دا نـەکرد، جـا ئـەوە تـام لەبەردەسـتی تـۆدا، ملکەچم بۆ فەرمانی خودا، سەبارەت بەم تاوانەی خۆم، بڕیـارت چییە لـەبارەی منەوە سەبارەت بەم گوناهەم ملکەچم بۆی؟!

عومـەری کـوڕی خـەتتاب (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خـودا بـۆ پیۆشیویت، خۆزیـا خۆشـت پـەردەی خـودات لەسـەر خـۆت لانەبردبایـەو خۆتـت بپۆشیبایە!

فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) هـیچ وەڵامـی نەدایـەوە، هەتا کابرا هەڵسا ڕۆیـشت، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) پیـاوێکی نـارد بەشـوێنی دا، بـانگی کـردەوە، جـا پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) ئـەم ئایەتـەی بەسـەردا خوێنـدەوە: {وَأَقِـمِ الـصَّلاَةَ طَرَفَـيِ النَّهَـارِ وَزُلَفًـا مِّـنَ اللَّيْـلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ} (سورة هود-١١/١١٤).

واتـە: هـەموو شـەوو ڕۆژێ پێـنج نوێـژە فـەرزەکان لـەکاتی دیـاریکراوی خۆیانـا، بـەڕێکوپێکی بکـەن، دڵنیـابن کەئـەم نوێژانـە لـەکردەوە هەرەباشـەکانی ئێـوەن، بەڕاسـتی کـارێکی فرەجـوانو شـیرینن، بـزانن کەیاساسـەکی دامـەزراوی خوداییە، کە هەمیشە کـردەوەی بـاشو کـاری چاکەو ڕەفتـاری جـوان، کـردەوەی خراپو تاوان لادەبەنو گوناه دەسڕنەوە.

پیاوێکیش لەکۆڕەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە بەتایبـەتی هـەر بۆ ئەم وایە؟.

فەرمووی: (نەء، هەر بۆ ئەم وانییە، بەڵکوو ئەم بڕیارە، کە چاکە خراپـە لادەبات، بۆ گشت ئۆمەتەکەمە، بۆ هەموویان هەروایە!). (تاج/١ ز/٤٢ ژ/٣٣٠).

**ڕوونکردنەوە: ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:**

١- گوناەو کـردەوەی خراپـە، ئەگـەر خـودا پۆشـی بۆکەسـێ، چـاری ئەوەیـە کەلێی دووربکەوێتـەوەو تەوبـەی لـێ بکـاو بۆکـەس باسـی نـەکاو پـەردەی خـودا لەسەر خۆی هەڵ نەداتەوە.

٢- كارەباشەكان دەبن بەكەفارەتو داپۆشەر بۆ كردەوە خراپەكان، لەبەرئەوە بەندە هەتا دەتوانێ لەكردەوەی چاكە كۆتایی نەكا، كردەوەی چاكە بابەتێكی بەروالایە، هەموو جۆرە چاكەیەك دەگرێتەوە، لە فێربوونی زانستو كاروباری باش، لەباوەڕ، لەنوێژ، لەحەجو عەمرە، لەخێرو زەكاتو ڕۆژوو، لەچاكە لەگەڵ دایكو باوكو منداڵو ژنو كەسوكار، لەغەزاو تێكۆشان، لەفێربوونی زانستو چاكەكردن لەگەڵ دروستكراوانی خودا.

## (٨) بابُ قبول تَوْبَةِ القَاتِلِ، وَ إِنْ كَثُرَ قَتْلُهُ
## تەوبەی بكوژ گیرا دەبێ، با خەڵكی زۆریشی كوشتبێ

١٧٦٠- عَنْ ابي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (كَانَ فِي بَنِي اسْرَائِيلَ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ انْسَانًا ثُمَّ خَرَجَ يَسْالُ فَاتَى رَاهِبا فَسَالَهُ فَقَالَ لَهُ هَلْ مِنْ تَوْبَةٍ قَالَ لا فَقَتَلَهُ فَجعَلَ يَسْالُ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: ائْتِ قَرْيَةَ كَذا وَكَذا فَادْرَكَهُ الْمَوْتُ فَنَاءَ بِصَدْرِهِ نَحْوَهَا فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلائِكَةُ الْعَذابِ فَاوْحَى اللَّهُ الَى هَذهِ انْ تَقَرَّبِي وَاوْحَى اللَّهُ الَى هَذهِ انْ تَباعَدِي وَقَالَ قِيسُوا مَا بَيْنَهُمَا فَوُجِدَ الَى هَذهِ اقْرَبَ بِشِبْرٍ فَغُفِرَ لَهُ) (الحديث: ٣٤٧٠)؛ [١٧٦٠]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەنەوەی ئیسرائیل نەوەدو نۆكەس بەناهەق دەكوژێ، ئینجا دەپرسێ: كێ زاناترین كەسە لەولاتا، دەڵێن: فیسارە سۆفیلكە، جا كابراكە دەچێ بۆلای‌و پێی دەڵێ: مـن نەوەدو نۆكەسم بەدەستی خۆم كوشتووە، ئایا تەوبەم بۆهەیە؟ پەشیمانیم لێ گیرادەبێ؟ خوداناسەكە

---

[١٧٦٠] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٨٣ = ٣٤٧٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩١٩ = ٦٩٣٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٥٤).

دەفەرموێ: نەء، جا کابرا ئەویش دەکوژێ و دەیکا بە سەدی تەواو. جا دیسان دەست دەکاتەوە بە پرسیارو دەڵێ: کێ زاناترین کەسە لەولاتدا؟ ئەمجارە پیاوێکی زانای پێ نیشان دەدەن، جا دەچێ بۆلای و پێی دەڵێ: من سەدکەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆهەیە؟ زاناکە دەڵێ: بەڵێ: وەکەس ناتوانێ ڕای تەوبەت لێ بگرێ، تەوبە هەموو کاتێ لەهەموو کەسێ قەبووڵ دەکرێ، بەڵام لێرە مەمێنەو بڕۆ بۆ فیسارە وڵات لەوێ کۆمەڵێ خواناسی باشی لێیە، خەریکی خوداپەرستی و عیبادەتکردنن، بڕۆ لەوێ تۆیش لەگەڵ ئەواندا خواناسی بکەو مەچۆرەوە بۆ ولاتی خۆت، چونکە خاکێکی شووم و بەد قوومە، پیاوەکەیش دەکەوێتە ڕا بۆ ئەو ولاتە، دەڕوا تا دەگاتە نیوەی ڕێ، لەوێ دەمرێ؟ جافریشتەی ڕەحمەت و فریشتەی عەزاب لەسەر تەرمەکەی حازر دەبن و لەسەری دەبێ بەکێشمە کێشیان: فریشتەی ڕەحمەت دەفەرموون: ئەمە بۆ تەوبە هاتووەو بەکوڵی دڵ رووی لەخودای گەورە کردووە، کەواتە ئەمە دیاری دەستی ئێمەیە و دەیبەین بۆ بەهەشت! فریشتەی سزاش دەفەرموون: ئەمە هەرگیز کردەوەی چاکەی نەکردووە، کەواتە: ئەمە نێچیری خۆمانەو دەیبەین بۆ دۆزەخ! جا بەفەرمانی خودا فریشتەیێ لە شێوەی ئادەمیزاد دا دەچێ بۆلایان و هەردوولا ئەو فریشتەیە دەکەن بەحەکەم و ناوبژیکار، حەکەمەکە دەفەرموێ: نێوانی هەردوو شوێنەکە بپێون، ولاتەکەی خۆی و ولاتەکەی کە بۆی دەچوو، جا لەکام لایانەوە نزیکتر بوو هی ئەومیانە، کە دەیپێون دەڕوانن لەوجێگایەوە نزیکتر دەبێ کە بۆی دەچێ، ئیتر فریشتەی ڕەحمەت وەری دەگرن-ش) (تاج/٩ ل/٢٧٠ ز/٩٢ ف/٣ - باسی: هەرچەندێ بەندە لە ڕادەبەدەر تاوانی هەبێ بەڵام تەوبەی گیرا دەبێ).

**له ژماره: (١٩١٩)ی پوختەی (مختصر صحيح مسلم)دا ئاوایه، بەهرەی پتری واتیادا:**

**عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْسًا، فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ؟ فَدُلَّ عَلَى رَاهِبٍ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْسًا، فَهَلْ لَهُ مِنَ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: لاَ. فَقَتَلَهُ، فَكَمَّلَ بِهِ مِائَةً، ثُمَّ سَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ؟ فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ عَالِمٍ، فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ مِائَةَ نَفْسٍ، فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَمَنْ يَحُولُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ التَّوْبَةِ؟ انْطَلِقْ إِلَى أَرْضِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنَّ بِهَا أُنَاسًا يَعْبُدُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، فَاعْبُدِ اللَّهَ تعالى مَعَهُمْ وَلاَ تَرْجِعْ إِلَى أَرْضِكَ فَإِنَّهَا أَرْضُ سَوْءٍ، فَانْطَلَقَ حَتَّى إِذَا نَصَفَ الطَّرِيقَ أَتَاهُ الْمَوْتُ، فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ، فَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ: جَاءَ تَائِبًا مُقْبِلاً بِقَلْبِهِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. وَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ: إِنَّهُ لَمْ يَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ. فَأَتَاهُمْ مَلَكٌ فِي صُورَةِ آدَمِيٍّ، فَجَعَلُوهُ بَيْنَهُمْ، فَقَالَ: قِيسُوا مَا بَيْنَ الأَرْضَيْنِ فَإِلَى أَيَّتِهِمَا كَانَ أَدْنَى فَهُوَ لَهُ، فَقَاسُوهُ فَوَجَدُوهُ أَدْنَى إِلَى الأَرْضِ الَّتِي أَرَادَ، فَقَبَضَتْهُ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ». قَالَ قَتَادَةُ: فَقَالَ الْحَسَنُ: ذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ لَمَّا أَتَاهُ الْمَوْتُ نَأَى بِصَدْرِهِ. {الحديث: ٦٩٣٩ = ٦٩٦٣ فم = ف.م = فتح الملهم. تجريد البخارى = الترجمة الكردية/٤، رقم: ١٣٨٣ = ٣٤٧٠. تحفة الأشراف: ٣٩٧٣}:**

**ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێ لە نەتەوە پێشینەکان، کە جوولەکە بوو، لەنەوەی ئیسرائیل بوو، نەوەدو نۆکەس دەکوژرێ، ئینجا دەپرسێ: کێ زاناترین کەسە لە وڵاتدا، دەڵێن: فیسارە سۆفیلکە، جا کابراکە دەچێ بۆلای‌و پێی دەڵێ: من نەوەدو نۆکەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ خودا ناسەکە دەڵێ: نەء، جا کابرا ئەویش دەکوژێ‌و دەیکا بە سەدی تەواو، جا**

دیسان کابرای بکوژ دەست دەکاتەوە بە پرسیارو دەڵێ: کێ زاناترین کەسە لە وڵاتدا؟ ئەمجارەیان پیاوێکی زانای پێ نیشان دەدەن، جا دەچێ بۆلای‌و پێی دەڵێ: من سەد کەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ زاناکە دەڵێ: بەڵێ، وەکەس ناتوانێ رێگەی تەوبەت لێ بگرێ، تەوبە هەموو کاتێ لەهەموو کەسێ قەبووڵ دەکرێ، بەڵام لێرە مەمێنەو برۆ بۆ فیساره وڵات لەوێ تاقمەیێ خواناسی باشی لێ هەیە، خەریکی خواپەرستی‌و پەرستش‌و عیبادەت کردنن، برۆ لەوێ تۆیش لەگەڵ ئەواندا خواناسی بکەو، مەچۆرەوە بۆ وڵاتی خۆت، چونکە خاکێکی شوومەو بەدە، پیاوەکەیش دەکەوێتە رێ بۆ ئەو وڵاتە، دەروا تادەگاتە نیوەی رێ، لەوێ دەمرێ!

جا فریشتەی رەحمەت‌و فریشتەی سزاو عەزاب، لەسەر تەرمەکەی ئامادە دەبن‌و لەسەری دەبێ بەکێشمە کێشمییان: فریشتەی رەحمەت دەڵێن: ئەمە بۆ تەوبە هاتووەو بەکوڵی دڵ رووی لە خودای گەورە بووەو لە کردەوەی خراپی پێشینی پەشیمان بووە، کەواتە: ئەمە دیاری دەستی ئێمەیەو دەیبەین بۆ بەهەشت!

فریشتەی سزایش دەڵێن: ئەمە هەرگیز کردەوەی چاکەی نەکردووە، کەواتە: نێچیری خۆمانەو دەیبەین بۆ دۆزەخ!

جا بەفەرمانی خودا، فریشتەیێ لە شێوەی ئادەمیزاددا دەچێ بۆلایان، هەردوولا ئەو فریشتەیە دەکەن بەحەکەم‌و فەرمانڕەوا، حەکەمەکە دەفەرموێ: نێوانی هەردوو شوێنەکە بپێون، وڵاتەکەی خۆی‌و ئەو وڵاتەی تر کەبۆی دەچێ، جا لەکام لایانەوە نزیکتر بوو، ئەوە هی ئەوەیانە، کە نێوانیان دەپێون دەروانن لەو جێگەیەوە نزیکتر دەبێ کەبۆی دەچێ، ئیتر فریشتەی رەحمەت وەری دەگرن).

رشتەی ئەم فەرموودەیە ئاوایە: موسلیم ← موحەممەدی کوڕی موثەننی ← موعاذی کوڕی هیشام ← هیشامی باوکی موعاذ ← قەتادە ← ئەبو صەدیق ← ئەبو سەعیدی خودری.

لێرەدا قەتادە رشتەکەی دوای خۆی دەگۆڕێو ئاوا دەڵێ: حەسەنی بەصری دەفەرموێ: باس کراوە بۆ ئێمە کەکاتێ مردن دەگاتە سەری، ئەزنەك دەدا کەسینگی بەپێی توانا لەدێ باشەکەوە نزیك بکاتەوە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥٩٤٦. م} + {ریاض/١، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٢٠}.

**روونکردنەوە:**

١- مەبەست لە (الحسن) حەسەنی بەصرییە، کە تابیعییە.

٢- ئەم زیادەیەی حەسەنی بەصری لە گێڕانەوەی ژمارە: (٦٩٤٠)ی صەحیحی موسلیمدا بە مەرفووعی هاتووە.

٣- مەبەستی سەرەکی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە (دەرگای تەوبە بەمەرجی خۆی بۆ هەموو کەسێ لەسەر پشتە، تەوبەکار لە گوناهی بچکۆلە تەوبە بکا، هەر تەوبەی گیرایە، لەتاوانی هەرە گەورە تەوبە بکا هەر تەوبەی گیرایە).

٤- باشترین وەڵام، بۆ ئەو پرسەی کە دەڵێ: چۆن چۆنی خودا لە بکوژ خۆش دەبێ، بەبێ ڕەزا لەسەربوونی کوژراو، چونکە کوژراو مردووە، بەدەستهێنانی رەزابوونی لەسەر لێخۆشبوون لە بکوژەکەی ئەستەمە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: (لەم بارو دۆخانەدا، کە خودا لە تاوانبار خۆش دەبێ، بەبێ رەزابوونی ئەو کەسەی کە تاوانەکەی دەرباره کردووە، خودای گەورە دەبێ بەدەستە بەری ئەوەیش کە لەقیامەتدا خاوەن مافەکە قایل بکاو هەقی بەزیادەوە بۆ بکاتەوە).

١٧٦١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّ اللَّهَ يُدْنِي الْمُؤْمِنَ فَيَضَعُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَيَسْتُرُهُ فَيَقُولُ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ أَيْ رَبِّ حَتَّـى إِذَا قَـرَّرَهُ بِذُنُوبِـهِ وَرَأَى فِـي نَفْـسِهِ أَنَّـهُ هَلَـكَ قَالَ: سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَـكَ الْيَوْمَ فَيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ وَأَمَّا الْكَافِرُ وَالْمُنَافِقُونَ فَيَقُولُ الأَشْهَادُ: هَؤُلاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ أَلا لَعْنَـةُ اللَّـهِ عَلَـى الظَّالِمِينَ) (الحديث ٢٤٤١، أطرافُهُ في: ٤٦٨٥، ٦٠٧٠، ٧٥١٤):[١٧٦١]

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: بـەگوێی خـۆم بیـستم لـەزاری پـیرۆزی پێغەمبـەر(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دەیفـەرموو: (لـەرۆژی قیامەتـدا، لەرازێـکی نهێنـی دوو بـەدوودا، خـودای گـەورە موسـوڵمان نزیـك دەکاتەوە، بەڕەنگێـکیوا لەپەنای خۆیداپەنای دەداو لەپەنای پەردەی میهرەبـانی خۆی دا دەیپۆشێ، هەتا خەڵکی مەحشەر چاویان لـێ نەبێ، ئـەوجا خـودا یەکـە یەکـە، پێـی پـێ دەنـێ لەگوناهـەکانی: پێـی دەفـەرموێ: ئایـا پـێ دەنێیـت لـەم گوناهەو لەو گوناهە کە کردوتن، بەندەکەش گشت جارێ لـەباتی جـارێ دووجـار دەڵێ: بەلـێ ئەی خودای من! پێیان لـێ دەنـێمو لـەدنیادا ئـەم تاوانانـەم هـەموو کـردوون، هـەتا بەندەکـە ددان دەنـێ بەهـەموو ئـەو گوناهانـەی کەئـەنجامیانی داوە..

ئیتر بەندەکە دەترسێو دەحەپەسێو لەدڵی خۆیا دەڵێ: سەرم تیا دەچـێ، فـەرمووی: جـا خـوا دەفـەرموێ: مەترسـە! مـن لەجیهانـدا ئـەم گوناهانـەم بـۆ پۆشیت، ئەوا ئەمڕۆکەش لێت خۆش بـووم لـەو گوناهانـە. لـەپاش ئەمـە نامـەی کـردەوە باشـەکانی دەدەنـە دەسـتی راسـتی، ئەمـە حـاڵی موسـوڵمانە، بـەڵام

---

[١٧٦١] تجریـد البخـاری/٣، ژمـارە: ١٠٥٨ = ٢٤٤١ بخـاری. پوختـەی موسـلیم - مختـصر صـحیح مسلم/٥، ژمارە: ١٩٣١ = ٦٩٤٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤٦ رقم الباب/٢).

ناموســوڵمان، چ بێــبڕوا بــێ، چ ناپــاك، جــارِكێش لەبەرچــاوی شــایەتەكانی سەركردەوەكانیان بانگەواز هەڵدەداو دەڵێ: ﴿ هَؤُلاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ أَلا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴾ -هود/١١/١٨- واتە: ئا ئەمانە بوون كەدرۆیان بەدەم خــوداوە دەكــرد، بــزانن كەنــەفرین و لەعنــەت و ســزای ســەختی خــودا بــۆ ستەمكارانە).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە: (١٩٣١)ی پوختەی موسلیم (مختصر صحیح مسلم)ە، بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ فِي النَّجْوَى؟ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «يُدْنَى الْمُؤْمِنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ حَتَّى يَضَعَ عَلَيْهِ كَنَفَهُ، فَيُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِهِ، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُ؟ فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ أَعْرِفُ. قَالَ: فَإِنِّي قَدْ سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا، وَإِنِّي أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ، فَيُعْطَى صَحِيفَةَ حَسَنَاتِهِ، وَأَمَّا الْكُفَّارُ وَالْمُنَافِقُونَ، فَيُنَادَى بِهِمْ عَلَى رُءُوسِ الْخَلائِقِ: هَؤُلاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ». {الحديث: ٦٩٤٦ = ٦٩٧٠ فم = ف.م = فتح الملهم. تجريد البخاري = الترجمة الكردية/٣، رقم: ١٠٥٨ = ٢٤٤١، ٤٦٨٥، ٦٠٧٠، ٧٥١٤ فتح الباري. ابن ماجة. مقدمة: ١٨٣. تحفة الأشراف: ٧٠٩٦}:

سەفوانی كوڕی موحریز (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ بە ئیبنو عومەری گوت: چیت بیستووە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەرازی نهێنی نێوانی خوداو بەندەی خۆی؟ فەرمووی: ژنەوتم لێی دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەڕۆژی دوا ڕۆژدا، لە رازێكی نهێنی دوو بەدوودا، خودای گەورە، موسوڵمان لەخۆی نزیك دەكاتەوە، بە ڕەنگێكی وا لەپەنای خۆیدا پەنای دەداو بە پەردەی ڕەحمەتی خۆی دەیپۆشێ، هەتا خەڵكی




مەحــشەر چــاویان لێ نــەبێ، ئــەوجا خــودا یەکــە یەکــە، پێــی پــێ دەنــێ لــە گوناهــەکانی، پێــی دەفــەرموێ: ئایـا پـێ دەنێیت لـەم گوناهـەو لـەو گوناهـە کـە کـردووتن، بەندەکـەیش گـشت جـارێ لـەباتی جـارێ دووجـار دەڵـێ: بـەڵێ، ئـەی پەروەردگارم پێی لێ دەنێم‌و لەدنیادا ئەو تاوانانەم گشت کردوون، هەتا بەندەکە ددان دەنێ بەهەموو گوناهەکانیدا.

ئیتر بەندەکە دەترسێ‌و دەحەپەسێ‌و لەدڵی خۆیدا دەڵێ: سەرم تیادەچێ، خودا پێی دەفەرموێ: مەترسە، من لەجیهاندا ئەم گوناهانەم بۆ پۆشیویت، ئـەوا ئەمڕۆکەیش لێت خۆشبووم لەو گوناهانە، لەپاش ئەمە نامەی کردەوە باشەکانی دەدەنــە دەســتی راســتی، ئەمــە حــاڵی موســوڵمانە، بــەڵام نــا موســوڵمان، چــی بــێ بڕوابــێ، چــی مونــافق‌و ناپــاك، جــاڕکێش‌و جاڕچــی، لەبەرچــاوی شــایەتەکانی سەریان‌و لەبەرچاوی خەڵکی مەحشەر، بانگەواز هەڵدەداو دەڵێ:

{هَـؤُلاء الَّـذِينَ كَـذَبُواْ عَلَـى رَبِّهِـمْ أَلاَ لَعْنَـةُ اللّـهِ عَلَـى الظَّـالِمِينَ — هـود — ١١/١٨}. واتە: ئائەمانە بوون کە درۆیان بەدەم خـوداوە دەکـرد، ئاگـاداربن کـە نەفرین‌و نەفرەت‌و سزای سـەختی خـودا بـۆ سـتەمکارانە). {تـاج/٤، زنجـیرە: ١٢، ژمارە: ٣٩٢١ — سوورەتی هود}.

## (٩) باب حديث تَوْبَة كعب بن مالك وَ صاحِبيه
## تۆبەکەی کەعبی کوڕی مالیك‌و دوو هاوەڵەکەی

١٧٦٢- عنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ قال: لَمْ اتَخَلَّفْ عَنْ رَسُولِ اللّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا الا فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ غَيْرَ انِّي كُنْتُ تَخَلَّفْتُ فِي غَزْوَةِ بَـدْرٍ وَلَـمْ يُعَاتِبْ احَدًا تَخَلَّفَ عَنْهَا انَّمَا خَرَجَ رَسُولُ اللّهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) يُرِيـدُ عِـيرَ قُرَيْشٍ حَتَّى جَمَعَ اللّهُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ عَدُوِّهِمْ عَلَى غَيْرِ مِيعَادٍ وَلَقَدْ شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللّهِ

(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ حِينَ تَوَاثقْنَا عَلَى الاسلامِ وَمَا احِبُّ انَّ لِي بِهَا مَشْهَدَ بَدْرٍ وَانْ كَانَتْ بَدْرٌ اذكَرَ فِي النَّاسِ مِنْهَا.

كَانَ مِنْ خَبَرِي انِّي لَمْ اكُنْ قَط اقْوَى وَلا ايْسَرَ حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْهُ فِي تِلْكَ الْغَزَاةِ وَاللَّهِ مَا اجْتَمَعَتْ عِنْدِي قَبْلَهُ رَاحِلَتَانِ قَط حَتَّى جَمَعْتُهُمَا فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ وَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُرِيدُ غَزْوَةً الا وَرَّى بِغَيْرِهَا حَتَّى كَانَتْ تِلْكَ الْغَزْوَةُ غزَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَرّ شَدِيدٍ وَاسْتَقْبَلَ سَفَرًا بَعِيدًا وَمَفَازًا وَعَدُوًّا كَثيرًا فَجَلَّى لِلْمُسْلِمِينَ امْرَهُمْ لِيَتَاهَّبُوا اهْبَةَ غَزْوِهِمْ فَاخْبَرَهُمْ بِوَجْهِهِ الَّذي يُرِيدُ وَالْمُسْلِمُونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَثيرٌ وَلا يَجْمَعُهُمْ كِتَابٌ حَافِظ يُرِيدُ الدِّيوَانَ قَالَ كَعْبٌ: فَمَا رَجُلٌ يُرِيدُ انْ يَتَغَيَّبَ الا ظَنَّ انْ سَيَخْفَى لَهُ مَا لَمْ يَنْزِلْ فِيهِ وَحْيُ اللَّهِ.

وَغزَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تِلْكَ الْغَزْوَةَ حِينَ طابَتْ الثمَارُ وَالظلالُ وَتَجهَّزَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ فَطفِقْتُ اغْدُو لِكَيْ اتَجهَّزَ مَعَهُمْ فَارْجِعُ وَلَمْ اقْض شَيْئًا فَاقُولُ فِي نَفْسِي انَا قَادِرٌ عَلَيْهِ فَلَمْ يَزَلْ يَتَمَادَى بِي حَتَّى اشْتَدَّ بالنَّاسِ الْجِدُّ فَاصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ وَلَمْ اقْض مِنْ جَهَازِي شَيْئًا فَقُلْتُ اتَجهَّزُ بَعْدَهُ بِيَوْمٍ اوْ يَوْمَيْنِ ثمَّ الْحَقُهُمْ فَغَدَوْتُ بَعْدَ انْ فَصَلُوا لاتَجهَّزَ فَرَجَعْتُ وَلَمْ اقْض شَيْئًا ثمَّ غَدَوْتُ ثمَّ رَجَعْتُ وَلَمْ اقْض شَيْئًا فَلَمْ يَزَلْ بِي حَتَّى اسْرَعُوا وَتَفَارَط الْغَزْوُ وَهَمَمْتُ انْ ارْتَحِلَ فَادْرِكَهُمْ وَلَيْتَنِي فَعَلْتُ فَلَمْ يُقدَّرْ لِي ذلِكَ.

فَكُنْتُ اذا خَرَجْتُ فِي النَّاسِ بَعْدَ خُرُوجِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَطفْتُ فِيهِمْ احْزَنَنِي انِّي لا ارَى الا رَجُلا مَغْمُوصًا عَلَيْهِ النِّفَاقُ اوْ رَجُلا مِمَّنْ عَذرَ اللَّهُ مِنْ الضعَفَاء وَلَمْ يَذكُرْنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى بَلَغَ تَبُوكَ فَقَالَ: وَهُوَ جَالِسٌ فِي الْقَوْمِ بِتَبُوكَ مَا فَعَلَ كَعْبٌ؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ

حَبَسَهُ بُرْدَاهُ وَنَظرُهُ فِي عِطفِهِ فَقَالَ مُعَاذ بْنُ جَبَلٍ: بِئْسَ مَا قُلْتَ وَاللّٰهِ يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ الا خَيْرًا فَسَكَتَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ: فَلَمَّا بَلَغَنِي انَّهُ تَوَجَّهَ قَافِلا حَضرَنِي هَمِّي وَطَفِقْتُ اتَذكَّرُ الْكَذبَ وَاقُولُ بِمَاذا اخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ غَدًا وَاسْتَعَنْتُ عَلَى ذلِكَ بِكُلِّ ذي رَايٍ مِنْ اهْلِي فَلَمَّا قِيلَ انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ اظلَّ قَادِمًا زَاحَ عَنِّي الْبَاطلُ وَعَرَفْتُ انِّي لَنْ اخْرُجَ مِنْهُ ابَدًا بِشَيْءٍ فِيهِ كَذبٌ فَاجْمَعْتُ صِدْقَهُ وَاصْبَحَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَادِمًا وَكَانَ اذا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَا بِالْمَسْجِدِ فَيَرْكَعُ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ ثمَّ جَلَسَ لِلنَّاسِ فَلَمَّا فَعَلَ ذلِكَ جَاءهُ الْمُخَلَّفُونَ فَطَفِقُوا يَعْتَذرُونَ الَيْهِ وَيَحْلِفُونَ لَهُ وَكَانُوا بِضعَةً وَثمَانِينَ رَجُلا فَقَبِلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلانِيَتَهُمْ وَبَايَعَهُمْ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ وَوَكَلَ سَرَائِرَهُمْ الَى اللّٰهِ..

فَجِئْتُهُ فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَيْهِ تَبَسَّمَ تَبَسُّمَالْمُغْضبِ ثمَّ قَالَ: تَعَالَ فَجِئْتُ امْشِي حَتَّى جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَقَالَ لِي: مَا خَلَّفَكَ الَمْ تَكُنْ قَدْ ابْتَعْتَ ظهْرَكَ؟ فَقُلْتُ: بَلَى انِّي وَاللّٰهِ لَوْ جَلَسْتُ عِنْدَ غَيْرِكَ مِنْ اهْلِ الدُّنْيَا لَرَايْتُ انْ سَاخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ بِعُذرٍ وَلَقَدْ اعْطِيتُ جَدَلا وَلَكِنِّي وَاللّٰهِ لَقَدْ عَلِمْتُ لَئِنْ حَدَّثتُكَ الْيَوْمَ حَدِيث كَذبٍ تَرْضى بِهِ عَنِّي لَيُوشِكَنَّ اللّٰهُ انْ يُسْخِطكَ عَلَيَ وَلَئِنْ حَدَّثتُكَ حَدِيث صِدْقٍ تَجِدُ عَلَيَ فِيهِ انِّي لارْجُو فِيهِ عَفْوَ اللّٰهِ لا وَاللّٰهِ مَا كَانَ لِي مِنْ عُذرٍ وَاللّٰهِ مَا كُنْتُ قَط اقْوَى وَلا ايْسَرَ مِنِّي حِينَ تَخلَّفْتُ عَنْكَ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): امَّا هَذا فَقَدْ صَدَقَ فَقُمْ حَتَّى يَقْضيَ اللّٰهُ فِيكَ.

فَقُمْتُ وَثارَ رِجَالٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ فَاتَّبَعُونِي فَقَالُوا: لِي وَاللّٰهِ مَا عَلِمْنَاكَ كُنْتَ اذنَبْتَ ذنْبا قَبْلَ هَذا وَلَقَدْ عَجَزْتَ انْ لا تَكُونَ اعْتَذرْتَ الَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَا اعْتَذرَ الَيْهِ الْمُتَخلَّفُونَ قَدْ كَانَ كَافِيَكَ ذنْبَكَ اسْتِغْفَارُ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَكَ فَوَاللّٰهِ مَا زَالُوا يُؤَنِّبُونِي حَتَّى ارَدْتُ انْ ارْجِعَ فَاكَذبَ

نَفْسِي ثمَّ قُلْتُ لَهُمْ: هَلْ لَقِيَ هَذا مَعِي احَدٌ؟ قَالُوا: نَعَمْ رَجُلانِ قَالا: مِثلَ مَا قُلْتَ فَقِيلَ لَهُمَا: مِثلُ مَا قِيلَ لَكَ. فَقُلْتُ: مَنْ هُمَا؟ قَالُوا: مُرَارَةُ بْنُ الرَّبِيعِ الْعَمْرِيُّ وَهِلالُ بْنُ امَيَةَ الْوَاقِفِيُّ فَذكَرُوا لِي رَجُلَيْنِ صَالِحَيْنِ قَدْ شَهِدَا بَدْرًا فِيهِمَا اسْوَةٌ فَمَضَيْتُ حِينَ ذكَرُوهُمَا لِي.

وَنَهَى رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمُسْلِمِينَ عَنْ كَلامِنَا ايُّهَا الثلاثَةُ مِنْ بَيْنِ مَنْ تَخَلَّفَ عَنْهُ فَاجْتَنَبَنَا النَّاسُ وَتَغَيَرُوا لَنَا حَتَّى تَنَكَّرَتْ فِي نَفْسِي الارْض فَمَا هِيَ الَّتِي اعْرِفُ فَلَبِثنَا عَلَى ذلِكَ خَمْسِينَ لَيْلَةً فَامَّا صَاحِبَايَ فَاسْتَكَانَا وَقَعَدَا فِي بُيُوتِهِمَا يَبْكِيَانِ وَامَّا انَا فَكُنْتُ اشَبَّ الْقَوْمِ وَاجْلَدَهُمْ فَكُنْتُ اخْرُجُ فَاشْهَدُ الصَّلاةَ مَعَ الْمُسْلِمِينَ وَاطوفُ فِي الاسْوَاقِ وَلا يُكَلِّمُنِي احَدٌ وَاتِي رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاسَلِّمُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي مَجْلِسِهِ بَعْدَ الصَّلاةِ فَاقُولُ فِي نَفْسِي هَلْ حَرَّكَ شَفَتَيْهِ بِرَدِّ السَّلامِ عَلَيَ امْ لا؟ ثمَّ اصَلِّي قَرِيبا مِنْهُ فَاسَارِقُهُ النَّظرَ فَاذا اقْبَلْتُ عَلَى صَلاتِي اقْبَلَ الَيَ وَاذا الْتَفَتُّ نَحْوَهُ اعْرَض عَنِّي حَتَّى اذا طالَ عَلَيَ ذلِكَ مِنْ جَفْوَةِ النَّاسِ مَشَيْتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ جِدَارَ حَائِط ابِي قَتَادَةَ وَهُوَ ابْنُ عَمِّي وَاحَبُّ النَّاسِ الَيَ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَوَاللّهِ مَا رَدَّ عَلَيَ السَّلامَ فَقُلْتُ: يَا ابا قَتَادَةَ انْشُدُكَ باللّهِ هَلْ تَعْلَمُنِي احِبُّ اللّهَ وَرَسُولَهُ فَسَكَتَ فَعُدْتُ لَهُ فَنَشَدْتُهُ فَسَكَتَ فَعُدْتُ لَهُ فَنَشَدْتُهُ فَقَالَ: اللّهُ وَرَسُولُهُ اعْلَمُ فَفَاضَتْ عَيْنَايَ وَتَوَلَّيْتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ الْجِدَارَ.

قَالَ:فَبَيْنَا انَا امْشِي بِسُوقِ الْمَدِينَةِ اذا نَبَطِيٌّ مِنْ انْبَاط اهْلِ الشَّامِ مِمَّنْ قَدِمَ بالطعَامِ يَبِيعُهُ بالْمَدِينَةِ يَقُولُ مَنْ يَدُلُّ عَلَى كَعْبِ بْن مَالِكٍ فَطفِقَ النَّاسُ يُشِيرُونَ لَهُ حَتَّى اذا جَاءنِي دَفَعَ الَيَ كِتَابا مِنْ مَلِكِ غَسَّانَ فَاذا فِيهِ امَّابَعْدُ فَانَّهُ قَدْ بَلَغَنِي انَّ صَاحِبَكَ قَدْ جَفَاكَ وَلَمْ يَجْعَلْكَ اللّهُ بِدَارِ هَوَانٍ وَلا مَضيَعَةٍ فَالْحَقْ بِنَا نُوَاسِكَ فَقُلْتُ لَمَّا قَرَاتُهَا وَهَذا ايْضا مِنْ الْبَلاء فَتَيَمَّمْتُ بِهَا التَّنُّورَ فَسَجَرْتُهُ بِهَا حَتَّى اذا مَضتْ ارْبَعُونَ لَيْلَةً مِنْ الْخَمْسِينَ اذا رَسُولُ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَاتِينِي فَقَالَ: انَّ رَسُولَ اللّهِ

(صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَامُرُكَ انْ تَعْتَزِلَ امْرَاتَكَ فَقُلْتُ اطلِّقُهَا امْ مَاذا افْعَلُ قَالَ: لا بَلْ اعْتَزِلْهَا وَلا تَقْرَبْهَا وَارْسَلَ الَى صَاحِبَيَّ مِثلَ ذلِكَ فَقُلْتُ لامْرَاتِي: الْحَقِي باهْلِكِ فَتَكُونِي عِنْدَهُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللّٰهُ فِي هَذا الامر قَالَ كَعْبٌ: فَجَاءتْ امْرَاةُ هِلالِ بْنِ امَيَةَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ انَّ هِلالَ بْنَ امَيَةَ شَيْخٌ ضائِعٌ لَيْسَ لَهُ خَادِمٌ فَهَلْ تَكْرَهُ انْ اخْدُمَهُ قَالَ: لا وَلَكِنْ لا يَقْرَبْكِ قَالَتْ: انَّهُ وَاللّٰهِ مَا بِهِ حَرَكَةٌ الَى شَيْءٍ وَاللّٰهِ مَا زَالَ يَبْكِي مُنْذ كَانَ مِنْ امْرِهِ مَا كَانَ الَى يَوْمِهِ هَذا.

فَقَالَ لِي بَعْض اهْلِي: لَوْ اسْتَاذنْتَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي امْرَاتِكَ كَمَا اذنَ لامْرَاةِ هِلالِ بْنِ امَيَةَ انْ تَخْدُمَهُ فَقُلْتُ وَاللّٰهِ لا اسْتَاذنُ فِيهَا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَا يُدْرِينِي مَا يَقُولُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اذا اسْتَاذنْتُهُ فِيهَا وَانَا رَجُلٌ شابٌّ فَلَبِثتُ بَعْدَ ذلِكَ عَشْرَ لَيَالٍ حَتَّى كَمَلَتْ لَنَا خَمْسُونَ لَيْلَةً مِنْ حِينَ نَهَى رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ كَلامِنَا فَلَمَّا صَلَّيْتُ صَلاةَ الْفَجْرِ صُبْحَ خَمْسِينَ لَيْلَةً وَانَا عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِنَا فَبَيْنَا انَا جَالِسٌ عَلَى الْحَالِ الَّتِي ذكَرَ اللّٰهُ قَدْ ضاقَتْ عَلَيَ نَفْسِي وَضَاقَتْ عَلَيَ الارْض بِمَا رَحُبَتْ سَمِعْتُ صَوْتَ صَارِخٍ اوْفَى عَلَى جَبَلِ سَلْعٍ باعْلَى صَوْتِهِ يَا كَعْبُ بْنَ مَالِكٍ ابْشِرْ قَالَ: فَخَرَرْتُ سَاجِدًا وَعَرَفْتُ انْ قَدْ جَاء فَرَجٌ وَاذنَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِتَوْبَةِ اللّٰهِ عَلَيْنَا حِينَ صَلّى صَلاةَ الْفَجْرِ فَذهَبَ النَّاسُ يُبَشِّرُونَنَا وَذهَبَ قِبَلَ صَاحِبَيَّ مُبَشِّرُونَ وَرَكَض الَيَّ رَجُلٌ فَرَسًا وَسَعَى سَاعٍ مِنْ اسْلَمَ فَاوْفَى عَلَى الْجَبَلِ وَكَانَ الصَّوْتُ اسْرَعَ مِنْ الْفَرَسِ فَلَمَّا جَاءنِي الَّذي سَمِعْتُ صَوْتَهُ يُبَشِّرُنِي نَزَعْتُ لَهُ ثَوْبَيَ فَكَسَوْتُهُ ايَاهُمَا بِبُشْرَاهُ وَاللّٰهِ مَا امْلِكُ غَيْرَهُمَا يَوْمَئِذ وَاسْتَعَرْتُ ثوْبَيْنِ فَلَبِسْتُهُمَا وَانْطَلَقْتُ الَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَتَلَقَّانِي النَّاسُ فَوْجًا فَوْجًا يُهَنُّونِي بالتَّوْبَةِ يَقُولُونَ لِتَهْنِكَ تَوْبَةُ اللّٰهِ عَلَيْكَ.

قَالَ كَعْبٌ: حَتَّى دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَاذا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِسٌ حَوْلَهُ النَّاسُ فَقَامَ الَيَ طلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللّٰهِ يُهَرْوِلُ حَتَّى صَافَحَنِي وَهَنَّانِي وَاللّٰهِ مَا قَامَ الَيَ رَجُلٌ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ غَيْرَهُ وَلا انْسَاهَا لِطلْحَةَ قَالَ كَعْبٌ: فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَهُوَ يَبْرُقُ وَجْهُهُ مِنْ السُّرُورِ ابْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مَرَّ عَلَيْكَ مُنْذ وَلَدَتْكَ امُّكَ قَالَ: قُلْتُ: امِنْ عِنْدِكَ يَارَسُولَ اللّٰهِ امْ مِنْ عِنْدِ اللّٰهِ؟ قَالَ: لا بَلْ مِنْ عِنْدِ اللّٰهِ.

وَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اذا سُرَّ اسْتَنَارَ وَجْهُهُ حَتَّى كَانَّهُ قِطعَةُ قَمَرٍ وَكُنَّا نَعْرِفُ ذلِكَ مِنْهُ فَلَمَّا جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ انَّ مِنْ تَوْبَتِي انْ انْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً الَى اللّٰهِ وَالَى رَسُولِ اللّٰهِ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): امْسِكْ عَلَيْكَ بَعْض مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ قُلْتُ فَانِّي امْسِكُ سَهْمِي الَّذي بِخَيْبَرَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ انَّ اللّٰهَ انَّمَا نَجَّانِي بالصِّدْقِ وَانَّ مِنْ تَوْبَتِي انْ لا احَدِّث الا صِدْقًا مَا بَقِيتُ فَوَاللّٰهِ مَا اعْلَمُ احَدًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ ابْلاهُ اللّٰهُ فِي صِدْقِ الْحَدِيث مُنْذ ذكَرْتُ ذِلِكَ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) احْسَنَ مِمَّا ابْلانِي مَا تَعَمَّدْتُ مُنْذ ذكَرْتُ ذِلِكَ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى يَوْمِي هَذا كَذبا وَانِّي لارْجُو انْ يَحْفَظنِي اللّٰهُ فِيمَا بَقِيتُ وَانْزَلَ اللّٰهُ عَلَى رَسُولِهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ﴿لَقَدْ تَابَ اللّٰهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالانْصار ...الَى قَوْلِهِ... وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ فَوَاللّٰهِ مَا انْعَمَ اللّٰهُ عَلَيَ مِنْ نِعْمَةٍ قَط بَعْدَ انْ هَدَانِي لِلاسلامِ اعْظمَ فِي نَفْسِي مِنْ صِدْقِي لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْ لا اكُونَ كَذبْتُهُ فَاهْلِكَ كَمَا هَلَكَ الَّذينَ كَذبُوا فَانَّ اللّٰهَ قَالَ لِلَّذينَ كَذبُوا حِينَ انْزَلَ الْوَحْيَ شَرَّ مَا قَالَ لاحَدٍ فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿سَيَحْلِفُونَ باللّٰهِ لَكمْ اذا انْقَلَبْتُمْ.....الَى قَوْلِهِ..... فَانَّ اللّٰهَ لا يَرْضَى عَنْ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾ قَالَ كَعْبٌ: وَكُنَّا تَخَلَّفْنَا ايُّهَا الثلاثةُ عَنْ امْرِ اولَئِكَ الَّذينَ قَبلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ حَلَفُوا لَهُ فَبايَعَهُمْ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ وَارْجَا رَسُولُ اللّٰهِ

دارەغـا، لەسـەر رێگـەی برایمـاوە سـلێمانی. ئـیتر دادە رەحـە هـات بـۆلای بـاوکم، بەقسە فریای نەکەوت بەڵام فریای تەرمەکەی کەوت.

مـــردن بەوێنـــەی راوچـــی شـــارەزا
بـــۆ پـــاکۆی رۆحمـــان وا لـــەپارێزا
هەرکەس ناو دێنین لە دۆست و یاران
یـــا وا لەجێـــدا، یـــا وا لەقـــەبران
ئێمە گیای مەرگین، پیاڵەی دەنۆشین
هاکاشـایی ژیـن، بـوو بـە زاری و شـین
ئـەی خـودا! رەحمـێ بکـە بـە حاڵمـان
کـۆری نـاگرین، نـەبێ بـە ماڵمـان!

## ٥٠- كِتَابُ صِفَاتِ الْمُنَافِقِينَ وَ أَحْكَامُهُمْ

## نامەی نیشانەکانی ناپاکەکانو بڕیارەکانی یاسانامە لە بارەیانەوە

١٧٦٥- عَنْ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى سَفَرٍ أَصَابَ النَّاسَ فِيهِ شِدَّةٌ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَىّ لأَصْحَابِهِ: لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ، قَالَ زُهَيْرٌ: وَهِىَ فِي قِرَاءَةُ عبدالله، وَقَالَ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِىَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَخْبَرْتُهُ بِذَلِكَ، فَأَرْسَلَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَىّ فَسَأَلَهُ، فَاجْتَهَدَ يَمِينَهُ مَا فَعَلَ! فَقَالَ: كَذَبَ زَيْدٌ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: فَوَقَعَ فِى نَفْسِى مِمَّا قَالُوهُ شِدَّةٌ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ تَصْدِيقِى (إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ). قَالَ: ثُمَّ دَعَاهُمُ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِيَسْتَغْفِرَ لَهُمْ، قَالَ: فَلَوَّوْا رُءُوسَهُمْ، وَقَوْلُهُ:

(كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ). وَقَالَ: كَانُوا رِجَالاً أَجْمَلَ شَيْءٍ. {الحديث: ٦٩٥٥ = ٦٩٧٩ فم. تجريد البخاری/٤، رقم: ١٧٠٧ = ٤٩٠٠، ٤٩٠١، ٤٩٠٢، ٤٩٠٣، ٤٩٠٤ فتح الباری. ترمذی. تفسیر القرآن: ٣٣١٢. تحفة: ٣٦٧٨}:[١٧٦٥]

زەیدی کوڕی ئەرقەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەری غەزایەکا، لەخزمەتی مامەمدا، لەخزمەتی پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ) دەرچووین بۆ ئەو غەزایە، مەردومەکە تووشی سەختیو زەحمەت بوون، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیەی کوڕی سەلوول، بەلایەنگیرانی خۆی گوت: ماڵی خۆتان بۆئەوانە خەرج مەکەن کەوان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا، هەتا بڵاوەی لێ بکەنو لەدەوری بتەکێنەوە).

زوهەیری کوڕی موعاوییە، کە کەسی سێیەمە، لەڕشتەی ئەم فەرموودەیەدا، فەرمووی: قسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی، کە بەعەرەبی ئاوایە: {لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ}. ئەمە ئایەتی قورئان نییە، ئایەتەکە لە قورئاندا ئاوایە: {لَا تُنفِقُوا عَلَى مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنفَضُّوا} بەبێ زیادەی (مِنْ حَوْلِهِ). بەڵام لە قیرائەتێکی تەفسیریی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعووددا ئایەتەکە لە قورئاندا ئاوایە: {لَا تُنفِقُوا عَلَى مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنفَضُّوا – مِنْ حَوْلِهِ} بەزیادەی (مِنْ حَوْلِهِ).

هەروا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی سەرۆکی ناپاکەکان، هەڕەشەی کردو گوتی: (ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە، لەوێ لە ئێمەو لەدەستەی موحەممەد، کێمان بەدەستو بە دەسەڵاتو ئازاتربێ، شاری مەدینە بەدەستە کوونیو بێ دەستەڵاتەکەی ترمان چۆڵ دەکەین!). زەید فەرمووی: منیش چووم

---

[١٧٦٥] تجرید البخاری/٤، ژمارە: ١٧٠٧ = ٤٩٠٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٣٨ = ٦٩٥٥ شیحا = ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٦٣).




بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەم قسەو هەڕەشەیەی ئیبنو سەلوولم گێڕایەوە بۆی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن عەبدوڵلای کوڕی سەلوول و هاوڕێکانیداو، باسەکەیان بۆ باسدەکا، کە ئێوە شتێکی واواتان گوتووە، ئەوانیش حاشایان لێ کردو، بەدرۆ سوێندیان خوارد، کەئێمە قسەی وامان نەکردووەو، مامەم فەرمووی: زەید درۆی لەگەڵ پێغەمبەردا کردووە. زەید فەرمووی: منیش تووشی خەمێ وابووم، هەرگیز تووشی خەمی وانەبووم، لە ماڵەوە دەستە ئەژنۆ بەخەم و خەفەتەوە لێی دانیشتم، تا خواو راسان خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە:

{إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ، يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ}.

جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن منداو، ئایەتەکانی بۆم خوێندەوەو فەرمووی: ئەی زەید! قسەکەت راست دەرچوو، چۆنت گوت وابوو، ئەوەتانێ خودا بەم ئایەتانە راستیی قسەکەی تۆی دەرخستو ئەوانی بەدرۆ خستەوە.

فەرمووی: هەروەك لەم ئایەتانەدا روونکراوەتەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێنیاندا، کەبێن ئیعتیزار بکەن و لەم هەڵوێستە نامەردانەیان پەشیمان ببنەوە، هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای لێبووردنیان لەخودا بۆ بکا، کەچی لووتیان کرد بەولاداو، وەڵامی پێغەمبەریان نەدایەوەو روویان وەرچەرخان و ئەوەی کە پێغەمبەر بۆیان بپاڕێتەوە، ئەوەیان رەتکردەوە. گوتی: ئەوەیش کە لەم ئایەتانەدا دەفەرموێ:

{وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ – المنافقون – ٦٣/٤} . واته:

كاتێ دەیانبینیو لەگەڵیان دائەنیشیو گوفتوگۆیان لەگەڵ دەکەیت، لەشو لارو دیمەنێکی دلگیریی وایان هەیە هەرحەزدەکەی کە گوێ لەقسەیان بگری، بەڵام لەڕاستیدا هەر گەدەو گیپاڵنو دوورن لە تێگەیشتنو لەبەر قەبەییو زەبەلاحییان، دەڵێی تەختەی بەدیوارا هەڵسپێراوی بێ هەستو گیانن).

فەرمووی: ئەوەیش کە لەم ئایەتانەدا ئاوا دەفەرموێو باسی روو بازاڕیی ئەوان دەکا، مەبەست دیمەنی دەرەوەیانە کە بەڕواڵەت وابوون، لەڕاستیشدا، خۆیان پیاو گەلێکی بەڕواڵەت زۆر جوانو شێوە شیرین بوون، بەڵام لەدڵەوە تەواو بە پێچەوانەوە بوونو ناو دڵو دەروونیان پڕبوو لە کێمو زووخاوو جەرەتاو!!. {تاج/٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٤١٦٩ — سوورەتی مُنافِقُونَ} .

**روونکردنەوە:**

١- بۆ ژیاننامەی زەیدو ئەرقەمی باوکی بڕوانە: ژمارە: (٣٣٤) کە لەکۆتایی ئەم فەرموودەدا، لەم پەڕاوە پیرۆزەدا دێت، هەروا بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەکوردی بەرگی دووەم، ژمارە: (٥٩٠) هەتا کۆتایی لە زنجیرە: (٢٧).

١٧٦٦- عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ بَعْدَ مَا دُفِنَ فَأَخْرَجَهُ، فَنَفَثَ فِيهِ مِنْ رِيقِهِ، وَأَلْبَسَهُ قَمِيصَهُ) (الحديث – ١٢٧٠ – أطرافه في: ٣٥٠، ٣٠٠٨، ٥٧٥٩): [١٧٦٦]

---

[١٧٦٦] تجريد/٢، ژمارە: ٦١٠ = ١٢٧٠ بخاری. مسلم، صفات المنافقين: ٦٩٥٨ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٢٣ رقم الباب/٢٣).

جابری کوڕی عەبدولاّ (ڕەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بیّ- چووە سەر گۆڕەکەی عەبدوللاّی کوڕی ئوبەیی، لەپاش ناشتنی، فەرمانی کرد دەریان هێنا لە گۆڕەکەی، بەئومێدی سوود بۆی تفی دەمی بەفووی خوویدا لەجەستەیی و، کراسێکی خۆی بۆ موفەرکی لەسەر گۆشتەوە کردەبەری.

١٧٦٧- عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيّ لَمَّا تُوُفِّيَ جَاءَ ابْنُهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَعْطِنِي قَمِيصَكَ أُكَفِّنْهُ فِيهِ وَصَلِّ عَلَيْهِ وَاسْتَغْفِرْ لَهُ، فَأَعْطَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَمِيصَهُ، فَقَالَ (آذِنِّي أُصَلِّي عَلَيْهِ) فَآذَنَهُ فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ جَذَبَهُ عُمَرُ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ: أَلَيْسَ اللَّهُ نَهَاكَ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ ؟ فَقَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَنَا بَيْنَ خِيَرَتَيْنِ، قَالَ: (اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْلاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ). فَصَلَّى عَلَيْهِ، فَنَزَلَتْ: (وَلَا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ). (الحديث ١٢٦٩ – اطرافه في: ٤٦٧٠، ٤٦٧٢، ٥٧٩٦):[١٧٦٧]

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوایان لیّ بیّ- فەرمووی: (کە عەبدولاّی کوڕی سەلوول ــ سەرۆکی ناپاکەکان ــ مرد، عەبدوللاّی کوڕی ئەم عەبدولاّیە، کە یەکێك بوو لەهاوڕیّ ڕاست و باشەکانی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بیّ- هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بیّ- عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کراسێکی خۆتم بدەریّ، تا بیکەم بە کفن بۆ باوکم، ئەویش کراسێکی خۆییدا پێی، لە پاشا داواشی لێکرد کە نوێژی مردووشی لەسەر بکاو بۆشی بپاڕێتەوە، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بیّ- بەڵێنی ئەوەی پێداو

---

[١٧٦٧] تجرید/٢، ژمارە: ٦٠٩ - ١٢٦٩ بخاری. مسلم صفات المنافقین: ٦٩٥٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٢٣ رقم الباب/٢٣).

فەرمووی: (ئاگادارم بکە نوێژی لەسەر دەکەم) جا کە لەشۆرین و کفن کردنی بوونەوە، عەبدوللا پێغەمبەری ئاگادارکردەوە، کە تەشریفی بچێ نوێژی مردوو لەسەر تەرمەکەی باوکی بکا، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- هەڵسا کە نوێژی لەسەر بکا، عومەر -رەزای خوایان لێ بێ- هەڵسا جلەکەی پێغەمبەری گرت و کێشایە دواوەو عەرزی کرد: قوربان ! ئەی پێغەمبەری خودا ! تۆ خودا رێگەی ئەمەی نەداویت، ئیتر نوێژی چی لەسەر دەکەی! ئەوەتا بەئاشکرا قورئان دەفەرمووێت: ﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ..﴾؟ پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەمەی تۆ دەیڵێیت وایە، بەلام من هێشتا ئومێدم ماوەو بەتەواوی رێگەی ئەوە نەگیراوە، چونکە لەم ئایەتەدا، کە سەبارەت بەم بابەتەن، خودا منی کردووە بەسەر پشك و خاتر خۆی کردووم و دەفەرموێ: ﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ — تەوبە /٨٠/٩﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر! ئارەزووی خۆتە داوای لێخۆش بوون بکە بۆیان یا مەکە، ئێمە رێگەی ئەوەت لێناگرین، بەلام ئەوە بێ سوودە، ئەگەر نەك جارو دووجار، تەنانەت حەفتا جاریش داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکەی خودا لێیان خۆش نابێ). ئەوجا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (دەی من لە حەفتا جار زیاتر داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکەم). عومەر -رەزای خوایان لێ بێ-: فەرمووی ئاخر ئەمە ناپاك و موونافقە.

جا قسەبەر فەرمووی: جاکاتێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نوێژی لەسەر ئیبنو سەلوول کرد، خودا ئەم ئایەتەی تری ناردە خوارەوە کەدەفەرموێت: ﴿وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ - تەوبە/٨٤/٩﴾. واتە: بە هیچ جۆرێ نوێژمەکە لەسەر هیچ کامێ لەوان، کاتێ کە دەمرن، وە لەسەر گۆڕەکەی ڕامەوەستە بۆ نزاکردن بۆی) (بڕوانە: تاج

/٦/٢٠٧/١٦-ش/ت).

**راڤەو شیکردنەوە:**

**یەکەم-** ئەم فەرموودەیە بەلگەیەکی روون و ئاشکرایە بۆ چەندبابەتێکی تازە بابەتی هاوچەرخ، کە بەزەقی‌و مەترەقی لەم سەردەمەی ئێمەدا روودەدەن، بەتایبەتی لەو ناوچەو ولأتانەی کە بەناوی ئازادی و سەربەستییەوە رێگەی ئیلحاد دراوە، وەهەندێ گرووپ و لایەن و کۆمەڵ و پارت پەیدابوون، بەدەق لەبەرنامەی نوسراوی خۆیاندا جاردەدەن: (ئێمە باوەڕمان بەهیچ ئایینێ نییە). (نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ!) خزمینە، تا مەودا ماوە (أعُوذُ بالله) زۆر بکەن، نەبادا قەدەغە بکرێ!!

لەم رۆژانەدا (مانگی نۆی ساڵی/٢٠١٤)ەی زایینی کۆمەڵێ بەناو رۆشنبیری کورد، لەداخی ئەوەی کە زۆرو ستەم لە ئێزیدییەکان کراوە، لەلایەنی موسوڵمانانەوە بوون بەشەیتان پەرست. پیرۆزیان بێت، چونکە بەڕاستی ئەم جۆرە بەرێزانە شایەنی ئەو جۆرە دینانەن. بەلأم من ئەم تاقە پرسیارە لەم شەیتان پەرستە نوێیانە دەکەم:

(باشە ئەو هەمکە کوردە، لەناو خۆیانا، لەشەڕی براکوژیدا، ئەو هەمکەیان لەناو خۆیانا لەیەکتری کوشت، بۆچی کەسێ لەحیزبەکەی خۆی هەڵنەگەڕایەوەو نەیگوت: ئەرێ ئەم شەڕی براکوژییە هەتا کەی؟).

وە زۆر کەسیش لە خەڵکی ولأت، دەچنە سەر ئەم بیرو باوەڕانە، وەناوی خۆیان لەلیستی ئەوانا دەنوسن و ناسنامەی ئەو گرووپانە وەردەگرن، کە ئەمانە لەپێش ئەم گۆڕانکارییەدا سەر بەئایینێ لەئایینەکان بوون. ئەمە لەلایێ. لەلایەکی تریشەوە زۆرینەی کات هەتا کاتی مردن، ئەوەی پێی بڵێی بۆنی ئایین لێیان نایێ، بگرە زۆرینەی کات بەئاشکراش دژی ئایین دەوەستن، وەکی تریش

کاتێ دەمرن، بەشێوەیەکی گشتی، هەموو مەراسیم و پێویستیە ئایینیەکانیان بۆ دەکرێ، بە وێنە ئەگەر لە پێشدا بەئیسلام ناسرابن ئەوا وەك موسوڵمانانی تر دەشۆرێن و کفن دەکرێن و نوێژی مردوویان لەسەر دەکرێ و تەڵقینیان دائەدرێ و پرسەیان بۆ دادەنرێ و سەرخۆشی لە کەس و کاریان دەکرێ و لە پرسەکەیاندا فاتیحەو قورئان دەخوێنرێ و پاداشەکەیان دەنێررێ بۆ گیانیان و نزای باشیان بۆ دەکرێ و داوای لێخۆشبوونی گوناهیان لە خودا بۆ دەکرێ !!.

دەی بڕیاری شەرعی پیرۆز سەبارەت بەم مەراسیم و دەستووورە ئایینیانە کە بۆ ئەم زەندیق و بێ بڕوا رەسمییانە دەکرێن چییە؟!

لەوەڵامدا دەڵێین: بەپێی بنەما شەرعییەکان و فەرموودەی زانا گەورەکان و فەرمایشتی پەڕاوە ناودارەکانی شەریعەت، دەبێ لەم جۆرە بابەتانەدا، ئەم بنەماو رێسا سەرەکییانە بەووردی رەچاو بکرێن:

١ـ هەرکەسێ ساغ بوویەوە کە بەشێوەیەکی شەرعی لەئایین پاشگەز بووەتەوە ئەوە لە یاسانامەی خودادا کۆمەڵێ بڕیاری چەسپاوی ناسراو، لەبارەیەوە هەیە. ئێمە لێرەدا مەبەستمان ڕوونکردنەوەی ئەو بڕیارە زانراوانە نییە، کە لە یاسانامە (شەریعەت)دا سەبارەت بە ملحدیین و مورتەددی شەرعی هەیە.

٢ـ بڕیاردان لەسەر وەرگەڕان لە ئایین کاری موفتیو قازییە، ئیشی رەشەخەڵك و عەوام نییە، وە ئەوانیش لەکاتی وادا دەبێ ئەوپەڕی دووربینی بکەن و بەکوێرانە بڕیاری کافر بوونی کەسێ نەدەن کە نیسبەتی گوفتارو کرداری پاشگەز بوونەوەیان لێ دەدرێ وەك ئەم کەسانەی کە گووتمان.

٣ـ هەموو ئادەمیزادێ بە زیندوویی و بە مردوویی، بەشی خۆی رێزی هەیە، وە هەموو رێزێکی پارێزراوە، مەگەر رێزێ کە شەرع ئیسقاتی بکاو

پووچی بکاتەوە.

٤- وەك لە شەرحەکانی ئەم فەرموودەیەدا هاتووە، حیکمەتی ئەم ئاسانکارییە کە پێغەمبەر خوی -دروودی خوای لەسەر بێ- بۆ سەرۆکی مونافقەکانی ڕەوا دیوە ئەم چەند مەبەستەیە:

أ ـ ئومێد نەبڕاوە، دەگونجێ کابرا تەوبە بکا، یا تەوبەی کردبێ، خاتیمە مەجهووله، ئیمان پەنهانە، زۆر لەمانە لە سەرەمەرگ و نەخۆشینی مەرگا، پاش ئەوەی کە لە جاهو دەستەلات و خۆشی دنیا نائومێد دەبن، مل بۆ هەق دادەنەوێنن و دین لەکانگای دڵەوە قەبووڵ دەکەن، ئیمان هێنانی فرعەون لەکاتی نووقم بوونیدا ڕاسترین بەڵگەیە بۆ ئەم بابەتە. من بەچاوی خۆم پیاوێکم بینی نەخۆش بوو، سەر بە پارتێکی مولحید بوو، لەپێش مەرگیا بەچەند رۆژێ، لە مەرقەدەکانی دێکۆن‌و بیارە، وەك پیرێژنێکی جافی نەخوێنەوار دەپاڕایەوەو داوای لێ دەکرد کە لەخودا بپاڕێنەوە بۆی تا شیفای بدات. کاتێ مرد، لەسەر گۆڕەکەی پارتەکەی شانازی پێوەی دەکرد، هەروا کەسوکارەکەی، لەپاش ڕێ‌و رەسمی حیزبایەتی خۆیان، بەلالووتەوە ڕێگەی مەلا هۆشیاریان دا کە تەڵقینی بخوێنێ.

**وەرگێڕ** ( ٢٠١٥/١/٢٦ )

وەك قورئان بەدەق دەفەرموێ: ﴿..حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَاْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ. (١٠/٩٠)﴾. واتە: کاتێ فیرعەون لەدەریاکەدا غەرق بوو، ئیمانی هێناو گوتی: (واباوەڕم هێنا بەو خوایەی کەنەوەی ئیسرائیل دەیپەرستن، وە من یەکێکم لە موسوڵمانان).

ب ـ (استصلاحا للقلوب المؤلفة) ئیتر شتەکە سوودی هەیە بۆ مردووەکە یا نییەتی ئەوە زۆر کاریگەر نییە لەکارەکەدا. دەڵێن: بەهۆی ئەم هەڵوێستەی

پێغەمبەرەوە لەگەڵ ئیبنوسەلوولدا، ئەو ڕۆژە هەزارکەس لە هۆزەکەی ئیسلام دەبن.

ج ـ بۆ ڕێزلێنان لە عەبدوڵلای کوڕی، کە موسوڵمانێکی زۆر زۆرباش بووە، وەك لە ژیاننامەکەیدا ڕوونی دەکەینەوە، زۆر لەشوێنکەوتوانی ئەم پارتە ئیلحادییانە ساویلکەو هەژارۆکەو ڕەشە خەڵکن، لەکارەکە بەباشی حاڵی نەبوون، پارتە زەندیقەکانیش بۆ تەفرەدانی جەماوەرە دیندارەکە، وەك شیعەکان تەقیە بەکاردەهێنن و زۆر بە زەقی شالآو نابەنە سەر ئایین و پەیڕەوانی. بگرە زۆرکەس لەپەیڕەوانی ڕەسمی ئەم پارتە زەندیق و بێ ئایینانە نوێژ دەکەن، ڕۆژو دەگرن، حەج دەکەن، هامۆشۆی مزگەوت دەکەن، خێر دەکەن.

نموونەی زۆر هەیە لەسەرئەوە کە مرۆڤ گای ڕەش نییە کە هەتا مردن لەیەك پێستا بمێنێتەوە. ئەوەتا ڕۆژانە دەبینین کەسانی تاوانبارو فاسق و زەندیق و بێ دین تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ باوەشی ئایین، کێ دەڵێ ئەمانەیش تەبەڕایان لەو لایەنانە نەکردووە؟!

تەکفیری شەخصێ بەتایبەتی ـ واتە: لەپاش مردن ـ جگە لەوانەی کە لە قورئان و سوننەتدا ناو براون، کارێکی باش نییە، بگرە دروست نییە، لەپاش ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانە، بەدڵنیاییەوە دەڵێین:

أ ـ کردنی ئەم جۆرە شتانە، بۆ ئەم جۆرە کەسانە، بەم جۆرە نیازانەی کەباسمان کردن، فەیدی نییە، بەر مەرتەبەی عەفو دەکەون، وەبەر ئەو شتانە دەکەون، کە قورئان لەبارەیانەوە دەفەرمێت: ﴿یاایها الذین امنوا لاتسألوا عن اشیاء ان تبدلکم تسؤکم﴾. وە پێغەمبەریش ـدروودی خوای لەسەر بێـ دەفەرموێ: ﴿..وَعَفَا عَنْ أَشْيَاءَ رَحْمَةً بِكُمْ لا عَنْ نِسْيانٍ فَلا تَسْأَلُوا عَنْها..﴾.

وەکی تریش شتەکە گەیشتوەتە ڕادەی بەلوا عاممە، لەبەرئەوە چاوپۆشی

کردن و خۆ گێل کردن لێی کارێکی خراپ نییە. ئەوەندە هەیە ئەگەر کەسێ ئاگاداری تەواوی هەبێ بەسەر حاڵی مردووەکەدا، کە هەتا کاتی گیان دەرچوون، هەر بەردەوام بووە لەسەر پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام، ئەوە باشترو چاکتر ئەوەیە، کە وەك پاشگەزو مورتەدد مامەڵەی لەگەڵدا بکا، بەڵام لە سنووری ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا، کە هانمان دەدا لەسەر سرِ قایمی کە بەدەق دەفەرموێ: (استعینوا علی قضاء حوائجکم بالکتمان).

ب ـ وەك لەم فەرموودە پیرۆزەوە دەردەکەوێ، مردوو ـ گەرچی لە ژیانیدا خراپیش بێ ـ بەڵام کاتێ دەمرێ، لەلای کەسوکاری شیرین دەبێ، مردن نەنگییەکانی دەشارێتەوە، لەبەرئەوە کەسوکاری بەپێی توانا، هەوڵ دەدەن مایەی چاوپۆشی لێکردنی خودای بۆ دابین بکەن، وە بەهۆی سەرەتای خورپە لێکەوتنەوەو سامی مەرگەوە، لەمەدا تارادەیێ عوزریان هەیە. سەرنج بفەرموون: ئەوەتا عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول، لەژیانی باوکیدا، زۆر توندوتیژ بووە دەرهەقی، تەنانەت داوای لەپێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کرد کە رێگەی بدات خۆی بەدەستی خۆی بدا لەگەردنی باوکی، لەسەر ئەو هەڵوێستە ناشیرینانەی کە بەرامبەر بەپێغەمبەر هەیبوو، بەڵام پێغەمبەر رێگەی ئەوەی نەدا، چونکە ئاگای لەو ئایەتانە بوو کە سەبارەت بە ئیبنوسەلوولی باوکی هاتبوون، لەگەڵ ئەوەیشا، ئەوەتا کاتێ ئیبنوسەلوول دەمرێ، لەبەر چاوی عەبدوڵڵای کوڕی شیرین دەبێ، مەرگ خراپەکانی دادەپۆشێ، شلۆقی هەڵوێست کارێکی وادەکا، کە رەحمی بۆی بجووڵێ، چونکە کاتی گلەیی و تانەو تەشەر نییە بەڵکو کاتی لێقەومان و فریاکەوتن و نزای باشە.

ئەم دیدو بۆچوونە نوێیە بوو کە وای لەعەبدوڵلا کرد داوا لە پێغەمبەر بکاو ئەو شتانە بۆ باوکی بکا، کە لە فەرموودەکەدا باس کراوون.

جـ پێغەمبەری خودا -درودی خوای لەسەر بێ- بەنهێنی، ناوی موناقق و ناپاکەکانی بە حوزەیفەی کوڕی یەمان فەرموو بوو، لەبەرئەوە کاتێ کەسێ دەمرد، پێشەوا عومەر -رەزای خوایان لێ بێ- لەلای خۆیەوە سەرنجی حوزەیفەی دەدا، ئەگەر ئامادەی سەر تەرمی ئەو مردووە ببوایەو نوێژی لەبەر بکردایە، ئەوا حەزرەتی عومەریش دەیزانی کە ئەوە موناقق نییە، لەبەرئەوە ئامادەی سەر تەرمەکەی دەبوو، وەنوێژی لەسەری دەکرد، بەڵام ئەگەر حوزەیفە ئامادەی سەر تەرمەکەی نەبووایە، ئەوا عومەریش ئامادەی نەدەبوو، وە لەوەوە ئەوەی وەردەگرت خاوەنی ئەو تەرمە لەو ناپاکانەیە، کەپێغەمبەر ناوەکانیانی بەنهێنی بەحوزەیفە ووتووە، دەی ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم جۆرە بابەتانە هەتا لەژێر پەردەوە بن باشە، وەشەرع ئاشکرا ببینە، لەبەرئەوە بڕیاری شەرع بەپێی رواڵەتە، وەئەصڵ لەم جۆرە کاتانەدا، بەرائەتە، چونکە ئەصڵ بەقای ئەصڵەکە ئیمانە، وە بەرائەتە لە کوفر هەتا بەبەڵگەی دامەزراو کوفری کابرا دەچەسپێ.

د ـ فەرمایشتی ڕاست و دروست ئەوەیە: (کە موسوڵمان هەتا بۆی دەکرێ لەدنیاو لەقیامەتدا لەم جۆرە کەسانە دوور بێ، لە دونیادا هاوڕێتی یان نەکات و، لە گۆڕستان گۆڕی لەگەڵ گۆڕیاندا نەبێ، چونکە نزیکی مرۆڤی خراپ لە هەردوو دنیادا مایەی سەراسێیە).

هـ ـ لەبابەتی نیکاح و تەلاق و میرات و شتی تری وایشدا هەمان حسابیان بۆ بکرێ.

**دووەم:** عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سەلوول (رەزای خوای لێ بێ) یەکێکە لە هاوڕێ زۆر بەڕێزەکانی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ-

خەزرەجییە، ئەنصارییە، لەپێشدا ناوی حوباب بوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ناوەکەی گۆڕی و ناوی نا عەبدوڵلا ئامادەی غەزای بەدرو ئوحودو گشت غەزاواتەکانی تری پێغەمبەر بووە، لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا ومیەکێ بوو لەنووسەرانی سرووش، وە لەغەزای تەبووکا عەبدوڵلای باوکی، کە ناودارە بە ئیبنوسەلوول، کە سەرۆکی ناپاکەکان بوو، هەڕەشەی لەپێغەمبەر کردو گوتی: (من و موحەممەد کاتێ گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە، کاممان بەدەسەلاَت و تواناتر بوو، بەوی ترمانی چۆڵ دەکات، مەدینە یا بۆ من دەبێ یا بۆ ئەو) جا کاتێك قورئانی پیرۆز، پەردەی لەسەر ئەم قسە ژەهراوییەی ئیبن سەلوول هەڵماڵی، عەبدوڵلای کوڕی، پشتی پێغەمبەری گرت و لەدژی باوکی وەستاو بەپێغەمبەری فەرموو: (سوێندم بە خودا ئەی پێغەمبەری خودا ! داماوو ناتەوان ئەوە، عەزیزو دلێروتوانا تۆی!) هەروەها فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر ڕێگەم پێ بدەی بەدەستی خۆم دەیکوژم) بەلاَم پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ڕێگەی پێ نەدا، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- زۆر لێی ڕازی بوو، وەگەڵ جار پەسەن و مەدحی ئەوی کردووە، لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا (ردده) دا، لەکاتی جێنشینی ئەبوبکری سدیقدا، لەساڵی دوانزەی کۆچییدا، لە یەمامە شەهیدبوو، (ڕەزای خوای لێ بێ) (بڕ: شەریعەتی ئیسلام، مغنی موحتاج، فیقهی ئاسان، باسی تەرم).

**سێیەم:** ئەم عەبدوڵلای کوڕی سەلووله باوکی ناوی ئوبەیی کوڕی مالیکە، سەلوول نەنکییەتی، دایکی باوکییەتی، ژنێ بوو لەهۆزی خوزاعە، ئیبنو سەلوول یەکێك بوو لەسەرۆك هۆزەکانی هۆزی خەزرەج لەمەدینە، هۆزی خەزرەج ـ لەپێش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینە ـ بڕیاریان دابوو کە ئیبنو سەلوول بکەن بەپادشای خۆیان، بەلاَم پێغەمبەرو موسوڵمانان دەوڵەتی ئیسلامییان لەمەدینە

دامەزراندا، ئەم هەلەی لەدەست چوو لەبەرئەوە هەتا مرد، ئەو کۆنە ڕقەی لە پێغەمبەر بوو، مەشهورە بە سەرۆکی ناپاکەکان، کە لەزاراوەی سوونەتدا ناودارە بەسەرۆکی موناففقەکان. ئیبنو سەلول لەساڵی نۆی کۆچیدا مردووە.

١٧٦٨- عَنْ ابن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اجْتَمَعَ عِنْدَ الْبَيْتِ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ: قُرَشِيَّانِ وَثَقَفِيٌّ أَوْ ثَقَفِيَّانِ وَقُرَشِيٌّ، قليل فقهُ قُلُوبِهِمْ، كثير شَحْمُ بُطُونِهِمْ فَقَالَ أَحَدُهُمْ أَتَرَوْنَ أَنَّ اللَّهَ يَسْمَعُ مَا نَقُولُ؟ وقَالَ الآخَرُ يَسْمَعُ إِنْ جَهَرْنَا وَلاَ يَسْمَعُ إِنْ أَخْفَيْنَا وَقَالَ الآخَرُ: إِنْ كَانَ يَسْمَعُ إِذَا جَهَرْنَا فَإِنَّهُ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا . فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ( وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلاَ أَبْصَارُكُمْ وَلاَ جُلُودُكُمْ ) الآيَةَ . (الحديث ٦٩٦٠ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح الإمام مسلم بشرح النـووي = ٦٩٨٤ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح مسلم. بخاري. تفسير: ٤٨١٦، ٤٨١٧، ٧٥٢١. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٢٤٨ تحفة الأشراف: ٩٣٣٥).[١٧٦٨]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود کەناسراوە بە ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەلای بەیتا، دوو قوڕەیشیو یەك ئەقەفی، یا دوو ئەقەفیو یەك قوڕەیشی کۆدەبنەوە، بە لەش قەبەو قەڵەوو فیلەتەن، بەدڵو هۆشو گۆش کەودەنو نادان، یەکێکیان دەڵێ: ئایا ئێوە لەو باوەڕەدان، کە خودا گوێی لێیە کە ئێمە چی دەڵێین؟ یەکێکی تریان دەڵێ: ئەگەر بەدەنگی بەرز قسەبکەین دەیبیستێ، بەڵام ئەگەر بەپەنهانی قسەبکەین نایبیستێ! ئەوی تریشیان دەڵێ: ئەگەر بەدەنگی بەرز قسە بکەین گوێی لێ بێ، بەپەنهانیش قسەبکەین هەر گوێی لێ دەبێ! جا خودای گەورەو مەزن ئەمەی نارد:

---

[١٧٦٨] بخاری. تفسیر: ٤٨١٦. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٦٢ = ٦٩٦٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٤١).

{وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ } (سورة فصلت-٤١/٢٢).

١٧٦٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) خرج إِلَى أُحُدٍ ، فَرَجَعَ نَاسٌ مِمَّنْ خَرَجَ مَعَهُ ، فَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فيهِمْ فِرْقَتَيْنِ ، قال بعضهم: نقتلهم، وقال بعضهم: لا ، فَنَزَلَتْ ( فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ). (الحديث ٦٩٦٢ شيحا = ٦٩٨٦ فم. بخاري. فضائل المدينة. ١٨٨٤ ، ٤٠٥٠ ، ٤٥٨٩ ، فتح الباري).[١٧٦٩]

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەرو یارانی لەمەدینەوە دەرکەوتنو بەرەو چیای ئوحود کەوتنە ڕێ، بۆ غەزا، لەرێگە کۆمەڵێ لەوانەی کەلەسوپاکەی پێغەمبەردا بوون، بەسەرۆکایەتی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، گەڕانەوەو نەیانویست کەلەو غەزایەدا بەشداریی بکەن، کە گەڕانەوە هاوەڵەکانی حەزرەت بوون بەدوو تاقمەوە، تاقمێکیان گوتیان: کە گەڕاینەوە لەم غەزایە دەیانکوژین، تاقمەکەی تریشیان گوتیان: نایانکوژین. جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ} (النساء-٤/٨٨).

واتە: لەبەرچی لەبارەی ئەم ناپاكو مونافقانەوە بوون بە دوو دەستەوە: دەستەیەکتان دەڵێن: ئەوانە ناپاكو ناموسوڵمانن، لەبەرئەوە دەیانکوژین، دەستەیەکتان دەڵێن: ئەوانە موسوڵمانن، نایانکوژین، بۆچی هەمووتان بەیەك دەنگ ناڵێن: ئەمانە نا موسوڵمانن، چونکە ناپاكو مونافیقن.

---

[١٧٦٩] بخاری. فضائل المدینة: ١٨٨٤، پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٣١ - ٦٩٦٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٢٩ رقم الباب/١٠).

١٧٧٠- عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ رِجَالا مِنْ الْمُنَافِقِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ اذا خَرَجَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى الْغَزْوِ تَخَلَّفُوا عَنْهُ وَفَرِحُوا بِمَقْعَدِهِمْ خِلافَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاذا قَدِمَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اعْتَذرُوا الَيْهِ وَحَلَفُوا وَاحَبُّوا انْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَنَزَلَتْ ﴿لا تَحْسِبَنَّ الَّذينَ يَفْرَحُونَ بِمَا اتَوْا وَيُحِبُّونَ انْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا﴾.. الايَة (الحديث ٤٥٦٧): [١٧٧٠]

ئەبوسەعیدی خدری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لێ بێ) چەند پیاوێك هەبوون، ناپاك (منافق) بوون، كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەچوو بۆ غەزا، ئەوان بەفێڵ و فەرەج خۆیان دەدزیەوە ولەماڵەوە دەمانەوە، بە پێچەوانەی حەزرەتەوە(دروودی خودای لێ بێ) وە بۆ دژایەتی ئەو بەم هەڵوێستە ناپاكانەیان كەیفخۆش دەبوون، كاتێكیش كە پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) دەهاتەوە لە غەزا دەچوونە خزمەتی و بەهانەو مەهانەی درۆیان دەهێنایەوەو، سوێندیان لەسەر دەخواردو كەیفیان بەوە دەهات، كە بە بەلاش لەسەر شتێ كە نەیانكردووە سوپاس و تاریف بكرێن! ئیتر بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی كەپەردە لەسەر ئەم هەڵوێستە ناجەوان مەردانەیان هەڵدەداتەوە، كە دەفەرموێ: ﴿لا تَحْسَبَنَّ الَّذينَ يَفْرَحُونَ بِمَا اتَوا وَيُحِبُّونَ انْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَلا تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِنْ الْعَذابِ وَلَهُمْ عَذابٌ الِيمٌ﴾١٨٨/٣، واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ومتۆش ئەی موسڵمانی بەرێز! وا مەزانە ئەوانە كە وا دڵشادو شادومان دەبن بەكردەوەی ناشیرینی خۆیان و حەز دەكەن كە لەسەر

---

[١٧٧٠] تجريد/٤، ژمارە: ١٦٤٧ = ٤٥٦٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٢٧ = ٦٩٦٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٣).

**شتێکی باش، کەبەدرۆ دەڵێن : ئەوشتە باشەمان کردووە بەڵام لەڕاستیدا ئەو ئیشەیان نەکردووە، حەزدەکەن لەسەرئەو شتە باشە، بەهۆی ئەو درۆیانەیانەوە، بە بەلاش سوپاس ووەسف بکرێن، قەت وامەزانە کە ئەوانەو وێنەی ئەوانە، بەم ساختەکاریەو فرت وفێڵە، لەدەست تۆڵە و سزاو قاری خودای گەورە قوتار دەبن و، لە پەنایەکا ئاسوودە و سەرفەراز دەبن و ئۆقرە و ستار دەگرن، قەت شتی وانییە بەڵکو بۆ ئەوانەو بۆ وێنەی ئەوانە، هەیە سزای بەسوێ و ئازاری ئێش بەناو پەرەی دڵ گەیێن! (تاج/٦ ل/٩٥ - ش= شەیخان = بوخاری و موسلیم ).**

**١٧٧١- عن حُمَيْدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَنَّ مَرْوَانَ قَالَ: اذْهَبْ يَا رَافِعُ - لِبَوَّابِهِ - إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْ: لَئِنْ كَانَ كُلُّ امْرِئٍ مِنَّا فَرِحَ بِمَا أَتَى وَأَحَبَّ أَنْ يُحْمَدَ بِمَا لَمْ يَفْعَلْ مُعَذَّبًا لَنُعَذَّبَنَّ أَجْمَعُونَ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَا لَكُمْ وَلِهَذِهِ الآيَةِ؟ إِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي أَهْلِ الْكِتَابِ. ثُمَّ تَلاَ ابْنُ عَبَّاسٍ: (وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ) هَذِهِ الآيَةَ وَتَلاَ ابْنُ عَبَّاسٍ: (لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا) وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: سَأَلَهُمُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ شَيْءٍ فَكَتَمُوهُ إِيَّاهُ وَأَخْبَرُوهُ بِغَيْرِهِ فَخَرَجُوا قَدْ أَرَوْهُ أَنْ قَدْ أَخْبَرُوهُ بِمَا سَأَلَهُمْ عَنْهُ وَاسْتَحْمَدُوا بِذَلِكَ إِلَيْهِ وَفَرِحُوا بِمَا أَتَوْا مِنْ كِتْمَانِهِمْ إِيَّاهُ مَا سَأَلَهُمْ عَنْهُ. (الحديث ٦٩٦٥ شيحا = ٦٩٨٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ رقم: ١٦٤٨ شيحا = ٤٥٦٨ فتح الباري. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٠١٤. تحفة الأشراف: ٥٤١٤).[١٧٧١]**

**حەمیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ کە مەروانی کوڕی حەکەم سەرداری سەرشاری مەدینە بوو،**

---

**[١٧٧١] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٤٨ = ٤٥٦٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٢٨ = ٦٩٦٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٣).**

بەدەرکەوانەکەی خۆی، کەناوی رافیع بوو، گوت: ئەی رافیع! ئادەی بڕۆ بۆلای ئیبنو عەبباس، پێی بڵێ: خۆ ئەگەر هەموو کەسێ سزاو ئازار بدرێت لەسەر ئەوە کەشادمان بێ بەوەی کەدەستی دەکەوێو حەز بکات کەبەخۆڕایی سوپاس بکرێ لەسەر شتێ کەخۆی نەیکردبێ خۆئەگەر ئەمە وابێ، ئەوا کەسمان لەقیامەت دا رزگارمان نابێو، هەمووومان سەرجەم سزاو ئازار دەدرێین، چونکە کێ هەیە مەگەر بەدەگمەن، کەماڵو مناڵو ئایەو مایەو پایەو وەسپی راستو درۆی پێ خۆش نەبێ؟

جاکاتێ کەرافیع ئەم پەیامەی مەڕوانی بەئیبنو عەباس راگەیاند، ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) لەوەڵام دا فەرمووی: ئێوە چیتانە بەسەر ئەم باسەوە؟ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەشانی خاوەن نامەکان دا، جارێك پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) جوولەکەکانی بانگ کردو پرسیاری شتێکی لێیانکرد، ئەوان شتەکەیان شاردەوەو حەشاری وەڵامە ڕاستەکەیان داو، بەپێچەوانەی ئەوەوە شتێکی تریان پێ گوت، ئەنجا وایان نیشانی حەزرەت دەدا، کە وەڵامی پرسیارەکەی ئەویان بەڕاستی داوەتەوەو کەوابێ دەبێ حەزرەت (درووودی خوای لەسەربێ) سوپاسو ستایشیان بکات، وەشادمانو دڵشادبوون بەوەی کەڕاستیەکەیان شاردبۆوەو کەتمی حەقیقەتەکەیان کردووە، ئەوجا ئیبنو عەباس ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە، ئایەتی:

{وَإِذَ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ} (سورة آل عمران-٣/١٨٧)

واتە: ئەوسا خودا پەیمانو بەڵێنی لەوکەسانە وەرگرت کەخاوەن نامەی ئاسمانین، کەبەمەردومی ڕابگەیەنن و حەشاری نەدەن، پەیمانی لەزاناکانیان وەرگرت کە بەباشی مەبەستو مانای ئەونامەی خودایە رووناك بکەنەوە بۆ

هـەموو کەسـێ وەلەکەسـی نەشـارنەوە. وە ئیبنـو عـەباس ئـەم ئایەتەیـشی خوێندەوە:

{لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ} (سورة آل عمران-٣/١٨٨). (تاج/٤ ز/٤ ژ/٣٧٩١ – سوورەتی ئالی عیمران – ژمارە/٢١٢٧).

١٧٧٢- عَنْ انَسٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ كَانَ رَجُلٌ نَصْرَانِيًّا فَاسْلَمَ وَقَرَا الْبَقَرَةَ وَالَ عِمْرَانَ فَكَانَ يَكْتُبُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَعَادَ نَصْرَانِيًّا فَكَانَ يَقُولُ مَا يَدْرِي مُحَمَّدٌ الا مَا كَتَبْتُ لَهُ فَامَاتَهُ اللَّهُ فَدَفَنُوهُ فَاصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الارْض فَقَالُوا: هَذا فِعْلُ مُحَمَّدٍ وَاصْحَابِهِ لَمَّا هَرَبَ مِنْهُمْ نَبَشُوا عَنْ صَاحِبِنَا فَالْقَوْهُ فَحَفَرُوا لَهُ فَاعْمَقُوا فَاصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الارْض فَقَالُوا: هَذا فِعْلُ مُحَمَّدٍ وَاصْحَابِهِ نَبَشُوا عَنْ صَاحِبِنَا لَمَّا هَرَبَ مِنْهُمْ فَالْقَوْهُ فَحَفَرُوا لَهُ وَاعْمَقُوا لَهُ فِي الارْض مَا اسْتَطَاعُوا فَاصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الارْض فَعَلِمُوا انَّهُ لَيْسَ مِنْ النَّاسِ فَالْقَوْهُ. (الحديث: ٣٦١٧): [١٧٧٢]

ئەنـەس (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێکی نەصـرانی هـەبوو، موسوڵمان بوو، سوورەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمرانی خوێند، جارو بـار کـە ئایەتێ دەهات بۆ پێغەمبەر ئەو دەینووسی، لە پاشا بووەوە بە گـاور، وە دەیـوت: موحەممـەد بێجگـە لـەوەی کـەمن بـۆم نووسـیوە هیـچی تـر نـازانێ، جـا خـودا مرانـدی‌و کۆمەڵەکـەی ناشـتیان، وە بـۆ سـبەینێ کـە تەماشـا دەکـەن وازەوی لاشەکەی تووڕ داوەتە دەرەوە. وتیـان: ئەمـە ئیـشی موحەممـەدو هاوڕێکانیـەتی، لەبـەر ئـەوەی رایکـردووە لـە دەسـتیان و لـە ئاینەکـەیان پەشیمان بۆتـەوە، ئـەم هاوڕێیەی ئێمەیان بۆ سووکایەتی پێکردن واڵێ کردووە، دیسان گۆڕێکی قوڵتریان

[١٧٧٢] تجریـد/٤، ژمـارە: ١٤٤١ = ٣٦١٧ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٥، ژمـارە: ١٩٤٥ = ٦٩٧١ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/٢٥).

بۆیهەڵکەنـدو ناشـتیانەوە، بـەڵام بـۆ سـبەینێ دیـسانەوە زەوی تـووڕی دابـووە دەرەوە، دیـسانەوە، بـەڵام بـۆ سـبەینێ دیـسانەوە زەوی تـووڕی دابـووە دەرەوە، دیسان وایان گوتەوەو هەتا توانیان گۆڕێکی قوڵ قووڵیان بۆ هەڵکەندەوە، کەچی بـۆ سبەینێ هەمدیسان زەوی لاشەکەی تـووڕ دابـووە دەرەوە. ئـیتر زانییـان کـە ئەمەئیشی خوایەو لـە مەردومـەوە نییـە، لـە بـەر ئـەوە ئـەوانیش تووڕیـان داو خوداکردی بە پەندو، کردی بە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەسەر ڕاستی ئـایینی موحەممەدو، هەرکەسێ پشتی تێ بکا خودا پێی دەنوێنێ(١).

ئەمـەیش گێڕانەوەیـەکی تـری ئـەم فەرموودەیـە، لـە ژمـارە: (١٩٤٥)ی پوختەی موسلیمدا:

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ مِنَّا رَجُلٌ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ قَدْ قَرَأَ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ، وَكَانَ يَكْتُبُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَانْطَلَقَ هَارِبًا حَتَّى لَحِقَ بِأَهْلِ الْكِتَابِ، قَالَ: فَرَفَعُوهُ، قَالُوا: هَذَا قَدْ كَانَ يَكْتُبُ لِمُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأُعْجِبُوا بِهِ، فَمَا لَبِثَ أَنْ قَصَمَ اللَّهُ عُنُقَهُ فِيهِمْ، فَحَفَرُوا لَهُ فَوَارَوْهُ، فَأَصْبَحَتِ الأَرْضُ قَدْ نَبَذَتْهُ عَلَى وَجْهِهَا، ثُمَّ عَادُوا فَحَفَرُوا لَهُ فَوَارَوْهُ فَأَصْبَحَتِ الأَرْضُ قَدْ نَبَذَتْهُ عَلَى وَجْهِهَا، {ثُمَّ عَادُوا فَحَفَرُوا لَهُ فَوَارَوْهُ فَأَصْبَحَتِ الأَرْضُ قَدْ نَبَذَتْهُ عَلَى وَجْهِهَا} فَتَرَكُوهُ مَنْبُوذًا. {الحديث: ٦٩٧١ = ٦٩٩٥ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هەبوو، لەهۆزی بەنی نەجاری ئێمەبوو، موسوڵمان بوو، دەستی کرد بە خوێندنی قورئان، سوورەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمرانی خوێند، گەلێ جار شتی دەنووسی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژێ هەڵهاتو ڕۆیشت بۆناو خاوەن نامەکان، فەرمووی: جا ئەوانیش کابرایان قۆستەوەو بەرزیان کردەوە. گوتیان: ئەم پیاوە لەلای موسوڵمانان پایەی بەرز بوو، گەیشتبووە

پایەی نووسەرانی موحەممەد، نامەو قورئانو شتی بۆ دەنووسی، ئیتر تەواو تەواو موعجەب بوون پێی، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو کەخودا پێی نواندو لەناویانا خودا ئەستۆی وردکرد، ئەوانیش چاڵێکیان بۆی هەڵکەندو شاردیانەوە، بەڵام زەوی نەیگرتە خۆیو فڕەی دایە سەرپشتی خۆی، تا سێجار گۆڕیان بۆیهەڵدەکەندو زەوی نەیدەگرتە خۆیو فڕەی دەدایە دەرەوە، ئیتر ئەوانیش وازیان لەلاشەکەی هێناو لەو دەشتە تووڕیاندا).

**ڕوونکردنەوە:**

**منافقە نوێکان:**

جێگەی داخە، لەم ڕۆژگارەدا، لەهەموو لایەکەوە، جیهانی ئیسلام کەوتۆتە بەر هەڵمەتو هەوێڵی سوپای کوفرو ناپاکانو دوو ڕووان، وەکی تریش کۆمەڵە دەغەز لەدڵو بەناو موسوڵمانەکان، بەدرۆو بۆ چاوبەستو چەواشەکاری، خۆشەویستیو حوببی ئەهلو بەیتیان کردووە بەدەمامكو ڕوو پۆشو، وەك دێوجامە، لەپەنا ئەم بیانووە درۆینەداو، بەناوی خۆشەویستیو لەسەر کردنەوەی کەسوکاری پێغەمبەرەوە، هێرشی بێشەرمانە دەبەنە سەر حەرەمەکانی پێغەمبەرو سەرجەمی هاوەڵەکانیو حەیاو ناموسی خودی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) زەدەدارو لەکەدار دەکەنو تۆمەتی داوێنپیسیو بێئابڕوویی دەدەن لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)و جمێنو لەعنەت بەئاشکرا دەدەنو دەکەن لە جێنشینە بەڕێزەکانی پێغەمبەرو دەیکەن بە شریتو نەوارو سیدیو بەهەموو وڵاتدا بڵاوی دەکەنەوە. بەبەرچاومانەوە لەبەغدا لە ئەعظەمیە لەپەنا گۆڕی ئەبو

حەنیفەدا، بەرۆژی نیوەڕۆ، خۆپیشاندانێکی گەورەیان ئەنجامداو نەفرەتو لەعنەتیان لەئیمامی عومەر دەکرد!

ئەمانەمان بەچاوی خۆمان دی، کە ئاخونی شێوە مالووم لەسەر کەناڵە ئاسمانیەکان، بەوپەڕی بێ شەرمیو دەغەز لەدڵییەوە، جمێن بەدایکی موسوڵمانان عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرو بە ئەبوبەکرو بە عومەرو حەفصەو بە ئوم حەبیبەو بە سەرجەمی سەحابەکانی پێغەمبەر دەدەنو هێرش دەبەنە سەر رەمزو هێماکانی تری ئیسلام، تەنانەت قورئانی پیرۆزیش لەشەڕی ئەم ئاخونانە رزگاری نەبووە، بەڕاستی ئەمانە، بەشەیتانانە:

١- ئالوبەیتیان کردووە بە مەقاشو بە ماشە بۆ تانەو تەشەر لەهاوەڵانو بە پاچو بێڵ، بۆ رووخاندنی ئایینی محمدو ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان لە رەگو ریشە پێ دەردەهێنن‌و بوون بە کوتەکی دەستی دوژمن، لە جوولەکەو لە گاور، تەنانەت گاورو جوولەکەکانیش لەکاتی هێرشدا بۆسەر ئیسلام، هەمان تانەو تەشەری ئەم ئاخونانە بەکاردەهێنن‌و بەبێ زیادو کەم دووبارە دەکەنەوە.

٢- ئێمە بەڕاستی موسوڵمانین‌و تەنیا لەبەرئەوە نوورو رووناکی ئیسلاممان قەبوولکردووە، کەببێت بەچرای رۆشنی دین‌و دونیامان‌و هیچی تر، وە خودا حەزکا هەر وایش دەبێ، لەم خاڵەوە باوەڕمان بەهەمووفەرموودەو فەرمایشتەکانی خوداو پێغەمبەری خودا هەیەو لەسەر فەرمایشت‌و فەرموودەی ئەوان، خێزان‌و کەسوکارو ئەهلوبەیتی پێغەمبەرمان خۆش دەوێ‌و، عەلی‌و فاطیمەو حەسەن‌و حوسەین‌و نەوەو وەچەی پیرۆزی ئەوانمان لەنووری چاوی خۆمان خۆشتر دەوێ‌و ئومێدی گەورەی دین‌و دنیامان، لەپاش خوداو پێغەمبەرو قورئانی پیرۆز، حوبو خۆشەویستی ئەوانە! وە رۆژی چەندین جار لەناو نوێژو غەیری نوێژدا دروودو سڵاویان بۆ دەنێرین.

بەڵام لەبەر ڕووناکی ئەم شیعرە عەرزتان دەکەم:

پرسیاری کورت، وەڵامی ورد ورد
زاخاوی مێشکبن، بۆ خوێنەری کورد:

دەبێ بۆچی یەکێکی وەکوو ئەقرەعی کوڕی حابیس، کە خۆی و دەکوڕی، لەشەڕی یەرمووکدا، لەسەردەمی عومەری کوڕی خەطابدا، لە وڵاتی شام، لەپێناوی بەرگری لە نووری ئیسلام جەنگیونو هەوڵیان داوە بۆ فەتحی شامو لە نەبەردێکی خوێناویدا لەگەڵ سوپای ڕوومدا، شەهید بووبن، دەبێ بۆچی ئەمانە مورتەددو مەلعوون بن، چونکە عومەریان بە خەلیفەی خۆیان زانیوە، بەڵام ئیمامی حوسەین، کە لەشەڕی برا کوژیدا کوژراوە وەبەهۆی ئەوەوە خەڵکێکی زۆر لە موسوڵمانان، بە بەلاش و لە پێناوی هیچدا کوژراون دەبێ بۆ حوسەین شەهیدبێ و خوێنەکەی ببێ بەخوێنی سیاوەیش و تا ڕۆژی قیامەت نەکوژێتەوەو ڕۆژانە، لێرەو لەوێ، لەسەر ئەو موسوڵمانان یەکتری بکوژنو کەسانێ بازرگانی بەخوێنەکەیەوە بکەنو وەك بایەقوژ هەر بڵێن: ئادەی تۆڵەی حوسەین بسێنن! یا لثاراتِ الحسین!! دەبێ بۆچی ئەم هەموو سەحابەو تابیعینو موسوڵمانانەی کە لەسەردەمی ئەبوبەکری صەدیقەوە، هەتا کۆتایی خەلافەی ئیسلامی، کە ئەم هەمکە فتوحاتانەیان کردووەو نووری ئیسلامیان بەجیهانا پەخشەوە کردووە، هەموو مورتەددو پاشگەزو منافقو دوو ڕووبن، چونکە لەعنەتو نەفرەتیان لە ئەبوبەکرو عومەرو عائیشەو حەفصەو ئوم حەبیبەو موعاوییە نەکردووە!

ئەمانە کە دوورگەی عەرەبو شامو میصرو سێ بەشی ئەفریقاو عێراقو ئێرانو هیندو سیندو نیوەی ئاسیاو بەشێ لە ئەورووپایان بەنووری قورئانو بە نووری ئیسلام درەخشانکردو کردیانن بە ئیسلامو هەتا ئێستایش بەهۆی



کۆششی ئەوانـەوە لـە سەراسـەری جیهانـدا، زیـاتر لـە ملیـارو نیـویَ موسـوڵمانو زیاتر لە پەنجاو چوار دەوڵەتی ئیسلام هەیە، ئەمانە هەموو مورتەددو پاشگەزو جەهەننەمی بن، بەڵام عەلیو منالّی عەلیو ئەوانەی کە عـەلیو منـالّی عـەلییان کردووە بە بیانوو، کە یەك سانتیمیان نەخستۆتە سەر خاکی ئیسلامو یەك شەهیدی بەرەی شەڕی کوفریـان نییـەو هـەر خـەریکی شـەڕی بـرا کـوژی بـن، ئەمانە هەموو شەهیدبنو بەهەشتی بن؟!

بۆچـی ئەمـە هەرقەلییەتـە، یـا عەدالـەتو نوبووەتـە؟ بەڕاسـتی ئەمـە مـەنطیقێکـی لارو خـوارەو پیلانێکـی شـەیتانانەی ئاشـکراو دیـارە، نـەخوا، نـە پێغەمبـەر، نـە عـەلی پێـی رازییـە! بەڕاسـتی هەرکەسیَ بەچاوی ژیـری، بـەپێی هۆشی ساخ، مەزهـەبی شیعە سـەرنج بـدا، زۆر بەباشـی هەسـت دەکـا، کـە شـیعە دینێکـی دەسـتکردە، لەسـەر ئـەم سیَ پایەیـە دامـەزراوە: درۆو دەلەسـەی شـاخو باڵدارو جنسو خومس.

بـۆ بـەراورد لەگـەڵ ئـەم بەچـکە شـەیتانانەی کـە تانـەو تەشـەر لـە حەرەمەکانو لە مامەکانو لە خەزوورەکانو لە سـەحابەکانو لـە جێنـشینەکانی پێغەمبـەر دەدەنو قورئانەکـەی بەدەسـکاریکراو دەزانـنو سـوننەتە راسـتو دروسـتەکەی بـەدرۆی ئـەبو هـورەیرەو عائیـشە دادەنـێن، ئـەم نموونەیـە تۆمـار دەکەین:

سەیگوڵیَ هەبوو زۆر بەدین بوو، لەسەیدەکانی خاویو قانزانقایە بوو، لـە گەڕەکی چوارباخ دادەنیشت لە سلێمانی، بـەزۆری لـە مزگـەوتی قـەرە چـێوار لـە گەڕەکی چوارباخ نوێژی دەکرد، هەرچی لەگەنم پەیدا دەبیَ نەیدەخوارد، گوایـە بـاوە حـەواو دایـە حـەوا لەسـەر خـواردنی گـەنم لـە بەهەشـت دەرکـراون، ئـەم سەیگوڵە (رەحمەتی خودای لیَ بیَ) رەفتارێکی زۆر سەیری هەبوو، هەر مەلایەك

لەبەر نوێژیدا، سوورەتی (تَبَّتْ يَدَا)ی بخوێندایە، یەکسەر نوێژەکەی دەبڕیو دەچوو لەولاوە نوێژەکەی خۆی دەکرد، ئیتر قەت جەماعەتی لەپشتی ئەو مەلایەوە نەدەکرد، دەیگوت: مەلا! چۆن شەرم لەخواو لە پێغەمبەری خوا ناکەی، دەچی لەناو خەڵکی عەوامدا، خراپیی ئەبو لەهەب باس دەکەیت، کە مامەی پێغەمبەرە، نازانی هەر قسەیێ شوێنی خۆی هەیە؟

جا برا سوێندم بە خودای گەورە، ئەم سەیگوڵە، گەلێ گەلێ لەم هەمکە ئاخونەی کە لەسەر جوێندان بە نامووسی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوورنو بەردەوام ئاگری شەڕی براکوژی لەناو موسوڵمانانا، بەناوی لەسەرکردنەوەی عەلیو فاطیمەو حەسەنو حوسەینو ئەهلوبەیتەوە، بەردەوام بەم بیانووە درۆیەوە، ئاگری شەڕی براکوژی هەڵ دەگیرسێننو خۆش دەکەن!

من ئەم پرسیارە لە هەموو خاوەن ویژدانێ، خاوەن هۆشو گۆشێ، بەبێ لایەنانە دەکەم: دەبێ بۆچی، ئەم مەراجیعانە کە خۆیان بە نوێنەری راستەقینەی ئەهلو بەیت دەزاننو بەس، داخ لەدڵانەو کوێرانە، بەهەموو هۆکارێکی راگەیاندن، شەوو رۆژ خەڵك هاندەدەن لەسەر دژایەتیو کافرکردنی لەسەددا نەوەدو پێنجی گەلی موحەممەد، بەتایبەتی هی خزمە نزیکەکانیو هاوسەرەکانیو هۆزەکەی کە هۆزی قورەیشە، گوایە ئەمانە پشتی عەلییان بەرداوەو پشتی دوژمنانی ئەویان گرتووە! کە ئەبوبەکرو عومەرو عوثمانو عائیشەو حەفصەن....تاد.

ئەو هەموو فیداکاریو قوربانیو تێکۆشانو خەباتگێڕانو شەهیدانەی، کە کۆی سەرجەمیان بە درێژایی مێژوو لە نزیکەی یەك ملیار تێ دەپەڕێ، ئەم هەموو خۆبەختکردنو خەباتگێڕانو شەهید بوونە، گشتی هیچو پووچەو جێگەیان ناو ئاگری سووری دۆزەخە، گوایە ئەمانە تەبەڕڕایان لە ئەبوبەکرو

عومەر نەکردووە، بەڵکوو لایەنگیرانی ئەوانن، کە منالێکیان بەناوی موحسینەوە لەباری فاطیمە بردووە!! یەککو لەم حەلامەتەی؟

جا باشە توخوا، گریمان ئەم بوختانە راستیش بێ‌و درۆی پەتی ناپاکان‌و دوو رووان‌و ناحەزانی ئیسلامیش نەبێ، ئەم هەموو بەچکە شێرو پاڵەوان‌و فیداکارانەی، کە لەماوەی نزیکەی (١٥٠٠) هەزارو پێنج سەد ساڵدا، جەنگیون‌و دەستیان بە قورگی شێردا کردووەو ئاڵای ئیسلامیان شەکاندۆتەوەو زیاتر لە ملیارێ شەهیدیان، لەم ماوەدا، لەم پێناوەدا داوە، ئەم دەریایە لە خوێن‌و فرمێسك، ئەم هەموو زامارو شەهیدو کەم ئەندام‌و قوڕ بەسەرو جەرگ سووتاوانە، بەهەموویان ئەم سکە لەبارچووە درۆینەی فاطیمەیان تیادا نابێ؟! باشە ئەوا گریمان ئەبوبەکرو عومەریش تاوانبار بوون، ئەم خەڵکەی تر بۆ؟ بۆچی ئەو خەڵکە شەهیدو خەباتگێڕانە، هەموو ئاو لەزامیان دێ، بەس منالی عەلی خوێن لەزامیان دێ!

خودا شایەتە عەلی‌و فاطیمە خۆشیان بەمە رازی نابن، بەڵام چی دەڵێی بەکەسانێ، بە فێڵ‌و بەدرۆو بەساختە ئالوبەیتیان کردووە، بە کوتەك‌و بە ئامراز بۆ رووخانی ئایینی موحەممەد.

من بۆخودا ئەم شایەتییە دەدەم، زیاتر لە (٣٠) سیی ساڵ لەناو جەعفەریدا، خۆم‌و ماڵ‌و منالم ژیاوم، دراوسێ‌و هاوەڵ‌و برادەرم بوون، هیچ هەستمان بەوە نەکردووە، کە ئێمە دوو لایەنی جیاین، مەبەستم ئەمەیە: ئەم تۆوی دوژمنایەتی بلاوکردنەوەیە، بەس لەژێر سەری مێزەر بەسەرەکاندا هەیەو بەس، جەماوەرەکە لە شیعەو لە سوننە وەك برا پێکەوە دەژین، ئەگەر دەستتێوەردانی ئەوان نەبێ!

بەم بۆنەیەوە ئەم راستیە دەدرکێنم‌و تۆمار دەکەم: کە حیزبی بەعثی درندە، لە سوپادا، بە کوردو شیعەو شیوعییان دەتگوت: (الثُّلاَثيُّ الخبيث) - (سێلانەی چەپەڵ!).

وەکی تریش کە بارودۆخەکە، لەهەموو گۆشەکانیەوە دەهێنمە بەرچاو، هەق دەزانم کە ئەمانە وا خۆشی دنیا فووتی داون‌و وەك مەسیح دەفەرموێ: وا کەیفیان بەوەدێ کە لەلای سەرووووەوە دانیشن‌و پێیان بگوترێ ئایەتوڵلا و شتی واو وابوون بەداوی شەیتانەوە (يَعْلَمُونَ ظَاهِراً مِنَ الحَيَاةِ الدُّنْيَا). وا لەشەقامە رێگەی ئیسلام تەرابوون‌و دوور کەوتوونەتەوە، بەمنی هەژار وریا ناکرێنەوە، بەڵام وەك قورئان بەدەق دەفەرموێ:

{وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا اللّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُواْ مَعْذِرَةً إِلَى رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ – الأعراف – ١٦٤/٧}.

لەکۆتادا بەکوڵی دڵ لەخودا داوا دەکەم کەبرا سوننییەکان‌و برا جەعفەرییەکان، وەك برا لەگەڵ یەکتری بژین‌و خودا لەشەڕی ئاژاوە گێڕان‌و ئەوانەی کە بازرگانی بەخوێنی هەردوولاوە دەکەن: بیانپارێزێ‌و برایەتی‌و تەبایی‌و هاوسەنگەریی، لەناو سەرجەمی موسوڵمانان‌دا، دژی دوژمنی ئیسلام، بەردەوام بێ. ئامین.

عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: قَاعَدْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) خَمْسَ سِنِينَ، فَسَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ كُلَّمَا هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ، وَإِنَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي، وَسَتَكُونُ خُلَفَاءُ فَتَكْثُرُ»، قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: « فُوا بِبَيْعَةِ الأَوَّلِ فَالأَوَّلِ، وَأَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ، فَإِنَّ اللَّهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ». {الحديث: ٤٧٥٠ = ٤٧٣٦ فم. تجريد/٤/٦٢، رقم: ١٣٧٧ = ٣٤٥٥}:

ئەبو حازم (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پێنج ساڵ ئامادەی کۆڕی زانستی ئەبو هورەیرە بووم، لێیم بیست دەیفەرموو: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جاران نەوەی ئیسرائیل – واتە: گەلی جوولەکە، کە لەزمانو زاراوی قورئانو سوننەتدا ناودارن بە بەنی ئیسرائیل – پێغەمبەران دەیانبردن بەڕێوەو سەرپەرشتی کاروباریان دەکردن، هەرکاتێ پێغەمبەرێ فەوتی دەکرد، گورج پێغەمبەرێکی تر لەجێگەی ئەو دادەنیشتو وڵاتی دەبرد بەڕێوە، بەڵام ئاشکرایە کە لەپاش من پێغەمبەری تر نابێ، بەڵام جێنشین دەبن، زۆریش دەبن نەوەك کەم، هاوەڵان فەرموویان: قوربان! جا فەرمانت بەچییە پێمان، وە ئەرکی سەرشانی ئێمە چییە بەرابەریان؟ فەرمووی: (بەرودوا، یەك لەدوایەك پەیمانیان بدەنێ لەسەر ئەوە کە فەرمانیان نەشکێنن‌و بەگوێیان بکەن لەکاری خێرا، با هیچ کاتێ بێ پێشەواو بێ سەرۆك نەبن، تانەبێ بە پادشا گەردانی، بەڵام لەهەر سەردەمێکا، کێ لەپێش پێشەوە پەیمانتان داپێی، ئیتر ئەوە جێنشینی راستەقینەیەو پەیمانی ئەوە ببەنە سەر، هەتا بەپێی شەرعی خودا، یەکێکی تر لەجێگەی ئەو دەبێ بەجێنشین، ئەوسا پەیمانی ئەو جێبەجێ بکەن‌و بیبەنە سەر، ئیتر هەروەها، وە هەموو کاتێ پەیمانەکەیان ببەنە سەرو مافی خۆیانیان پێ بدەن‌و بەناڕەوا بەترە بیانوویێ لە فەرمانیان دەرمەچن!

بێگومان کە ئەوانیش لەلای خوداوەندی مەزن بەرپرسیارن، دەرهەق بەو خەڵکەی کە خودا ئەوانی کردووە بەکاربەدەستو بەرپرسو چاودێریان!).

{ریاض/٢، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٦٥٦}.

**روونكردنەوەیەكی گرنگ:**

**مەبەست لەم فەرموودەیە دوو خاڵی سەرەكییە:**

**یەكەم:** لەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) دەرگای وەحیو تەشریعو یاسادانان دادەخرێو، بیعثەتو پێغەمبەرایەتی دێتە كۆتاییو، سرووشو وەحیو پەیامی ئاسمانی تر، لەدوا مەرگی پێغەمبەر نابێو، ئایینی پیرۆزی ئیسلام، لەهەموو رویەكەوە تەواوو دامەزراو دەبێو پێویستی بە لێ كەمكردنو لێ زیادكردن نییەو هەركەسێ لافی شتی وا لێ بداو داوایەكی لەم چەشنەی هەبێ، بەهەر ناوێكەوە بێ، ئەوە درۆی پەتییەو ئەو داوایەی لێ قەبووڵ ناكرێ، داوای بوون بە پێغەمبەرو فروستادەو ئیمامی مەعصوومو وەصی پێغەمبەرو مەهدی مونتەظەرو ئیمامی موسەردەبو كەسێ رۆڵی پێغەمبەر ببینێ بەهەر ناوێكەوە، داوای واو شتی وا لەدوای مەرگی پێغەمبەر، هەمووی درۆیەو نابێ باوەڕی پێ بكرێ، هەركەسێ لافی شتێكی ئاوا لێبدا، ئەوە درۆزنەو نابێ باوەڕی پێ بكرێ، قسەو داوای وا پووچو بێ بایەخەو بە پێچەوانەی قورئانە كە دەفەرموێ:

{إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ – الحجر – ١٥/٩} وە دەفەرموێ: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا – المائدة – ٥/٣} وە دەفەرموێ: {مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ - الأحزاب – ٤٠/٣٣}.

واتەیەكی كورت بۆ ئەم ئایەتانەو كۆمەڵێ فەرموودەی تری پێغەمبەر، لەم بابەتە ئەمەیە: (موحەممەد ئاخر پێغەمبەرە، ئیسلام ئاخر دینو ئایینە، قورئان ئاخر نامەی ئاسمانییە، ئایینی ئیسلام لەهەموو روویەكەوە تەواوە، خودا خۆی دەیپارێزێ لە فەوتانو دەستكاریو گۆڕانكاری!). {بڕوانە: تاج/١،

لاپەڕە: ٢٦، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٠، ج/٤ + تاج/٤٢٣/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٠٤٥ چاپی چوارەم}.

هەروەك چۆن قسەی وا بێ سەروبەرەو داوای وا بێ بەڵگەیەو پێچەوانەی قورئـانو سـوننەتی صـەحیحی پێغەمبـەرەو پێـچەوانەو دژی بـیرو بـاوەڕی دامەزراوی چینی یەکەمی موسوڵمانانیشە، کە زۆرینەیان لە مەککەو لەمەدینـە لـە خزمـەتی پێغەمبـەردا بـوونو دەمـاودەم بـەگوێی خۆیـان، ئایـەت بەئایـەتو بابەت بە بابەت، ئەم ئایینە پیرۆزەیان لەدەمی پێغەمبەر خۆی وەرگرتووەو زۆر بەباشی لێی حاڵی بوونو لـە عیـشقی ئـەو دینـە کۆچو باریـان کـردووەو ئـازارو ئەشکەنجەو دەربەدەری زۆریان چەشـتووەو بـە رۆحو بـە سـەروماڵو منـاڵو بـە کۆششێکی بێ وچانو بەو پەڕی دڵسۆزیو لەخۆبووردنو قوربانی دانەوە، خەوو خۆراکیـان لـەخۆیان هەراسـان کـردووە، هـەتا ئـەم ئایینـە پیرۆزەیـان پەخـشەوە کـردووە، لـەپێناوی ئـەوەدا لێیـان کـوژراوە، کوڕیـان کـوژراوە، ماڵیـان تـاڵانکراوە، دەربەدەر بوون، ئەم چینی یەکەمی ئیسلامە کـە برێتـی بـوون لـە موهـاجیرینو ئەنصارو ئەصحابی بەیعەتولریضوانو عەشـەرەی موبەشـشەرەو هـەموو خـەڵکی مەککـــەو مەدینـــەو دەوروبـــەریانو هـــەموو صـــەحابەکانی پێغەمبـــەرو کەسـوکارەکەیو هاوسـەرەکانیو هـۆزی قـوڕەیشو زۆرینـەی پیـاو مـاقوڵانی دوورگەی عەرەبو بەشداربووانی غـەزای بـەدرو ئوحـودو حونـەینو خەنـدەقو غەزەواتەکانی تـری پێغەمبـەر، ئـەم چینـی یەکـەمی موسـوڵمانانە، لەسـەردەمی پێغەمبەرو لەدوای سەردەمی پێغەمبەر، ئەوانەیان کە شەهید بوون لەسەر ئـەم بیرو باوەڕە شەهید بوون ئەوەیشی کە شەهید نەبووە، هەتا مردووە لەسەر ئـەم بیروباوەڕە مردووەو ئاگای لەم هەموو زاراوە تازانە نەبووە، کە هەندێ لایەن بـۆ دینی موحەممەدیان زیادکردووە!!

ئەم چینی یەکەمە زۆر بەباشی لە ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر تێ گەیشتوون، وە هەموو دەقەکان لەناو دڵیانا چەسپ بووەو جێگەی خۆیان کردۆتەوە، وەك (لاَ نَبِيَّ بَعْدِي) و (وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِينَ)، هەر لەم خاڵی گورِ بەستنەوە بووە، کە جەنگیان لەگەڵ موسەیلەی کەذابو موختاری ئەقەفیو ئەسوەدی عەنسی یەمەنیو سەجاحەوە کرد، کە ئەمانە لافی پێغەمبەرایەتیو شتی وایان لێ دەدا، یەکسەر لەپاش مەرگی پێغەمبەر، بێگومان کە لەناو ئەم چینەدا، کە برێتی بوون لەپێشینانی باشی ئەم گەلی ئیسلامە، کە زاناو داناو شاعیرو مێژوو نووسو موحەددیثو موفەسسیرو ئەدیبو خواناسی گەورە گەورەیان تیابوو، شتی وا نەگوتراوەو نەبیستراوە: (کە گوایە لەپاش مەرگی موحەممەد، پێغەمبەری تر هەبێ، یا ئیمامی مەعصووم هەبێ، یا مەهدی مونتەظەر هەبێ، یا کەموکورتی لە ئایینی ئیسلامدا هەبێ، یا تەواوکەری ئیسلام هەبێ، یا هەرکەسێ باوەڕی بە وەسێتیی عەلیو ئیمامی موسەردەب نەبێ، باوەڕی بە موحەممەدیش نییە، بێگومان ئەگەر شتی وا ببوایە، نەدەشارایەوە، لە قورئانا باسی دەبوو، لە سوننەتی موتەواتەردا دەیانگێڕایەوە، هەر هیچ نەبێ سەحابە گەورەکانو ئیمامی عەلیو ئیمامی حەسەنو ئەهلوبەیتەکەی پێغەمبەرو مامەکانیو ئامۆزاکانی دەیانگێڕایەوە! کە ئەمانە لەسەردەمی خۆیانا، خۆیان لەتێکڕای موسوڵمانان جیانەکردۆتەوە، هەمیشە لەهەموو بۆنە ئایینیو کۆمەڵایەتییەکاندا بەشدارییان کردووە، وەك یەکێ لەتێکڕای موسوڵمانا!!).

بەڵام لەپاش رزگارکردنی وڵاتی فارس لەلایەن ئیمامی عومەرەوەو لەپاش گورز وەشاندنی سەخت لە جوولەکەو لە ئایینەکانی تر، لە ناوچەکەدا، بەتایبەتی لەپاش رووداني کۆمەڵێ رووداوی ناهەمواری ناپەسەندو کۆمەڵێ

کارەساتی دڵتەزێن، کە سێ کەس لە جێنشینە فرە باشەکانی پێغەمبەریان تیادا شەهیدبوو، بەتایبەتی تر لەپاش دوورکەوتنەوەی زۆر لە دەستەڵاتدارانی عەرەب لەگیانی ئیسلام و خۆ سەپاندنی عەرەبان بەسەر وڵاتداو پەراوێزکردنی نا عەرەبان لە حوکمی وڵاتی خۆیان و لەپاش سەرهەڵدان و پەیدابوونی مولکی عەضوض، وەك پێغەمبەر (درووددی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ثُمَّ يَكُونُ مُلْكٌ عَضُوضٌ) لەپاش پەیدابوونی بارودۆخێکی پڕ لە خۆمانە خۆمانە، لەبەینی فەرمانڕەواکان و گەلە موسوڵمانەکانا، وەك ئەم بارودۆخەی عێراق، کە هەمیشە کوردان پەراوێز کراون و هەر رۆژەی بەناوێکەوە زوڵم و زۆریان لێ دەکرێ، تەنانەت کار گەیشتووە بەوە، لە یەکەم دەرفەتی رەخساوا، لەناو بەناو رۆشنبیرەکانی کورددا، هەر کوردێ دیانی خێر بە عەرەب دابنێ و خۆی بە موسوڵمان بزانێ، بەنۆکەرو بەجاشی عەرەب و بە عەرەب پەرست دائەنرێ!

جا لەپاش روودانی بارودۆخێکی ئاوا، گورووپە داخ لەدڵەکان و لایەنە تێکشکاوەکان، کە چاوەڕوانی هەل بوون و لەوەوپێش تاك و تەرابوون و وەك رێکخراوێکی نهێنی داخ لەدڵی چاوەڕوانی تۆڵە سەندن بوون، لەروموزەکانی فتوحاتی ئیسلامی، ئەمانە لەپاش هەلی رەخساو، زۆر بە لێزانانەو شەیتانانە، چوونە پاڵ حەجەکەو کۆمەڵێ مەزلوومییەتی ئالوبەیتی پێغەمبەریان قۆستەوەو مەسحێکی زیرەکانەی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی سوننەتیان کردو ئەوەی بۆنی بەڵگەی لێ بێ بۆ ئەوان، کردیان بە بەڵگەی خۆیان و بەدەمیان و بەسەدان و بەهەزاران ریوایەت و فەرموودەو تەئویلی دوور لەڕاستییان دروست کردو ئایینێکی نوێیان داتاشی و ناویان نا:شیعەی عەلی و مەزهەبی ئەهلی بەیت!! بە بەردێ دوو نیشانیان شکاند: عەوام و رەشە خەڵکەکەی خۆیان پێ هەڵخەڵەتان و داخی دڵی خۆشیان بە ئیسلام و بە عەرەب و بە رەمزەکانی

ئیسلام رشت، گوایە تەنیا خۆیان موسوڵمانی راستو دروستنو ئەو خەڵکەی تـر، هەموو عەرەب پەرستنو زەوتکەری ئـەو مافـەی عـەلیو کەسوکاری عـەلین، کـە خودا بۆ خۆی پێیانی بەخشیوەو لایەنگری ئـەو خەڵکـە زەوتکەرانـەنو لـەڕیزی ئەوانن، کە دادەنرێن بە دوژمنانی عەلیو بە دوژمنانی سەرەکی دۆستانی عەلیو نەوەی عەلی!!

جابۆ پیـادەکردنو بەگەڕخستنی ئـەم دینـە دەسـتکردەی خۆیـان، زۆر بـە پسپۆڕانە، سوودیان لـە بۆچوونو رووداوو راجیـایی نێـوانی ئایینـە پێشینەکان وەرگرت، موطالەبە بـەخوێنی حوسـەینیان خـستە جێگـەی موتالەبـە بـەخوێنی مەسیحو دوازدە ئیمامیان دانـا لەشـوێنی دوازدە حـەواری عیـساو، چۆن هـاروون وەصی مووسا بووە، عەلیش وصی موحەممەد بووە! هەروەها سوودیان لە هەڵەو رەفتاری نالەباری دەستەڵاتداران وەرگـرتو، وەك رەخنـەگریی (رەخنـە سازیی: موعارەزە)ی ئەمڕۆ، هەرچی چاکەی رژێمی دەسەڵاتداری ئیسلامی بوو، حاشایان لێ کـردو کۆمـەڵێ درۆو دەلەسـەو بوختیـانو چـیرۆكو هـەواڵیان هەڵبەسـتو مێشیان کـرد بـەگامێش، بـەرە بـەرە هـەنگاوی گـەورەیان نـا، ئـەو دەغـەزو رقو کینـەو جـەرەتاوەی کـە لـەناو دەروونیانـا پـەنگی خواردبـۆوە هـەڵیان رشـت! بەتایبەتی لەسەرا سەری وڵاتی ئیسلاما، لـەکوێ بزووتنەوەیـەکی دژی دەسـەڵات بووبێ، ئەوان خۆیان دەگەیاندێو ژەهری هەلایهەلی خۆیانیان تیادەڕشت!

پێش هەموو شتێ موسوڵمانانیان کرد بـەدوو بەشـەوە: یەکـەم: هەرکەسـێ لایـەنگیری دەوڵـەتی ئیـسلامی بـێ، لەسـەرەتای سـەردەمی ئـەبو بـەکرەوە، هـەتا سـەردەمەکانی موعاوییـەو یەزیـدو حـەجاجو ئەمەوییـەکانو دواتـریش، ئـەوە چڵکاو خۆرو جاشی رژێمە زەوت کەرەکان بـوونو نـرخو بایـەخ نـەبۆ راو قـسەو زانستو ئـایینو مەزهـەبو بیروباوەڕیـان هەیـە، نـەبۆ تەفسیری قورئـانو نـەبۆ

شەرح‌و گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر هەیە، مەگەر لەیەك کاتا، کە ئەوانە سوودیان بۆ ئەوان هەبێ‌و لەدژی شەقامە ڕێگەی ئیسلام بن، با هەواڵ، یا فەرموودەیەکی زۆر لاوازیش بێ!! چونکە ئەمانە کەتمی حەقی عەلییان کردووەو پشتی زوڵم‌و زۆرو زەوتکردنی جێنشینە زۆردارە زەوتکەرەکانیان گرتووە!!

**دووەم:** لایەنگیرانی عەلی‌و نەوەی عەلی، ئەمانە صەفوەی خەلق‌و ئیمانداری بەڕاستی خۆیان‌و خەڵکانی تر هەموو نەواصیبن، ئەگەر پێشیان بگوترێ (موسلیم) پێیان ناگوترێ (مؤمن)!! گەرچی بەدیمەن موسوڵمانن بەڵام لەڕاستیدا بێباوەڕو کافرن!!

جابۆ چاوو راوو چاوبەست، بۆ بەرپەرچی ئەو پرسیارە هەق‌و رەقەی کە دەڵێ: ئەم شتەی ئێوە دەیڵێن ئەگەر راستە بۆچی لەسەردەمی پێغەمبەرو چینی یەکەمی موسوڵمانانا نەبوو؟ بۆ بەرپەرچی ئەم پرسیارە دەڵێن: (پەیڕەوانی عەلی، لەترسی دوژمنانی عەلی، لەمەوپێش پرژو بڵاو بوون‌و زۆرتر بەدیمەن‌و بەرواڵەت لەگەڵ رژێمە ئیسلامییەکان بوون‌و سازشیان لەگەڵ بارودۆخدا کردووەو هەمیشە لەناو خەڵك‌و لەبەر چاوی خەڵك، لەترسی سەرو ماڵ‌و ناموسیان، خۆیان لەزۆرینەی خەڵك جیانەکردۆتەوەو، بەدوو روو، وە بەدوو زمان قسەیان کردووە لەگەڵ عاممە بە زمانی خۆیان‌و لەگەڵ خاصە بەزمانی خۆیان‌و جاری وابووە کە گەورەکانی شیعەو زانا گەورەکانیان، تەقیەیان بەکارهێناوەو لەگەڵ ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتدا، واخۆیان پیشانداوە کە سوننیین‌و لەژێرەوە شیعە بوون‌و شیعە گەرییان کردووەو بەنهێنی شیعە بوون‌و ئەم قسانەیان کردووە کە ئێمە ئەمڕۆ بەئاشکرا دەیانکەین، جا لەپاش تێپەڕبوونی ئەم قۆناغە، شیعە لە هەلی رەخساودا،

کۆمەڵێ هەنگاوی گەورە گەورەیان نا، کە هیچیان لەوەپێش نەبوون‌و نەبیستراون، زۆر لە ئایەتەکانی قورئانیان تەحریف کرد، یا بەپێچەوانەی مەبەست لێیان، واتایان لێیان دایەوە، وە کۆمەڵێ حەدیثی لاوازو قسەی بێسەرو بەریان برەوپێدا، وە بۆئەوەی کەدینەکەیان کەخۆیان پێی دەڵێن: مەزهەبی ئەهلی بەیت، هەتا هەتایە بمێنێ‌و جارێ تر لەگەڵ ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا یەك نەگرێتەوە، جابۆ ئەم مەبەستەو لەم دیدو روانگەیەوە، ئەم کۆمەڵە بڕیارەیان لە بڕبڕەی ئایینە داتاشراوەکەیاندا چەسپاندو سەپاند:

١- بە گوتارو بەکردەوە ئەو بنەمایەیان پووچکردەوەو هەڵوەشاندەوە کە دەڵێ: (موحەممەد خاتەم‌و کۆتای پێغەمبەرانەو لەپاش ئەو وەحیی کۆتایی دێ‌و ئیسلام بەتەواوی تەواو بووەو پێویستی بە تەواوکەری تر نییە، بەهەر ناوێکەوە بێ). چونکە بەبێ بەڵگەو بەدرۆی هەڵبەستراو بەدەم ئیمامەکانیانەوەو بەهۆی تەحریفی لەفظی‌و مەعنەوی، بۆ کۆمەڵێکی زۆر لەئایەتەکانی قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەرو بەهۆی کاریگەریی بیرو باوەڕی کۆنەوە بڕیاریاندا: (کە ئیمامەت پایەیەکە وا لەسەرووی پایەی نبوەت‌و ریسالەت‌و پێغەمبەرایەتییەوە، وە هەرکەسێ باوەڕی بە ئیمامەت نەبێ، باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران‌و خوایەتیی خوداش نییەو زەندیقەو بێباوەڕەو لە ئاگری دۆزەخدا دەبێ هەتا هەتایە، بەدەق دەڵێن:

(كُلُّ منكرٍ لإمَامَةِ عَلِيٍّ وَأَوْلَادِهِ، وَمُعْتَقِدٍ بإِمَامَةِ غَيْرِهِمْ ناصِبِيٌّ، وَكُلُّ نَاصِبِيٍّ زِنْدِيقٌ مُلحِدٌ! وَ قَرَنَ فُقَهَائُهُمْ السُّنِّيَّ بِالكافِرِ وَالمشرِكِ والخنزيرِ وَجَعَلُوهُ مِنَ الأعْيَانِ النَّجِسَة!).

٢- لەدوا موحەممەد، خودای گەورە دوازدە ئیمامی داناوە، کە بەعەلی کوڕی ئەبو طالیب دەست پێدەکەن‌و بە مەهدی مونتەظەر کۆتاییان هاتووە، کە

ئەم دوازده ئیمامانە یا بەدەق و نەصصی صەریحی پێغەمبەر خۆی کراون بە ئیمام و بەوەصی پێغەمبەر، وەك ئیمامی عەلی خۆی، یا بەنەصصی صەریحی ئیمامی پێش خۆی کراون بە ئیمام و بە وەصی، وەك یازده ئیمامەکەی تر).

لەهەمووی سەیرتر، دوازدەهەمیان کە مەهدی مونتەظەرە، کە لە کەسایەتیەکی ئەفسانەیی دەکا، کە بۆ دین قوتبی رەحایەو تەوەرەی ئاشە، لەترسانا، لەتەمەنی چوار - پێنج ساڵیدا، لەسەردابەکەی سامەڕادا، لە دەوروبەری ساڵی (٢٦٠) دوو سەدو شەستی کۆچیدا، خۆی حەشارداوە، رۆژێ لەرۆژان دێتە دەرەوەو تۆڵە لەهەموو دوژمنەکانی ئەهلی بەیت دەستێنێ و بە زەبری شمشێر هەموو جیهان دەکا بەشیعەی دوازده ئیمامیو، ئەوەی کە بە پێغەمبەرەکان لەوەپێش نەکراوە، ئەو بەزیادەوە دەیکا!

٣- ئەم دوازده ئیمامە، عیلم و زانستەکەیان، عیلمێکی لەدونیەو لە پێغەمبەرەوە پێیان بەخشراوەو عیلمەکەیان پێویستی بە هەوڵ و کۆشش و کەسب و ریوایەت نییەو ئیمام لەسەردەمی خۆی دا هەر قسەیێ بکا، بەوەحیە، پێویستی بەسەنەدو رشتە نییە، وەهەموو صەلاحییەتێکی پێغەمبەریان پێ دراوە، تەنانەت ئەوەی کە بە پێغەمبەر نەکراوە لەسەردەمی خۆیدا، یا بە ئیمامەکانی تر نەکراوە لەسەردەمەکانی خۆیاندا، لەناتەواوی شەریعەت و تەبلیغی ریسالەت و راگەیاندنی پەیامی خودا، ئەوان لەچاخ و سەردەمی خۆیاندا ئەو نەقص و ناتەواوییە تەواو دەکەن و پەیامی خودا بەتەواوی رادەگەیەنن!!

## کورت و پوخت:

(جیاوازی نییە لەنێوانی پێغەمبەرو ئیمامدا، تەنیا لەوەدا نەبێ کە بە ئیمام ناگوترێ پێغەمبەر، دەنا خودا هەموو نهێنییەکانی شەریعەتی سپاردووە

بەم ئیمامانە، ئەوانیش لەسەردەمی خۆیاندا، بەپێی پێویست روونی دەکەنەوە بۆ خەڵك!!).

٤- هەموو مەعصوومن‌و پارێزراون لە هەڵەو لەشت لەبیرچوون‌و لە تاوان‌و لەگوناهو قەت قەت هەڵەو گوناه روویان نەداوە لەوان، هەتا بەمناڵیش، هەرکەسەیان بگری خاوەنی عیلمی لەدونییەو تەواوکەری شەریعەتە، دین تەنیا ئەوەیە: (کە گوتە، یا کرداری مەعصووم بێ، ئیتر ئەو مەعصوومە حەزرەتی موحەممەد بێ، یا عەلی بێ، یا یەکێ تر لەدوازدە ئیمامەکانی تربێ جیاوازی نییە).

٥- ئەم ئیمامانەیش رێك وەك پێغەمبەر وان، بگرە پتریش، چونکە هەموویان خاوەنی ویلایەتی تەکوینین، ئەگەر بەشتێ بڵێن (کن فیکون!!!) وە هەروا هەموویان وەك پێغەمبەر خاوەنی خەواریق‌و موعجیزەن‌و خودا ئاگاداریان دەکا لە غەیبی ئەرزو ئاسمان‌و لە ئەسراری شەریعەت، هەورو باران‌و بەهەشت‌و دۆزەخ‌و رزق‌و رۆژی‌و تەمەن‌و ئاکام‌و شیفا، هەمووی بەدەست ئەم دوازدە ئیمامەیەو خودا کلیلی ئەمانەی تەسلیم بەوان کردووە!! تەنانەت مردنی خۆشیان بەدەستی خۆیانە).

٦- هەریەکێ لەم دوازدە ئیمامە بگریت گەورەترو چاکترە لەهەموو پێغەمبەرەکانی تر، تەنیا موحەممەدیان لێ دەرچێ، بەم قسەیە بێ، ئەو منداڵەی کە گوایە وا لەسەر دابەکەی سامەڕادا، لە نووح‌و ئیبراهیم‌و یەعقووب‌و مووساو عیساو جوبرائیل‌و هەموو فریشتەو پێغەمبەرەکانی تریش گەورەترە! بۆ نموونە: لەهەردوو جیهانا تەنیا دوو کەس لەعەلی، یا لەمەهدی مونتەظەر گەورەترە: خوداو موحەممەدو بەس!!.

٧- ئەم دوازدە ئیمامە لەبەرئەوەی کە مەعصومن، هەرچی دەڵێن راستەو دین تەنیا ئەوەیە کە ئەوان دەیڵێنو هەرکامێکیان بگری، ئەمە پێناسەکەیەتی: {وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى – النجم – ٣/ ٥٣}.

تەنانەت قورئانیش دانانرێ بە قورئان ئەگەر لەڕێگەی ئیمامێکی مەعصوومەوە وەرنەگیرێ!!

بەڵکوو باوەڕیان بە قورئانی فاطیمە هەیە، کولەینی لەکافیدا، لە جەعفەری صادیقەوە دەگێڕێتەوە: (لەلای ئێمە موصحەفی فاتیمە هەیە، کەسێ ئەوەندەی ئەم قورئانەی ئێوەی واتیادا، سوێندم بەخودا یەك پیتی لەم قورئانەی ئێوەی تیادا نییە!). کافی لەلای شیعە، وەك صەحیحی بوخاری وایە لەلای سوننە.

٨- هەریەکێ لەم دوازدە ئیمامە، بۆیان هەیە لەدین زیادکەن، یالێی کەم کەن، وە بەکردارو بەگوتار، بەقسەی شیعەکان بێ، دەستکاریی ئایینی موحەممەدیان کردووە، زۆرشتیان لەپاش پێغەمبەر تەشریع کردووەو، زۆر شتیشیان لەدین لابردووە، وەك بڕیاردانی ئەو جۆرە بیرو باوەڕەی کە لەخاڵەکانی پێشەوە باسکران، یا لەخاڵەکانی پاشەوە باس دەکرێن، کە ئەمانە هێچیان لەم سەرچاوە سەرەکییانەی ئایینی پیرۆزی ئیسلاما نین، نە لەقورئاندا هەن، نە لەسوننەتی صەحیحی پێغەمبەردا هەن، نە ئەهلی مەکەو مەدینە، ئاگایان لەم جۆرە داوا بێ بەڵگانە بووە، کە لەسەردەمی پێغەمبەردا، لەخزمەتیدا بوونو دینەکەیان بەگوێی خۆیان لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر وەرگرتووە، کە ژمارەیان لەسەد هەزار کەس زیاتر بووەو هەمووشیان بەکۆی دەنگ لەسەر ئیسلامەتی ژیاونو لەسەر ئیسلامەتی مردوون!

٩- کۆمەڵێ لەبیرو باوەڕی سەرەکی شیعە، کە تایبەتە بەخۆیان:





أ/ ئیمامەتو ویصایەتی عەلیو نەوەی عەلیو بەس. ب/ عیلمی لەدونی. ج/ عیصمەتی ئیمامەکان. د/ خەواریقو موعجیزاتی ئیمامەکانیان. هـ/ غەیبە، کەنابێ زەمان خاڵی بێ لەئیمام، لەسەر ئەم بنیاتە ئیمامی دوازدەهەم، لەسەردابەکەی سامەڕادا غەیب بووە. و/ رجعە، ئیمامی دوازدەهەم، بەخێرێ لەسەرداب دەردەچێو دەوڵەتی شیعە دادەمەزرێنێو مەزهەبی شیعە تەعمیم دەکاو مەزهەبی تر لەکەس قەبووڵ ناکا. ز/ تەقیە. ئەصڵێکە لە ئەصڵەکانی دین، تەرککردنی تەقیە، وەك تەرکی نوێژ وایە، لەژێر پەردەی تەقیەدا، ئەم شتانە ئەنجام دەدرێ: گوتنو کردنی شتێ، کە لەدڵەوە باوەڕت پێی نەبێ، لەترسانا، یا لەشەرمانا، تەنانەت زاناکانیان دەتوانن، بەپێچەوانەی مەزهەبی خۆیانەوە فەتوا بدەن، سازشو خۆسازان لەگەڵ ناحەزو نەیاردا، بەتایبەتی لەگەڵ دەستەڵاتداری سوننیدا، لەکاتی بێ دەستەڵاتیدا، بەپێی بنەمای تەقیە، شیعە دەتوانێ درۆبکا، سوێندی درۆبخوا، مەدحی زاڵم بکا، بڵێ: من لەعنەت لە ئەبوبەکرو عومەرو عائیشە ناکەم. تەقیە بەردەوام دەبێ هەتا ئیمامی مونتەظەر لەسەرداب دەردەچێ!! بەڵگەسازی بەم ئایەتە دەکەن: {إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً - آل عمران – ٣/٢٨}.

ح/ موتعە. مارەبڕینی کاتی، لەلای شیعە دادەنرێ بەخوا پەرستییەکی گەورە، هەندێ نموونەی جیاوازییەکی وای نییە لەگەڵ داوێنپیسیدا.

ط/ بەرائەت. بەرائەتو حاشاکردن لە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عائیشەو حەفصەو موعاوییەو ئەبو سوفیانو لەعنەتو نەفرەت کردن لێیان، بەڵکوو لەعنەتکردن لە ئەبوبەکرو عومەر لەجێگەی بیسمیللایانە، بە ئەبوبەکرو عومەر دەڵێن: جیبتو طاغوتو صەنەمەی قوڕەیش!!

دەڵـێن: لەعنــەت لــە عائیــشە خێــری زۆرتــرە لــە صــەڵاوات لەســەر پێغەمبەر!!!

ی/ موسوڵمانان یەکێکن لەم دوو کەسە: یا موالی‌و دۆستی عەلی‌و نـەوەی عـەلین، یـا دوژمـن‌و موعـادی عـەلی‌و نـەوەی عـەلین. مـوالی‌و دۆسـتی عـەلی ئەومیـە: کـە بـاوەڕی وابـێ عـەلی ئیمـامی مەعـصوومەو وەصـی پێغەمبـەرە، هـەروا یـازدە ئیمامەکەی تریش کە لەنەوەی عەلین. دوژمن‌و ناصیبیش ئەومیـە: کـە بـاوەڕی بەجێنـشینی ئەبوبـەکرو عومـەرو عوسمـان هـەبێ‌و بـە غاصـیب‌و زەنـدیق‌و زەوتکەری ئیمامەتیان نەزانێ. کورت‌و پوخت، ئەمانـە لـەبڕبڕەی بیرو باوەڕی شیعەکانن: مـارەبڕینی کـاتی‌و داهێنـانی پێـنج یـەك‌و زیـادکردنی چـەند وشـەو رستەیەك، لـەبانگ‌و لەقامـەت‌و لـە شـایەتمان‌و لەهەنـدێ شـوێنی قورئـان، وەك: (وَجَعَلْنَـا عَلِيّـاً صِـهْرَكَ) کـە لەسـوورەتی ئەلـەم نەشـرەحی زیـاد دەکـەن، وەك دەستکاری کردنی کـاتی نوێـژەکان‌و تێکدانی دەسـتنوێژو گۆڕانکاری لـەرۆژوودا، وەك بڕیاردانی عەتەباتی موقەددەسەو لاسکایی کردنەوەی حەرەمـەین‌و دانـانی ئەو شوینانە بەدیاری موقەددەسەو بڕیاردانی دێنی‌و سـەردانیان گـەلێ خێرتـرو پیرۆزترە لە حەرەمەین‌و مەسجیدی ئەقصا، وەك: کەربەلاو نەجەف‌و کاظمین‌و قوم!!

دەڵـێن: (یـەك سـەردانی کەربـەلا، هاوتـای حـەفتا حـەج دەکـا!!). وەك: داهێنـانی دێنـی‌و سـەردانی گـۆڕی عـەلی‌و حوسـەین‌و گـۆڕە پیرۆزەکـانی تریـان، یادکردنەوەی ساڵانەو چلەی وەفاتی ئیمامەکانیان‌و... تاد، وەك: شـین‌و شـەپۆڕو شیوەن‌و سینگ کوتان‌و بەزنجیر لـەخۆدان‌و پرسـەو سەرەخۆشـی لـەپاش سـەدان ساڵ‌و بەردە مۆرەو ناردنی مردوو بۆ کەربـەلاو ناشـتنیان لـەوێ، وەك: بەرائـەت لـەدوژمنانی عـەلی‌و لـەدوژمنانی کـوڕانی عـەلی‌و لەعنـەتکردن لـە هـاوەڵانی

پێغەمبەرو تانەی داوێنپیسیو بوختیان بۆ هاوسەرەکانی پێغەمبەر، بەتایبەتی حەزرەتی عائیشەو حەفصەو ئوممو حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان!

١٠- وەك دەرەنجامێ بۆ ئەم بڕیارانەی کەباسکران، شیعەکان بڕیاریانداوەو کردوویانە بە باوەڕو عەقیدە: (کە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان غاصیبو زەوتکەرنو ئیمامەتیان لە عەلیو نەوەی عەلی زەوتکردووە، لەبەرئەوە مورتەددو کافرنو پێویستە ڕۆژانە لەهەموو بۆنەکانا، بەتایبەتی لەکاتی سەراودا، بەرائەتیان لێ بکرێو لەعنەتو نەفرەتیان لێ بکرێو، لەعنەت لەمانەو لەوانەی کە ئەمانە بە غاصیب دانانێنو بەجێنشینی پێغەمبەریان دائەنێن باشترین خواپەرستییەو لەعنەتێ لە ئەبوبەکر، یا لەعومەر، خێری زیاترە لە سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەرو لە ذیکرو یادی خودا، واتە: بڵێیت: لەعنەت لە عائیشە خێری زۆرترە هەتا بڵێیت: (سبحان الله) یان (لا إله إلا الله!!) والله المستعان.

١١- وەك ئەنجامێ بۆ ئەم خاڵانەی سەرەوە، بەتایبەتی خاڵی (١٠) دەیەم، هەرکەسێ لایەنگیری ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو موعاوییەو عائیشە بێو بەکافرو هەڵگەڕاوە لە ئیسلامیان دانەنێ، ئەویش وەك ئەوان ناصیبیو بێباوەڕو زەندیقە، بەتایبەتی کاتێ کە ئەم مەزهەبە موبارەکەی شیعەی پێ بگاو قەبووڵی نەکا، کە لەبارترین ناوی گونجاو لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیدا، ئەوەیە ناوبنرێ بەمەزهەبی لەعنەتنامە!! چونکە لەقورئانا لەعنەت لە هەرکەسو تاقمەیێ کرابێ، تۆمەتی نیفاقو کوفرو زوڵمو خیانەتو تاوان لە هەرکەسێ درابێ، شیعە ئەو لەعنەتو تۆمەتە دەبڕن بەسەر سەحابەکانی پێغەمبەردا، بەسەرۆکایەتی خولەفای راشیدینو هاوسەرەکانی پێغەمبەر!! دیارە کە بەپێی ئەم خاڵە، زۆرینەی موسوڵمانان، بەتایبەتی ئەهلی سوننەتو جەماعەت،

لەسەرەتای ئیسلامەوە هەتا ئێستا، لە ئێستاشەوە هەتا ڕۆژی قیامەت، هەموو زەندیقو بێباوەڕنو نەواصیبی ئەهلی بەیتن، لەبەرئەوە شایانی ئاگری دۆزەخی ئێجگارینو لەحوکمی مورتەددان، تەنانەت لە ئەهلی نیممەیش خراپترنو ئەو مافەی بۆ ئەهلی نیممە هەیە بۆ ئەوان نییە!!

بەم قسەیەیێ لەسەددا نەوەدو پێنجی موسوڵمانان موسوڵمان نین، بەتایبەتی زانا گەورەکانیان، وەك ئەبو حەنیفەو بوخاریو موحەددیثو موفەسسیرە گەورەکانو ئیبنو تەیمییەو لایەنگیرانی، چونکە ئەمانە کەتمی حەقی عەلییان کردووە، بەتایبەتی ئەبو حەنیفەو ئیبنو تەیمییە بە گەورەترین ناصیبی دادەنێن!! هەروا صەلاحەددینی ئەییوبی بەدوژمنی ژمارەیەکی خۆیان دائەنێن!!

مەبەستی دووەم لەم فەرموودەیە ئەمەیە: دووپاتکردنەوەی مەبەستی یەکەمە: کە دانانی سەرۆکی دەولەتی ئیسلام، لەپاش مەرگی موحەممەد بەوەحیو تەوصییە نییە، بەڵکوو بەڕاوێژو شووراو پەیمانو بەیعەت دادەنرێ، چونکە ئەو سەردەمە بەسەردەچێ، کە پێغەمبەر لەدوا پێغەمبەربێت، وەك کاتی جوولەکەکان!!

لەڕاستیدا من بەش بەحاڵی خۆم، کاتێ شارەزاییەکی باشم پەیداکرد، لەرێگەی سەرچاوەکانی ئەهلی سوننەو جەماعەتەوە، بەگیانو بەدڵ ئەشقی دینی موحەممەدو ئەهلو بەیتی موحەممەدو هاوەڵەکانی موحەممەد بووم، جاری وادەبوو، گیانو هەستم دەفڕی بۆ ناو کۆڕو کۆمەڵو گوزەرانیان، بەچاوی رووح سەرەنجی خەباتو تێکۆشانی ئەوانم دەداو لەمزگەوتا لەگەڵیان بووم کەچۆن ریزەکانیان لەڕیزی پۆلە فریشتەیان دەکرد، لەپشت پێغەمبەرەوە، لەهەموو مەڵبەندە کانیانا لەگەڵیان بووم کە چۆن خۆشەویستیو فیداکاریو

ڕێزیان بۆ پێغەمبەرو کەسوکاری پێغەمبەرو دینی پێغەمبەر هەبوو، کەچۆن هاوسەرەکانی پێغەمبەر بەرۆح و بەسەرو بەماڵ و بەکەسوکار، رەزابوونی پێغەمبەریان مسۆگەر دەکرد، بەڵام کاتێ لێکۆڵینەوەیەکی قووڵم بۆ بۆچوون و مەزهەبی شیعەکان کرد تووشی خورپە بووم، چۆن نا؟ ئەوەی کەمن بە کۆمەڵگای بەختەوەریم دەزانی، بەقسەی ئەم سەرلێشێواوانەبێ، کۆمەڵگایەکی خۆ خۆری پیلانگێڕ بوون، تەنانەت پێغەمبەر خۆشی زۆر فاشیل بووەو هیچی بۆ نەکراوە، چونکە خەڵکەکەی کە لەسەردەمی خۆیدا شوێنی کەوتوون، لەپاش خۆی یەکسەر دینەکەی ئەویان تەحریف کردووە، چونکە لەدڵەوە باوەڕیان پێی نەبووە، لەپاش مەرگی خۆی یەکسەر پاشگەزبوونەتەوەو دوژمنایەتی وەصی و کەسوکارەکەی ئەویان کردووە، لە ئەبوبەکرەوە بیگرە، هەتا ئێستایش و دواتریش!!

دەڵێن: زانایەکی گەورەی سوننی، لەنەجەف دەچێ بۆلای ئاخونێکی مەرجەعی شیعە، دەبینێ کۆمەڵێ فەقێ و شاگردی زۆری لەدەورە. مەلا سوننیەکە پێی دەڵێ: ئەمانە لەپاش جەنابیشت هەر پەیڕەوی تۆ دەکەن و تۆ بەمەرجەعی خۆیان دەزانن؟ مەلا شیعەکە دەڵێ: بەڵێ، مەلا سوننییەکە پێدەکەنێ، دەڵێ: بۆچی پێدەکەنی؟ دەڵێ: چ عەجەب سەحابەکانی پێغەمبەر هەمووی لێی هەڵگەڕاونەتەوە، کەچی فەقێکانی تۆ پەیڕەویت دەکەن، دیارە یا تۆ باشتری لەپێغەمبەر، یا فەقێکانت باشترن لەسەحابەکان!!.

تەنانەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشی لەسەردەمی خۆیدا، لەنەتەوەکەی ترساوەو زۆرشتی روون نەکردۆتەوەو مەرایی بۆ ئەبوبەکرو عومەرو عائیشەو کەسانی تر کردووەو بەدزییەوە باسی ئیمامەت و ویصایەتی بۆ بازێ کەس کردووە، هەتا لەپاش خۆی ئەوان بەوئەرکە هەڵسن!

بگـره هـەر لەسـەرە مـەرگی پێغەمبـەردا، ئۆمەتەکـەی بەسـەرۆکایەتی ئەبوبـەکرو عومـەر، پیلانیـان لـە ئـایینی ئیـسلام کـردووە، لـەو پیلانەیـشدا سـەرکەوتوو بـوونو دینیـان گۆڕیـوەو فەشـەلیان بەوەصـیە مەنـصووبەکەی پێغەمبەر هێنـاوە، کـە پێغەمبـەر بەفـەرمانی خـودا دانـاوە، کـە عەلییـە، واتـە: ئەبوبـەکرو عومـەر گۆلێـان لـەخودایش کـردووە، پـەنا بـەخوا لەهەڵـەی وا، لەتەفسیری شوببەرو سەرچاوەکانی تـری شیعەدا دەڵێ: (لـە حـەجی مالاواییـدا، خـودا فـەرمانی بـە پێغەمبـەر کـرد، کـە ویلایـەتو ئیمامـەتو ویصایەتی عـەلی رابگەیەنێ، بەلام پێغەمبەر لەترسی ئەبوبـەکرو عومـەرو سـەحابەکان نـەیوێرا، رایبگەیەنێ، هەتا خودا بەم ئایەتە هەڕەشەی لێکـردو دڵنیـای کـرد کـە نەترسـێ لەکوشتن.

{يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ - المائدة — ٥/٦٧}. ئـەوجا ئـەویش لەغـەدیرخوم ئیعلانی ویصایەتی عەلی کردو ئایـەتی: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ } هـات بـەم بۆنەیەوە!!

سوبحانەڵلا لەم بێ رێزییـە بـە پێغەمبـەرو هـاوەڵانو هاوسـەرانی، ئـەوەتا پێغەمبـــەر (درووەی خـــودای لەســـەر بـــێ) لـــەپاش مەرگیـــشی، لـــە گـــۆڕە پیرۆزەکەشیدا، لەدەست مورتـەددانو زەندیقـەکانی هـاوەڵانی رزگـاری نـەبووە، ئـەوەتا لەگۆڕیـشدا هـاودەمو هـاوڕێی ئەبوبـەکرو عومـەرە، کـە شـیعەکان پێیـان دەڵێن: صەنەمەی قوڕەیشو شەیخەی نار!!

من بۆ خودا عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم:

(با وادابنێین کەئێمە موسوڵمان نینو بـەلام ویـژدانی خۆمـان دەکـەین بـە فەرمانڕەواو حەکەم، سـەبارەت بـە عەقیـدەی سـوننییەکانو شـیعەکان، لـەبارەی

پێغەمبەرو هاوەڵانو هاوسەرانو ئەهلی بەیتییەوە: جا توخودا پێغەمبەرێ کە ئەوەنـدە ڕێـزو قـەدری نـەبێ لـەلای خـودا، کـە لەگۆڕەکەیـدا، هـاودەمی دوو فیرعەونی ئوممەتەکەی بێ، وە دوازدە وەصـیو ئیمامـەکانیش لـەژیانی خۆیانـدا بەمـەیان زانیبـێو تەحـەممولی ئـەوەیان کردبـێو چاوەڕوانی ئـەوە بـوون کـە ئیمامی موسەردەب لەسەردابە بۆر دەرچێو بچێ لاشـەی ئەبوبـەکرو عومـەر لـە گۆڕەکانیـان دەربهێنـێو بـێ ڕێزییـان پـێ بکـاو لەسـەر دارو درەخـت بیـان سـووتێنێ! پێغەمبـەرێ کـە خێـزانو ئوممەتەکـەیو خـەزوورو زاواکـانیو هاوسـەرەکانیو زۆرینـەی هـاوەڵو فەرمانـدە سـەربازییەکانیو هۆزەکـەی خـۆی بەتایبـەتی کـە قورەیـشن، پێغەمبـەرێ کـە ئەمانـە هـەموو لەگـەڵیا ناپـاکبنو بەردەوام خەریکی پیلان بووبن لێیو خۆیو ئەهلوبەیتو خزمـەکانی، لـەژیانو مردنیانا، بەدەست ئوممەتو ژنەکانیەوە، داماوو کەساس بن، ئایا شتی وا هۆشی ساغ قەبووڵی دەکا، یا دوژمن بەدوژمنی دەکا؟).

وەکی تریش: (ئەم هەمکە جمێنو نەفرەتو لەعنەتە لەو خەڵکە مـردووە چی سوودێکی هەیە، گریمان ئـەو خەڵکـەی شـیعەکان شـەوو ڕۆژ لـەباتی زیکـرو صـەڵاوات، نـەفرەتو لەعنـەت لـەو مردووانـە دەکـەن، گریمـان ئـەو خەڵکـە گوناهبـاریش بـن، تـازە ئەوانـە چوونەتەوە دیـوانی خـودا، خـودا خـۆی دەزانـێ شایانی چین، ئیتر ئێمـە ئەگـەر یـەك تۆسـقاڵ دڵسۆزیمان بـۆ خـواو پێغەمبـەری خواو ئایینی خۆمان هەبێ، ئیتر لەپای چی ڕیزی موسوڵمانان دوولـەت بکـەین؟! یان تانە لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر بدەینو ئابڕووی پێغەمبەری پێ ببەین؟!

سوێندم بەخودای تاكو تەنیا، کە ئەو هەمکە جنێوەی شیعەکان دەبیـنم، کەدەمیدەن بە پێشینانی ئەم گەلی ئیسلامە، لەموهاجیرینو ئەنصارو عەشـەرەی موبەششەرەو خولەفای ڕاشیدینو ئەصحابی شەجەرەتولڕیضوانو هاوسـەرەکانی

پێغەمبەرو ئەهلی مەککەو مەدینەو هۆزی قورەیش‌و هەموو هاوەڵ‌و سەحابەکانی پێغەمبەرو لەسەددا نەوەدو پێنجی تابیعین‌و خەڵکی شام بەگشتی‌و سەرجەمی زانایان‌و پیاوچاکانی نەتەوەی ئیسلام، لەسەرەتاوە هەتا ئەمڕۆ، سوێندم بەخودا کەئەم حاڵە دەبینم، واهەست دەکەم کە کوڵە وەیبابێ دەدا بە خۆشەویسترین کەسمەوەو لەبەرچاوم جەستەی پارچە پارچە دەبێ!!

جا ئایا ئەم جۆرە قسەو تانەو تەشەرانە، هەمووی دەغەزو کینەو کۆنە قینی پەنگەوە خواردوو نییە، لە پێغەمبەرەکەو پەیامەکەی‌و نەتەوەکەی‌و دینەکەی؟ ئایا دین بەجنێوو لەعنەت دادەمەزرێ، یا سەردەکەوێ، یا بەحیکمەت‌و مەوعیظەی حەسەنە؟ یا مەبەستێ تری شاراوە هەیە لەم شەڕە جنێوەدا؟!

ئەوەی کە لەبەرچاوە شیعە بەناوی دۆستییەوە، حەیای موحەممەدو دینەکەی‌و ئوممەتەکەی‌و هاوسەرەکانیان بردووە، لەم رووەوە گاورو جولەکەیش شتی وایان نەکردووە! خودا پەنامان بدا لەکفری وا، سوێندم بەخودا، ئایەتەکانی قورئان، فەرموودەکانی پێغەمبەر، شیعە هەموویان کردووە بە گاڵتەجاڕو شەڕە گەڕەك، یا شانامەی عەلین، یا لەعنەتنامەی ئەبوبەکرو عومەرن، دەرزی زەهریان لێداون‌و لەکاریان خستوون، ئەو ئایەت‌و فەرموودانەی کە بەڕاشکاوی باسی فەزڵی سەحابە دەکەن، یا بەرائەتی عائیشە دەکەن، یا پایەی دایکی بڕواداران، بۆ هاوسەرەکانی پێغەمبەر دەچەسپێنن، هەموویان بەقسەی بێ سەروبەری ئاخون‌و ماخون، تەحریف دەکەن‌و لە مەدحەوە دەیکەن بەزەم‌و لەزەمەوە دەیکەن بە مەدح، بۆ نموونە: بەکۆی دەنگ، لەسەفەری کۆچا، ئەبوبەکر لەگەڵ پێغەمبەردا بووە، شیعە ئاوا ئەم ئایەتە تەحریف دەکەن، کە دەچەسپێنێ ئەبوبەکر صاحیبی پێغەمبەرەو مەعییەتی خودا لەگەڵ




پێغەمبەرو ئەبوبەکردا بووەو ئەوە بووە بەهۆی پاراستنیان لەکافرەکان، شیعە دەڵێن:

(إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ) وَلاَ مَدْحَ فِيهِ. أي لِأَبِي بكرٍ. إِذْ قَدْ يَصْحَبُ الْمُؤْمِنَ الكَافِرُ!! (لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا) أي عالم بنا، يعنى إِنَّ المعيَّةَ مَعِيَّةُ العِلْمِ لاَ مَعيَّةُ الفَضْلِ والرَّحْمَةِ (تفسير شبر – سورة التوبة – ٩/٤٠).

سەرنج بدەن: فەزڵو رەحمەتی خودا لە پێغەمبەریش نەفیی دەکەن هەتا ئەبوبەکر بەر نەکەوێ!!

ئەو ئایەتانەی کە لەسوورەتی نووردا، بە ئیتتیفاق بۆ تەبریئەی حەزرەتی عائیشە هاتوون، شیعە دەڵێن: (بۆ تەبریئەی ماریەی قیبطییە هاتوون، کە عائیشە بوختیانی ئەوەی بۆکردووە، کە ئیبراهیم لە پێغەمبەر نییەو لەجریحی قیبطییە!!). (تەفسیری شوببەر – سوورەتی نوور ئایەتی یازدە).

لەهەمووی سەیرتر، بەراز، سەگ، جوولەکە، گاور، مەل، لە ئاسمانیشەوە بەلای، یا بەسەر قەبری حوسەیندا بڕوا، پاك دەبێتەوەو دەچێتە بەهەشت، بەڵام ئەبوبەکرو عومەر هەزار ساڵ زیاترە هاوسێی پێغەمبەرن لەگۆڕدا، کەچی ڕۆژ بەڕۆژ پیستر دەبن!!

شیعە بەئاشکرا دەڵێن: (قورمیش بەسەرۆکایەتی ئەبو سوفیانو چەن کەسێ تر، لەسەرەتاوە هەتا کۆتا هەر خەریکی پیلان کردنبوون، لە موحەممەدو دینەکەی، تەنانەت ژنەکانیشی لەژیانی خۆیداو لەپاش ژیانی خۆشی هەر خەریکی پیلانکردن بوون لێیو لەدڵەوە باوەڕیان پێی نەبووەو (الطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ) نەبوونو بەڵکوو (الخَبِيثَاتُ لِلطَّيِّبِين) بوون!

خوانەخواست، ئەگەر دیدو بیرو باوەڕی گەندەڵی شیعە ڕاست بێو درۆی پەتی نەبێو، دووربا ئیسلام ئەوەبێ کە شیعە دەیڵێنو واتای زۆر لە ئایەتو فەرموودەکان ئەوەبێ کە شیعە دەیڵێن ئەوا:

١- قورئان شانامەی عەلییەو سوننەت لەعنەت نامەیە لە دوژمنانی حوسەین کە بریتین لەزۆرینەی سەحابەکانو سونییەکان بەگشتی!

٢- پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) پێغەمبەری بنەماڵەیەو (رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ) نەبووەو ئەویش وەك هەموو سەرۆك خێڵو ئاغاو دەستەڵاتداریو پادشایەکی تر، هەر خەریکی ئەوە بووە، کە دەستەڵاتو فەرمانداریی، ویراثی بێو تەرخان بێ بۆ کەسوکارەکەی خۆیو بۆ بنەماڵەکەی، هەمووکات بنەماڵەکەی ئاغاو دەرەبەگ بنو ئەو خەڵکەی تر، هەموو مسکێنو نۆکەرو خزمەتکارو کارەکەری ئەوان بنو پێنج یەکی سەرجەمی ماڵی خۆیان بدەن بە کەسوکارەکەی بەناوی خومسەوە!!

بەقسەی ئەم سەر لێشێواوانەبێ، کەسوکارەکەیشی بوون بە (رَحْمَةً لِلْعَالَمِين). چونکە ئەوەتانێ، بەهۆی باوەڕنەبوون بە ویلایەتو ویصایەتو ئیمامەتی ئەوانەوە، لەسەددا نەوەدو پێنجی گەلی ئیسلام، دادەنرێن بەنەواصیبو هەڵگەڕاوە لەئایین، کە ئەم نەواصیبو موناویئانە، زیاتر لە ملیارو چارەکێ موسوڵمان دەبنو زیاتر لەپەنجاو پێنج دەوڵەت دەبن، بەقسەی مەراجیعو کتێبە گەورەکانی شیعە بێ، ئەمانە هەموو دادەنرێن بە نەواصیبو بە مونکری ویلایەتی عەلیو نەوەی عەلیو ناحەزانی ئالوبەیتو لایەنگیرانی جێنشینە زەوتکەرو مورتەددو لەدین هەڵگەڕاوەکانن، کە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو موعاوییەو ئەوانی ترن، هەروا لایەنگیرانی عائیشەو حەفصەو ئوممو حەبیبەن کە هاوسەری پێغەمبەر بوونو دوژمنی عەلیو فاتیمەو خەدیجە

بوون، سەرەڕای هەموو شتێ، ئەم زۆرینەیە، بەهۆی ئەوەوە، کە بەبێ جیاوازی هاوەڵانی پێغەمبەریان هەموو وەك یەك خۆش دەوێ‌و باوەڕیان بە ئیمامەتی دوازدە ئیمامەکە نییە، بەڵکوو مادەم باوەڕیان بە ئیمامەتی ئەوان نییە، واتای وایە کە دوژمنانی ئەوانیان خۆش دەوێ، لەبەرئەوە هەموویان لەحوکمی بێباوەڕدان‌و شایانی ئاگری دۆزەخی هەتا هەتایین‌و خۆزگەیان بەگاورو جوولەکەیە!!

٣- بەقسەی ئەم دەغەز لەدڵانە بێ، جەماوەری صەحابەکانی پێغەمبەر، وەك ئەو وەصفەنین، کە قورئان بۆیان دەکاو شایانی ئەو موژدانە نین، کە قورئان پێیانی داوە، بەڵکوو لەرێکخراوەکانی مافیاو فاشیست دەکەن!!

٤- لەهەمووی سەیرتر، ئەم هەموو غەزەوات‌و فوتوحاتی ئیسلامییە، کە لەسەر دەستی سەحابەو تابیعین‌و ئەهلی سوننەو جەماعەتدا، ئەنجام دروان کە بەهەزاران شەهیدو قوربانی لەپێناویدا دراوە، هیچی شایانی باس‌و یادکردنەوەو رێزو رەحمەت نین‌و بەڵکوو هەندێکیان لەجۆری فەتح نەبوون‌و بەڵکوو داگیرکردن‌و بەکۆیلە کردنی گەلان بوون!! سبحانە اللە! یەك بست لەخاکی ئیسلام هەتا ئێستا بەدەستی شیعە فەتح نەکراوە، وە لەلای شیعە، شتێ نییە، بەناوی (فضائل الصحابة) جگە لە حوسەین‌و ژمارەیەکی کەمی تر، ئەو هەموو شەهیدانە، ئەو گشتە قوربانی‌و فیداکاریە، ئەو هەموو فتوحاتە پیرۆزە هیچی نرخی بزووتنەوەکەی حوسەینی نییە، کە بزووتنەوەیەکی ژێر کەوتوو بوو!!

{وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ – النور – ٢٤/١٦}.

**دوا وته لهم بابهته:**

١- ئێمـەی ئـەهلی سـوننەتو جەماعـەت، کـەس لەئـەهلی قیبلـە، بـەکافر دانانێین، ئەوەی بەزمان بڵێ: {لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّهُ و محمداً رَسُولُ اللّهِ} و بـەدڵ بـاوەڕی پێـی هـەبێ، موسـوڵمانەو بـرای ئـایینی ئێمەیـەو لـە ئـەهلی نەجاتـەو ئێمـە لەلایەنی خۆمانەوە هیچ کێشەیەکمان لەگەڵیدا نییەو، ئەگـەر خـۆی کێشەیەکی ناهەقی لەگەڵ سەحابەو خولەفای راشیدینو هاوسەرەکانی پێغەمبـەرو تێکـڕای موسـوڵمانان هـەبێ، ئـەوە حیـسابو کیتـابو لێپرسـینەوەی لەسـەر خـودای گەورەیە، هەروەها ئەگەر زیادەڕەویو خوارو خێچی لە عەقیدەو بیرو باوەڕیـدا هەبێ، ئەوە خۆیو خوای خۆی، کورتو پوخت: (سەرو سامانو نامووسی ئەوەی خـۆی بـە ئـەهلی قیبلـە بزانـێ، لـەلای ئێمـەی ئـەهلی سـوننەتو جەماعـەت، پارێزراوەو لەم لایەنەوە جیاوازی نییـە لەبـەینی سوننیو شیعەو موعتەزیلـەو کاکەییو لایەنە ئیسلامییەکانی تردا!!).

خۆزگـەم هـەموو لایـەکانی تـریش لـەم رووەوە بـیرو باوەڕیـان وەك ئێمـە وابووایـەو رێگـەیان بـۆ پێکـەوە سـازانو پێکـەوە ژیـانێکی موسـوڵمانانە خـۆش بکردایەو، بەدرۆ بەناوی خۆشەویستی ئەهلی بەیتەوە، بۆ بەرژەوەنـدی تەسـکی خۆیان، ئاگری دوو بەرەکیان خۆش نەکردایە وەك مەلاکانی شیعە وادەکەن.

٢- لەڕاستیدا زۆرینەی عەوامو رەشە خـەڵك، لەهـەموو تـاقمو لایەنـەکانی موسـوڵمانان، وەك سـوننیو شـیعیو زەیـدیو ... تـاد، ئـەم جـۆرە شـیکردنەوەی کوڵكو مووە نازاننو زۆرینەی ئـەم بـیرو باوەڕانـە قـسەی کتێبـە سەرچـاوەکانو مەراجیعە ئایینییەکانو مەزاهیبەکانـە، بـەڵام ئـەمڕۆ بەتایبـەتی بازرگانییـەکی گـەورە، لەمەیـدانی سیاسـەتدا بـە مەزهەبەکانـەوە دەکـرێ، بەتایبـەتی تـر، کەمتەرخەمی سوننییەکان، رێگەو مەودای بـۆ هەڵمـەتو هێـرشو بزووتنـەوەی

بەشـــیعەکردن خـــۆش کـــردووە!! لـــەبارترین چـــەك بەدەســـتی شـــیعەوە، بـــۆ بڵاوکردنەوەی شیعایەتی لەناو لاوان دا إباحیەتی جینسییە بەناوی موتعەوە!!.

٣- پەیڕەوی مەزهەبی جەعفەری صادیق، لەفیقەدا، بەمەرجێ لە سنووری ئیجماعی زانایانی ئیسلام دەرنەچێ، کارێ ڕەوایەو ئەوەیش هیچ کێشەیێ بۆ گەلی ئیسلام دروست ناکا، هەروەك چۆن پەیڕەوی حەنەفیو ئیمامەکانی تر هیچ کێشەیەك بۆ کەسێ دروست ناکەن، چونکە شتی وا هەنگاوێکی گەورەیە بۆ یەکتری قەبووڵکردن!

٤- جێگـــەی داخـــە، ئـــەمڕۆ ســـوننیەکان، گەرچـــی زۆرینـــەن، بـــەڵام نـــە مەرجیعیەتیان هەیە، وە نـەخاوەن، یەکەم دوژمنیـان دەوڵەتـەکانی خۆیانـە، وە پیلانێکی گەورە لەلایەنی سێ صادەکەوە لە دژیان داڕێژراوە کە برێتین لە:

١- صلیبیەت.

٢- صهیونیەت.

٣- صفوییەت.

## (١) باب صِفَةِ الْقِيَامَةِ وَالْجَنَّةِ وَالنَّارِ
## باسی نیشانەکانی قیامەتو بەهەشتو دۆزەخ

١٧٧٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « إِنَّهُ لَيَأْتِى الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ وَقَالَ اقْرَءُوا ( فَلاَ نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ) ». (الحديث ٦٩٧٦ شيحا = ٧٠٠٠ فم. تجريد البخاري باكوردي/٤ رقم:١٦٧٣ = ٤٧٢٩. تحفة الأشراف/١٣٨٧٧).[١٧٧٣]

---

[١٧٧٣] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٧٣ = ٤٧٢٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٤٨ = ٦٩٧٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٩٢ رقم الباب/١٨).

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: لـەرۆژی قیامـەت دا، پیـاوی زل زلی، قەڵـەو قەڵـەو دەهێنن، لەلای خـودا سـەنگی بـاڵی مێـشوولەیەك قـورس نـین و بەقـەد تۆسـقاڵێ دەگەرو قەدرو ڕێزیان بۆ دانانرێ. (ئەم ئایەتە بخوێنن بـۆ پـشتیوانی ئـەم باسـە کە دەفەرموێ: {فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا} (سورة الكهف-١٨/١٠٥).

واتە: لەڕۆژی ژینـەوەدا، نـرخ و بایەخ و دەگەرو ڕێز بۆ ئەو سـەر لێشێواوە ڕەنجـە ڕۆیانە بەقەد تۆسقاڵێ دانانێین! (تاج/٤ ز/١ ژ/٣٩٧٩ - سوورەتی کەهف ج/٤).

١٧٧٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: جَاء حَبْرٌ مِنْ الاحْبارِ الَـى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ انَّا نَجِدُ انَّ اللَّهَ يَجْعَـلُ الـسَّمَوَاتِ عَلَى اصْبَعٍ وَالارَضِينَ عَلَى اصْبَعٍ وَالشَّجَرَ عَلَى اصْبَعٍ وَالْمَاء وَالثرَى عَلَى اصْبَعٍ وَسَائِرَ الْخَلائِقِ عَلَى اصْبَعٍ فَيَقُولُ: (انَا الْمَلِكُ فَضحِكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) حَتَّـى بَدَتْ نَوَاجِذهُ تَصْدِيقًا لِقَوْلِ الْحَبْرِ ثمَّ قَرَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) ﴿وَمَـا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالارْض جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ وَالـسَّمَوَاتُ مَطويَـاتٌ بِيَمِينِـهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾. (الحديث ٤٨١١- اطرافه فـي: ٧٤١٤- ٧٤١٥- ٧٤٥١- ٧٥١٣ ):[١٧٧٤]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ڕەزای خودایان لـێ بێ) فەرمووی: یەکێ لەزانا گـەورەکانی جوولەکـە هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەر،گوتی: ئـەی موحەممـەد! لەتەوراتی ئێمەدا هەیە : کەخودا لە ڕۆژی قیامەت دا ئاسمانەکان دادەنێ لەسـەر پەنجەیێ و زەویەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیێ و دار و درەختەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیێ و ئاو وخاك دادەنێ لەسەر پەنجەیێ وهەموو دروست کراوەکانی تـریش

---

[١٧٧٤] تجریـد/٤، ژمـارە: ١٦٨٩ - ٤٨١١ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٥، ژمـارە: ٢١٦١ - ٦٩٧٧ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٣٩).

دادەنێ لەسەر پەنجەیێ. واتە : بوونەوەر سەرو خواری، بەدەستی توانـایی خـۆی وەك گوێیەك دەگرێ و، ئەوجا بۆ نواندنی جەبرەوشـان‌و شکۆی خـۆی‌و بـەیانی یەکتایی خۆی‌و، بێ نموودیی پادشاو قڕاڵەکانی جیهان دەفـەرموێ: ( پادشـاهەر خۆمم، پادشاکانی سەر زەمین وناو جیهان کوان ولە کوێن بابێنە مەیدان؟! ).

جا پێغەمبەر (دروودی خـودای لـێ بـێ) بـۆ پـشتیوانی قـسەی مالوومەکە وەها پێکەنی، ددانە پێشینەکانی وەدەر کەوتن، لەپاشا حەزرەت(دروودی خـودای لێ بێ) دیسان بۆ نیشانەی ڕاستی قسەکانی مالومەکە ئەم ئایەتەی خوێنـدەوە: ﴿وَمَا قَـدَرُوا اللَّـهَ حَـقَّ قَـدْرِهِ﴾ هـەتا ﴿عمّـا یـشر کون﴾ واتـە : خودایـان —وەکو پێویـستە نەناسـیوە- دەنـا هاوبەشـیان بـۆی دانـەدەنا، ڕۆژی قیامـەت هـەموو زەمینەکان وان لە چنگی ئەودا و وان لەژێر دەسەلاتیدا، ئاسمـەکانیش بەدەسـتی ئـەو پێـچراونەتەوە، خـودا پـاك وبـەرزترەو دوورە لـەوە کـەوەکوو ئـەوان دەڵـێن شەریکی هەبێ ). (تاج/٧ ز/٢٢ ل/١٢٣ ژ/٤ — سوورەتی زومەر ).

ئەم فەرموودەیـە لـە ژمـارە: (٢١٦١)ی پوختـەی موسـلیمدا ئـاوا کـراوە بـە کوردی، بە پێی گێڕانەوەی پێشەوا موسلیم:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه) قَالَ: جَاءَ حَبْـرٌ إِلَـى النَّبِـيِّ -صـلى الله عليه وسلم- فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَوْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُمْـسِكُ الـسَّمَوَاتِ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالأَرَضِـينَ عَلَـى إِصْـبَعٍ، وَالْجِبَـالَ وَالـشَّجَرَ عَلَـى إِصْـبَعٍ، وَالْمَـاءَ وَالثَّرَى عَلَى إِصْبَعٍ، وَسَائِرَ الْخَلْقِ عَلَى إِصْبَعٍ، ثُمَّ يَهُزُّهُنَّ فَيَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَنَـا الْمَلِـكُ. فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- تَعَجُّبًا مِمَّا قَالَ الْحَبْرُ تَصْدِيقًا لَهُ، ثُمَّ قَـرَأَ: (وَمَـا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًـا قَبْـضَتُهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ وَالـسَّمَوَاتُ مَطْوِيَّـاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ). (الحـديث ٦٩٧٧ حـسب تـرقيم الـشيخ مـأمون

شيحا = ٧٠٠١ حسب ترقيم فتح الملهم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية/٤ رقم: ١٦٨٩ = ٤٨١١، ٧٤١٤، ٧٤١٥، ٧٤٥١، ٧٥١٣).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یەکێ لەزانا گەورەکانی جوولەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتی: ئەی موحەممەد! یا گوتی: ئەی باوکی قاسم! لە تەوراتی ئێمەدا هەیە: کەخودای گەورە لەڕۆژی قیامەت دا، ئاسمانەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیێو زەوییەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیێو چیاو دارو درەخت دادەنێ لەسەر پەنجەیێو، ئاوو خاك دادەنێ لەسەر پەنجەیێو، هەموو دروستکراوەکانی تریش دادەنێ لەسەر پەنجەیێ. واتە: بوونەوەر سەرو خواری، بەدەستی توانایی خۆی، وەك تۆپێ دەگرێو، ئەوجا بۆ نواندنی جەبرەو شانو شکۆیو بەیانی یەکتایی خۆیو بێ نموودیو دەستەوسانی پادشاو قڕاڵەکانی جیهان، ڕایاندەوەشێنێو دووجار دەفەرموێ: پادشای تاكو تەنیا هەر خۆمم، پادشاکانی سەر زەمینو ناو جیهان کوانو لەکوێن؟ با بێنە مەیدان.

ئیبنو مەسعوود فەرمووی: پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ پشتیوانی ئەم قسەی مالوومەکەو، بۆ سەر سوڕمان لێی پێکەنیو ئەوجا ئەمەی خوێندەوە:

{وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ} (سورة الزمر-٣٩/٦٧).

واتە: شانو شکۆی خودا گەلێ گەورەو مەزنە، ئەو کافرە دڵو چاو کۆرانە، وەك پێویست بێو شیاوی ڕێزی بارەگای خوداوەندی بێ، ئاوا قەدرو ڕێزی نازانن، دڵمردوو چووزانێ سۆزو ئەشق چییە؟ میثالو نموونەیێ بۆ ئەوەی کە ئێوە لەگەورەییو دەسەلاتی خودا تێ بگەن، ئەمەیە: ئەم زەوییە هەمووی، یەك

مووى كەم نەبىٚ، لەگەڵ هەموو ئاسمانەكانا، وەك گۆيىٚ، وەك هەڵماتىٚ، وایە لەناو چنگى خودادا، خودا پاكو بىٚ گەردو گەلىٚ گەورەيەو بەدووره لەم لاژگە لاژگى بتپەرستانە، كە بڕيارى هاوەڵو كوڕو كچو هاوسەر بۆ خودا دەدەنو ويلايەتى تەكوينى بۆ ئيمامو ميماميان بڕيار دەدەن!. (تاج/٤ ز/٢٢ ژ/٤٠٧٣، ٤٠٧٤، ٤٠٧٤م).

١٧٧٥- حديث أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «يَقْبِضُ اللَّهُ الأَرْضَ ، وَيَطْوِى السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ ، ثُمَّ يَقُولُ أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ»[١٧٧٥]

له ژماره: (١٧٧٣ و ١٧٧٤)دا، واتاو مەبەست لێى ڕابورد.

ئەم فەرموودەى ترى ژمارە: (١٩٤٦)ى پوختەى موسليميش هەر لەم بابەتەيە.

١٧٧٦- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «يَطْوِى اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ السَّمَوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟ ثُمَّ يَطْوِى الأَرَضِينَ بِشِمَالِهِ ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟». {الحديث: ٦٩٨٢ = ٧٠٠٦ فم. بخارى. توحيد: ٧٤١٣}:[١٧٧٦]

ئيبنو عومەر (ڕەزاى خودايان لىٚ بىٚ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) فەرمووى: (لەڕۆژى قيامەتدا خوداى بالاّ دەستو خاوەن شكۆ، ئاسمانەكان وەك تۆمار دەپێچێتەوە، ئەنجا بەدەستى ڕاستى هەڵيان

---

[١٧٧٥] بڕوانه ژماره: (١٧٧٣) و (١٧٧٤) (بخارى رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٤٤).

[١٧٧٦] بخارى. توحيد: ٧٤١٣. پوختەى موسليم/ ١٩٤٦ - ٦٩٨٢ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٩٧ رقم الباب/١٩).

دەگـرێو دەفـەرموێ: پادشـای تـاكو تـەنیای بـێ هاوشـان هـەر خـۆمم، پادشـا زەبردارەكانی سەرزەوی لـەكوێن؟ پادشـا ملهوڕو خۆبەزلزانـەكان كـوان لـەكوێن؟ ئەوجا گۆی زەوی دەپێچێتەوەو بەدەسـتی چەپی دەیكـا بەیـەك چنگو ئـەوجا دەفەرموێ: پادشای تاكو بێ هاوشان هەر خۆمم، پادشا زەبردارەكانی سەر زەوی لـەكوێن؟ پادشـا ملهوڕو خۆبەزلزانـەكان كـوان لـەكوێن؟). {تـاج/٤، زنجـیرە: ٢٢، ژمـارە: ٤٠٧٤ — سـوورەتی زومـەر + ژمـارە: ٤٠٧٤ م + تـاج/٥، زنجـیرە: ١١٩، ژمـارە: ٥٦٤٦ + ژمارە: ٥٦٤٧ — فەرمایشتی خودای گەورەو مەزن لەڕۆژی قیامەتدا}.

## (٢) باب في البَعْثِ وَالنُّشُورِ وَصِفَةِ الأَرْضِ يَوْمَ القِيَامَةِ
## لە بارەی زیندوبوونەوەو بڵاوبوونەوەو شێوەی گۆی زەوی لە ڕۆژی ژینەوە (قیامەت)دا

١٧٧٧- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ النَّقِيِّ، لَيْسَ فِيهَا عَلَمٌ لأَحَدٍ». {الحديث: ٦٩٨٦ = ٧٠١١ فم. تجريد البخـاری بـالكوردی/٥، رقـم: ٢٠٢٧ = ٦٥٢١ فتح الباری}:[١٧٧٧]

سـەهلی كـوڕی سـەعد (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بیـستم لـەزاری پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفـەرموو: (لـەڕۆژی دوا ڕۆژدا، مـەردوم هـەموو لەسـەر زەوییـەكی سـپی مەیلـەو سـوور حەشـر دەكـرێنو لەمەوقیف كۆدەكرێنەوە بۆ لێپرسینەوەو پاداش وەرگرتن، كە ئەو زەوییـە وەك كولێرەی باراشی پاككراوی بێژراوەی بێ سۆسو كەپەك وایە).

---

[١٧٧٧] تجریـد البخـاری = مختـصر صـحیح البخـاری بـالكوردی/٥، ژمـارە: ٢٠٢٧ = ٦٥٢١ بخـاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٤٧ = ٦٩٨٦ شیحا - ترقیم الـشیخ خلیـل مـأمون شیحا لـصحیح مسلم. (بخاری رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٤٤).




**ئاخری ئەم فەموودەیە لە تەجریددا ئاوایە:**

**سەهل (یا یەکێکی تر) لە گێڕەوەکانی ئەم فەرموودەیە فەرمووی: (ئەو زەوییە زەوییەکی تری نوێیە، جیایە لەم عەردەی ئێستای خۆمان، کە ئێستا لەسەری دەژین، لەبەرئەوە نیشانەی خاوەنێتیو پەیوەندیو دیاریکردنی جێگەو ڕێگەی پێوە نییە، بە هەرچوار لادا هەتا چاوبڕبکا، دەشتێکی سافی بێ بەرزیو نزمیو بێ نیشانەو شوێنەوارە). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٥٦٤٤ — حەشر لەسەر زەوییەکی نوێ دەکرێ = الحشر على أرضٍ جَديدة} + {تاج/٤، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٤٠٧٣، ٤٠٧٤، ٤٠٧٤ م — سوورەتی زومەر}.**

**لە ژمارە: (٢٠٢٧)ی تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:**

**عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ قَالَ سَهْلٌ أَوْ غَيْرُهُ لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ لِأَحَدٍ.** (الحديث ٦٥٢١):

**سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لەزاری پیرۆزی پێغەمەر خۆی -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: ( ڕۆژی قیامەت، مەردوم هەموو لەسەر زەمینێکی سپی مەیلەو سوور، حەشر دەکرێن، کەوەك کولێرەی باراشی پاك کراوی بێژراوەی بێ سۆسو کەپەك وایە).**

**سەهل —یایەکێکی تر— لەگێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە فەرمووی: (ئەو زەوی یە، زەوی یەکی تری نوێ یە جیایە لەم عەردەی ئێستای خۆمان، کەئێستا لەسەری دەژین لەبەر ئەوە نیشانەی خاوەنێتیو پەیوەندیو دیاریکردنی جێگەو ڕێگەی پێوە نییە، بەهەر چوارلادا هەتا چاو بڕکا، دەشتێکی سافی بێ بەرزیو نزمیو بێ نیشانەو شوێنەوارە). (تاج/١٠ ل/٣٦٠ ز/١١٨ ژ/٢ ش— حەشر لەسەر زەوییەکی نوێ دەکرێ).**

## (٣) باب نُزُلِ أهْلِ الجَنَّةِ
## يەكەم قاوەڵتوونی بەهەشتییەكان

١٧٧٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَكُونُ الْأَرْضُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ خُبْزَةً وَاحِدَةً يَتَكَفَّؤُهَا الْجَبَّارُ بِيَدِهِ كَمَا يَكْفَأُ أَحَدُكُمْ خُبْزَتَهُ فِي السَّفَرِ نُزُلًا لِأَهْلِ الْجَنَّةِ فَأَتَى رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ بَارَكَ الرَّحْمَنُ عَلَيْكَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ أَلَا أُخْبِرُكَ بِنُزُلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ بَلَى قَالَ تَكُونُ الْأَرْضُ خُبْزَةً وَاحِدَةً كَمَا قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَظَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْنَا ثُمَّ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ ثُمَّ قَالَ أَلَا أُخْبِرُكَ بِإِدَامِهِمْ قَالَ إِدَامُهُمْ بَالَامٌ وَنُونٌ قَالُوا وَمَا هَذَا قَالَ ثَوْرٌ وَنُونٌ يَأْكُلُ مِنْ زَائِدَةِ كَبِدِهِمَا سَبْعُونَ أَلْفًا. (الحديث ٦٥٢٠):[١٧٧٨]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر -درووودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ڕۆژی ڕەستا خێز (قیامەت) گۆی زەوی دەبێ بەیەك كولێرە، خودا وەندی بەزەبرو زەنگ، بەدەستی خۆی ئەم دەستاو ئەو دەستی پێ دەكا، وەكوو چۆن یەكێ لەئێوە لەسەفەرا، كولێرە بنئاگرە لەبن ئاگردا دەبرژێنێ‌و، كە دروستی دەكا، ئەم دەستەو ئەو دەستی پێ دەكا، هەتا تۆزێ پان ببێتەوە ئاوا، خودا ئەم كولێرەی گۆی زەوی یە دەكا بەنانی میوانداریی بۆ بەهەشتیەكان، لەئێستگای مەحشەردا بەر لەچوونە بەهەشت، وەك بەركوڵ دەیخۆن! لەو كاتەدا، پیاوێكی جوولەكە هات گوتی: ئەی باوكی قاسم! خودا پێت‌و فەڕ بەسەرتا بڕێژێ، باعەرزت بكەم كە لەرۆژی قیامەتا یەكەم زیافەتی بەهەشتیەكان چییە؟ فەرمووی: (ئادەی بڵێ) گوتی: گۆی زەوی دەبێ بەتاقە كولێرەیەك. جوولەكەكەش فەرمایشتەكەی پێغەمەری، سەبارەت

---

[١٧٧٨] تجريد البخاری/٥، ژمارە: ٢٠٢٦ - ٦٥٢٠ بخاری. مسلم: ٦٩٨٨ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٤٤).

بەبوونی زەوی بەکولێرە دووبارە کردەوە. پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- تەماشایەکی واتا بەخشی ئێمەی کردو تەواو پێکەنی، هەتا خری پاشینەکانی وەدەرکەوتن، چونکە قسەی جوولەکەکە گوتەی تەورات بوو، ڕێکی فەرمایشتەکەی پێغەمبەر بوو، پاشان جولەکەکە گوتی: باپێت بڵێم‌و عەرزت بکەم کەپێخۆرەکەشیان چییە؟!، کابرای جووە گوتی: پێخۆرەکە یان بالام‌و نوونە، هاوڕێیان فەرموویان: بالام چییەو نوون چییە؟ کابرای جووە گوتی : بالام گاجووتەو نونیش ماسی‌و نەهەنگە، لەپارچە گۆشتە زیادەکەی جگەری ئەم دوانە، کە خۆشترین پارچە یانە، حەفتا هەزار بەهەشتی لێ ی دەخۆن). (تاجی کوردی/١٠ ل/٣٦٠ ز/١١٨ ژ/٣ -باسی حەشر لەسەر زەوییەکی نوێ دەکرێ) + (تاج/١٠ ل/٤٧١ ز/١٤٧ ژ/١ باسی یەکەم خۆراك‌و یەکەم خواردنەوەی خەڵکی بەهەشت) + (تاجی کوردی/٦ ل/١١ ز/٣ ژ/٧ -تەفسیری سوورەتی بەقەرە).

١٧٧٩- حديث أَبِى هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِىِّ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ « لَوْ آمَنَ بِى عَشَرَةٌ مِنَ الْيَهُودِ لآمَنَ بِى الْيَهُودُ »[١٧٧٩]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دە کەس هەن لە ناوداران‌و زنایانی جوولەکەکان، ئەگەر ئەو دە کەسە باوەڕم پێ بکەن‌و ئیمانم پێ بهێنن، جوولەکە هەموویان ئیمانم پێ دەهێنن).

---

[١٧٧٩] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٩٤١، مسلم: ٦٩٨٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٣ رقم الباب/٥٢).

## (٤) باب سؤال النَّبِيَ ﴿ﷺ﴾ عَنِ الرُّوحِ، وَ قولِهِ تعالى ﴿وَ يَسألُونَكَ عَنِ الروحِ﴾ الآيَة

## پرسیار له پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەکرێ سەبارەت بە گیان کە چییە، وەك هاتووە لەم ئایەتەدا ﴿وَ يَسأَلُونَكَ عَنِ الروحِ﴾ الآيَةَ

١٧٨٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أَمْشِى مَعَ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- فِى حَرْثٍ وَهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَى عَسِيبٍ إِذْ مَرَّ بِنَفَرٍ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ، فَقَالُوا: مَا رَابَكُمْ إِلَيْهِ لاَ يَسْتَقْبِلُكُمْ بِشَىْءٍ تَكْرَهُونَهُ؟. فَقَالُوا: سَلُوهُ، فَقَامَ إِلَيْهِ بَعْضُهُمْ فَسَأَلَهُ عَنِ الرُّوحِ، قَالَ: فَأَسْكَتَ النَّبِىُّ -صلى الله عليه وسلم- فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ شَيْئًا، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ، قَالَ: فَقُمْتُ مَكَانِى، فَلَمَّا نَزَلَ الْوَحْىُ قَالَ: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً). (الحديث ٦٩٩٠ = ٧٠١٥ فم. تجريد البخاري/١ رقم: ١٠٣ = ١٢٥، ٤٧٢١، ٧٢٩٧، ٧٤٥٦، ٧٤٦٢ فتح الباري للعسقلاني شرح صحيح البخاري. ترمذي. تفسير القرآن. ٣١٤١. تحفة الأشراف: ٩٤١٦).[١٧٨٠]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود، کە ناسراوە بە ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەمەدینە لەخزمەتی خۆشەویست دا بووم (دروودی خوای لەسەربێ) لەناو باخە خورمایەکا دەڕۆیشتین، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پەلکەدار خورمایەکی پێ بوو، لەکاتی ڕۆیشتن دا، خۆی دەدا بەسەری دا، لەلای دەستەیێ جوولەکەوە ڕابورد، بازێکیان گوتیان: بۆ پرسیارێ لە موحەممەد نەکەین، بازێکی تریان گوتیان: پرسیاری لێ مەکەن، نەبادا وەڵامەکەیتان بەدڵ نەبێ، لەپاش دا گوتیان: ئەی باوکی قاسم! قسەی ڕۆحمان بۆبکە، ڕۆح (کەگیانی گیانلەبەرە) چییە؟

---

[١٧٨٠] تجريد البخاری/١، ژمارە: ١٠٣ = ١٢٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٤٤ = ٦٩٩٠ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٣ رقم الباب/٤٧).

جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) تاوێ ڕاوەستاو ڕاما، ئەوجا سەری بەرز کردەوە، زانیم کە ئەوە سرووشی بۆهات، ئەوجا فەرمووی: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً} (سورة الإسراء-١٧/٨٥).

واتە: پرسیارت لێ دەکەن لەحەقیقەتو ڕاستینەی ڕۆح، لەکونهوماهییەتو چییەتی ئەو شتە کەپێی دەڵێن گیان، کە گیاندار بەبوونی ئەوشتە گیاندارەو زیندووەو بەنەبوونی ئەو شتە بێ گیانەو مردووە، لەوەڵامیانا بڵێ: ڕۆح لەوشتانەیە کە بەهۆی فەرمانی خوداوە پەیدا دەبێ، ئێوە نایزانن‌و تێی ناگەن، لەسنووری هۆش‌و فامی ئێوە بەدەرە، لەمەیش سەرتان سوورنەمێنێ، چونکە ئەوەی ئێوە دەیزانن لەچاو ئەوەی کەخودا دەیزانێ زۆر زۆر کەمە). (تاج/٤ ز/١٨ ژ/٣٩٦٩ چ/٤).

١٧٨١- عَنْ خَبَّابٍ قَالَ كُنْتُ قَيْنًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَكَانَ لِي عَلَى الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ دَيْنٌ فَأَتَيْتُهُ أَتَقَاضَاهُ قَالَ لا أُعْطِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ لا أَكْفُرُ حَتَّى يُمِيتَكَ اللَّهُ ثُمَّ تُبْعَثَ قَالَ دَعْنِي حَتَّى أَمُوتَ وَأُبْعَثَ فَسَأُوتَى مَالا وَوَلَدًا فَأَقْضِيكَ فَنَزَلَتْ أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لأوتَيَنَّ مَالا وَوَلَدًا أَطَّلَعَ الْغَيْبَ أَمْ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا) (الحديث٢٠٩١، أطرافُهُ في: ٢٢٧٥، ٢٤٢٥، ٤٧٣٢، ٤٧٣٣، ٤٧٣٤، ٤٧٣٥):[١٧٨١]

خەبابی کوڕی ئەرەتت(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی نەفامی دا لە مەککە ئاسنگەر بووم، شمشێرێکم بۆ عاصی کوڕی وائلی ئەل سەهمی بەقەرز دروست کرد، دوایی چووم داوای هەقدەستەکەیم لێ کرد،

[١٧٨١] تجرید/٢، زمارە: ٩٤٩ = ٢٠٩١ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، زمارە: ٢١٥٠ = ٦٩٩٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٢٩).

گوتی: ناتدەمێ هەتا لە موحەممەد هەڵنەگەڕێیتەوە، منیش گوتم: بەخودا قەت لــە دینــی موحەممــەد هەڵناگەڕێمــەوە، نەبەزینــدویی‌و نەبــەمردویی‌و نەئــەو کاتەیش کە خودا تۆ دەمرێنێ‌و لەپاشدا لەقیامەتــدا زینــدووت دەکاتــەوە! عــاص بەئیــستیهزاو بەتەوســەوە گــوتی: کــەوابو ئێــستا وازم لــێ بێنــە هــەتا دەمــرم‌و زیندودەبمەوە، ئەگەر ئەمە وابێ دیارە ئەو کاتــەش مــاڵ‌و منــاڵم دەبــێ، جــا ئــەو حەلــە وەرە قەرزەکــەت دەدەمــەوە! جــا بــەم بۆنەیــەوە ئــەم ئایەتــە دابــەزی: ﴿أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا * أَطَّلَعَ الْغَيْبَ أَمِ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا﴾ مەریەم/١٩/٧٧-٧٨ واتە: دەبێ حاڵی شڕی ئــەو کابرایــە چۆن بــێ، کــە گاڵتــەی بەقــەبرو قیامــەت دێ‌و، بەتەوســەوە بەموســوڵمانان دەڵــێ: مــن لەقیامەتیشا ماڵ‌و مناڵم دەبێ ئەگەر حەقێــکتان لەسەرمە، پەلەم لــێ مەکەن لەوێ دەتاندەمەوە! دیارە کەئەم کابرایــە غــەیبزان نییــەو، ئەوەنــدەش پیاوێــکی پیرۆزو پاك نییە، کە عەهدو پەیمانی وای لە خوای میهرەبان وەرگرتبێ، کەواتە باگاڵتــەی بــەئایینی ئێمــە کردبــێ، ڕۆژێ دێ لــەدیوانی خــوادا خــۆی بــەتاوانباری دەبینێتەوە. (تاج/٧/٢٣ف-٦ سوورەتی مەریەم).

### قسەیەکی نەستەق:

دەڵێن: جارێ پیــاوێ لەمەولــەوی (ڕەحمــەتی خــودای لــێ بــێ) دەپرســێ: قوربان! کەسێ بزنێ بــدزێ لەقیامەتــدا چــی لــێ دەکــەن؟ مەولــەوی دەفــەرموێ: دادگایی دەکەن‌و نامەی کرداری، کەفریشتەکان لەسەریان نوسیوە دەهێنن‌و بــۆی دەوردەکەنەوە بەپێی ئەوە سزای دەدەن!

کــابرا دەڵــێ: مــن ئــەو فریــشتانەم بەشــایەت قبــووڵ نییــە، ئــەوان خــودا هەرچیان پێ بفەرمووێ ئــەوە دەنووســن، مەولــەویش دەیــەوێ شــتەکە لــەکورتی




ببڕێتەوە، دەڵێ: ئەوکاتە خودا بزنەکە زیندوو دەکاتەوەو دەیهێنێتە زوبانو دێت شایەتیت لێ دەدا! کابرایش دەڵێ: جامنیش ریشی بزنەکە دەگرمو دەیدەمەوە دەستی خاوەنەکەیو دەڵێم: ها برا! ئەوە بزنەکەت ئیتر ئەم شایەتو شایەتکارییەی پێ ناوێ!

بەڵام ئەم قسەیەی کابرای دزە لەساویلکەییەوەیە، نەوەك وەك قسەکەی عاصی کوڕی وائیل، لەلەنامەتەوە بێت.

## (٥) باب في قوله تعالى: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ﴾
## باسی فەرمایشتی خودای گەورە: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ﴾

١٧٨٢- عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: ( اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ) فَنَزَلَتْ ( وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ * وَمَا لَهُمْ أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ) الآيَةَ . (الحديث ٦٩٩٥ شيحا = ٧٠٢٠ فم. بخاري. تفسير: ٤٦٤٨، ٤٦٤٩. تحفة الأشراف: ٩٧٩).[١٧٨٢]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەبوجەهل گوتی: خودایە! ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو هەقەو نامەی تۆیە، ئەوا ئێمە باوەڕمان پێی نییەو قەبووڵمان نییە، دەی لەتۆڵەی ئەو بێباوەڕییەدا بەردەبارانمان بکەو بەردببارێنە بەسەرمانا، یا سزایەکی زۆر سەختمان بۆ بنێرە، چونکە ئێمە پەسەندی ناکەین، وەلێمان روونە کەئەمە لەلایەنی تۆوە نییە، بۆیە وا ئەم دووعاو نزای شەڕە لەخۆمان دەکەین.

---

[١٧٨٢] بخاری. تفسیر: ٤٦٤٨ پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٤١ = ٦٩٩٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٨).

فەرمووی: کە ئەبوجەهل‌و کۆمەڵە پیسەکەی، ئەم نامە قوڵییەیان کرد، خودای گەورەو سەروەر ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاء أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ، وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ، وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمُ اللّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُواْ أَوْلِيَاءهُ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ} (سورة الأنفال-٨/٣٢-٣٤).

واتە: ئەونامەردانە دەڵێن: خودایە! ئەگەر موحەممەد پێغەمبەری تۆیەو ئەم قورئانە ڕاستەو فەرموودەی تۆیە، ئەوا لەئاسمانەوە بەردە بارانمان بکەو تازووە بنەبڕمان بکە، بەهەر سزاو تۆڵەیەکی سەخت کە تۆ بۆمان بنێری پێی قاییلین، بەڵام ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! تۆ مایەی ڕەحمەت‌و خێرو خۆشی بۆعالەم، لەبەر ئەوە خوداشتی واناکاو هەتا تۆ ماوی‌و تۆ لەناویانابیت، بەپیت‌و فەڕو بەرەکەتی وجوودی تۆوە خودا سزایان نادات، هەروەها لەبەرئەوەیش سزاو عەزابیان نادا، چونکە لەکاتی تەواف‌و هەڵسووڕان، بەدەوری کابەدا، کەماڵی خودایەو خانەی میهرەبانەو جێگەی ئەمن‌و ئاسایش‌و هێمنییە، لەخودا دەپاڕێنەوە داوای لێ خۆشبوونی لێ دەکەن، دەنا ئەگەر لەفەڕو بەرەکەتی تۆو لەپیت‌و فەڕی دووعای ئیستیغفارەوە نەبێ، ئەم نەگبەتانە چی چاکەو پیاوەتیەکیان هەیە کەلەبەر ئەوە خودا سزایان نەدا، بەپێچەوانەوە نەک هەرچاکەیان نییە بەڵکوو خراپەشیان زۆرەو بەپێی سەگە، ئەوەتانێ سەرەڕای کوفرو فرە خوایی، ڕێگەی هاموشۆو تەوافی تۆو موسوڵمانان قەدەغە دەکەن لەوە: کە بەسەربەستی لەناو مەسجیدولحەراما پەرستشی خۆتان بکەن، لەگەڵ ئەوەشا کەئەمانە ئەو حەقەیان نییە، چونکە خۆ ئەوان خاوەن کارو

کاربەدەستی کەعبە نین، چونکە سەرپەرشتیارو کاربەدەستانی ئەو خانە پیرۆزە دەشێ لەخودا ترسەکان بن‌و ئەوانیش زۆر لەخودای گەورە دوورن! بەلام دلنیابە ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! کە زوربەی ئەوانە سەرکەشی‌و لاساریی کوێری کردوون‌و ئەم زانستە جوانە نازانن. (رێك وەك ملهوڕەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە). (تاج/٤ ز/٩، ژ/٣٨٨٣ – سوورەتی ئەنفال).

**روونکردنەوە:**

**پوختەی ڕاڤەی ئەم ئایەتە ئاوایە:**

١- بێباوەڕانی مەککە، بەسەرۆکایەتی ئەبوجەهل‌و نەضری کوڕی حاریث، تەحەددای پێغەمبەریان کردو گوتیان: خودایە یادینی ئێمە، یا دینی موحەممەد، ئەگەر دینی موحەممەد راستە ئێمە پێی رازی نین‌و بەچی سزامان دەدەیت پێی ڕازین.

٢- خودای گەورە بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە:

أ- دینی موحەممەد ڕاستەو لەمنەوە هاتووە بۆی.

ب- ئێوە شایانی سزاو تۆڵەی سەختن، چونکە ئایینی راست‌و دروستی من قەبووڵ ناکەن‌و بەرپەرچی دەدەنەوە.

ج- ئێوە شایستەی سزای سەختن چونکە پێغەمبەری من‌و پەیڕەوانی لەتەوافی خانەی خوداو پەرستش لەناویا قەدەغە دەکەن، بێ ئەوە کە ئێوە مافی ئەو قەدەغەکردنەتان هەبێ، چونکە ئێوە خاوەنانی کاروباری کەعبە نین، بەڵکوو خاوەنانی کاروباری کەعبە ئەوانەن، کەلەخودا دەترسن، پارێز لەگوناه دەکەن بەلام ئێوە تا بینە قاقاتان نوقمە لەگوناهو تاوانا.

٣- بەڵام هۆی ئەوە کە خودا سزایان نەداو نزا شەڕەکەیان کەلەخۆیانی دەکەن گیراناکا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دوو هۆکارە:

أ- لەبەرئەوەی کە تۆ لەناویانـدای لەبەرەکەتی بوونی تۆوە، سزاداناباریێ بەسەریانا، چونکە تۆ (رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ)ی ئەی موحەممەد!

ب- لەبەرئەوەیش سزانادرێن، چونکە لەکاتی تەوافا بەدەوری کەعبەدا لەخودا دەپاڕێنەوەو داوای لێبووردنی لێ دەکەن.

واتە: ئەگەر بەهۆی ئەم دوو هۆکارەوە نەبێ ئەوان شایانی سزای سەختن، بەڵام بەهۆی ئەم دووشتەوە سزانادرێن!.

## (٧) بابُ الدُّخَانِ
## باسی دوکەڵەکە

١٧٨٣- عَن عَبْدِاللّٰه بن مسعود (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا رَأَى مِنْ النَّاسِ إِدْبَارًا قَالَ: (اللّٰهُمَّ سَبْعٌ كَسَبْعِ يُوسُفَ) فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ كُلَّ شَيْءٍ، حَتَّى أَكَلُوا الْجُلُودَ وَالْمَيْتَةَ وَالْجِيَفَ وَيَنْظُرَ أَحَدُهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرَى الدُّخَانَ مِنْ الْجُوعِ. فَأَتَاهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّكَ تَأْمُرُ بِطَاعَةِ اللّٰهِ وَبِصِلَةِ الرَّحِمِ، وَإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللّٰهَ لَهُمْ، قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: (فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ- إِلَى قَوْلِهِ إِنَّكُمْ-عَائِدُونَ. يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى) إِنَّا مُنْتَقِمُونَ فَالْبَطْشَةُ يَوْمَ بَدْرٍ، وَقَدْ مَضَتْ الدُّخَانُ، وَالْبَطْشَةُ، وَاللِّزَامُ، وَآيَةُ الرُّوم. (الحديث: ١٠٠٧-أطرافه في: ٤٨٢١، ٤٨٢٠، ٤٨٠٩، ٤٧٧٤، ٤٧٦٧، ٤٦٩٣، ١٠٢٠، ٤٨٢٥، ٤٨٢٤، ٤٨٢٣، ٤٨٢٢): [١٧٨٣]

---

[١٧٨٣] تجريد البخاری/١، ژمارە: ٥١٨ = ١٠٠٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٦٣ = ٦٩٩٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٤٤).

عەبــدوڵلای کــوڕی مــسعود (ڕەزای خــوای لــێ بــێ) فــەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ ڕوانی کەخـەڵکی مەککە ملنـادەن و درەنگ ئیسلام دەبن نزای شەڕی لێ کردنو فەرمووی: (خودایە! تۆڵەجیاتی مـن چـاری ئـەم لـەخودا یاخییانـە بکـە، بەحـەوت سـاڵ قـاتو قـڕی یاریـدەم بـدە بەسەریانا، کەوەك حەوت ساڵە گرانی یەکەی کاتی یووسف پێغەمبەروابن!).

ئـیتر تووشـی قـاتو قڕییـەکی وەهـابون هەرمەپرسە، قـڕی خـستە هـەموو شتێکیان، تەنانەت لەبرسانا کەوڵو پێستەو مردارو کەلاکی گـەنیویان دەخـوارد. وەلەبەر بێ هێزیو برسێتی، مرۆڤ چاوی ڕێشکەو پێشکەی دەکـرد، بـەرەنگێکی واکـە تەماشـای ئاسمـانی دەکـرد، لەبرسـانا ئاسمـان لەبـەر چـاوی تـەمو دووکـەڵی دەکرد.

هەتا ئەبو سوفیان هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی موحەممەد! خۆتۆ لای خۆی فەرمان بەفەرمانبـەریی خـودا دەکـەیو، هـەروا بـەخزم دۆسـتی،کەچـی بەپێـچەوانەوە وابـەهۆی نـزای شـەڕی تـۆوە، زۆر کـەس لـەهۆزی تـۆ وا لەبرسـانا فـەوتاون، دەی ئەمـەت لەچـیو ئـەوەت لەچی،کەواتـە تازووە بۆیان بپاڕێرەوە کەخودا بارانیان بۆ ببارێنێ.

جاخودای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خـوارەوە: (فَارتَقِـب یَـومَ تـأتِي الـسَّماءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ) هەتا (عَائِدُون یَومَ نبطشُ البَطشَةَ الکبری).

ئیبنـو مەسعود (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: مەبەسـت لـە (البَطـشةَ الکبری) لەم ئایەتەدا، کەخودا هەڕەشەی پێدەکات، ئەو هەڵمەتـە گەورەیـە بـوو، کەلەڕۆژی غەزای بەدردا ڕووی دا، کەخودا زەبرو زەنگێکی وای نواندو، گورزێکی جەرگبڕی وای وەشاند لەبێبڕوایان، پێی تەمێ خوار بوون. دیارە کە ئەل- بطشە و هەڵمەتە گەورەکەیش،وەك مەسەلەی دوخـانو تـەمو دووکەڵەکـەو مەسـەلەی

(اللزام) کەلەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە، کە دەفەرمووێ: (فَسَوفَ يَكُونُ لِزَاماً) (الفرقان: ٧٧) هەروا داستانی شەڕی رومو فوورس، ئەمانە کەلەچەند ئایەتێکا ئاماژەیان بۆ کراوە، هەموویان لەمەوپێش ڕوویان داوە. (تاج/٦/٢٤٨/٤).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە: (٢١٦٣)ی پوختەی موسلیمە، سوودو بەهرەی پترى واتيادا، نووسينی هۆی ڕەحمەتو بەرەکەتە:

عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ جُلُوسًا وَهُوَ مُضْطَجِعٌ بَيْنَنَا فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّ قَاصًّا عِنْدَ أَبْوَابِ كِنْدَةَ يَقُصُّ وَيَزْعُمُ أَنَّ آيَةَ الدُّخَانِ تَجِيءُ فَتَأْخُذُ بِأَنْفَاسِ الْكُفَّارِ وَيَأْخُذُ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ كَهَيْئَةِ الزُّكَامِ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ وَجَلَسَ وَهُوَ غَضْبَانُ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا اللَّهَ مَنْ عَلِمَ مِنْكُمْ شَيْئًا فَلْيَقُلْ بِمَا يَعْلَمُ وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ فَإِنَّهُ أَعْلَمُ لأَحَدِكُمْ أَنْ يَقُولَ لِمَا لاَ يَعْلَمُ اللَّهُ أَعْلَمُ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ لِنَبِيِّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) (قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ) إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لَمَّا رَأَى مِنَ النَّاسِ إِدْبَارًا فَقَالَ « اللَّهُمَّ سَبْعٌ كَسَبْعِ يُوسُفَ ». قَالَ فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى أَكَلُوا الْجُلُودَ وَالْمَيْتَةَ مِنَ الْجُوعِ وَيَنْظُرُ إِلَى السَّمَاءِ أَحَدُهُمْ فَيَرَى كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ فَأَتَاهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّكَ جِئْتَ تَأْمُرُ بِطَاعَةِ اللَّهِ وَبِصِلَةِ الرَّحِمِ وَإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللَّهَ لَهُمْ - قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ) إِلَى قَوْلِهِ (إِنَّكُمْ عَائِدُونَ ). قَالَ: أَفَيُكْشَفُ عَذَابُ الآخِرَةِ؟! (يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنْتَقِمُونَ) فَالْبَطْشَةُ يَوْمَ بَدْرٍ وَقَدْ مَضَتْ آيَةُ الدُّخَانِ وَالْبَطْشَةُ وَاللِّزَامُ وَآيَةُ الرُّومِ. (الحديث ٦٩٩٧ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٧٠٢٢ حسب ترقيم فتح الملهم شرح صحيح مسلم. تجريد البخاري بالكوردي/١. رقم: ٥١٨ = ١٠٠٧، ١٠٢٠، ٤٦٩٣، ٤٧٦٧، ٤٧٧٤،

٤٨٠٩، ٤٨٢٠، ٤٨٢١، ٤٨٢٢، ٤٨٢٣، ٤٨٢٤، ٤٨٢٥. ترمـــذي. تفـــسير القـــرآ: ٣٢٥٤. تحفة الأشراف: ٩٥٧٤).

مەسرووق (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت حەزرەتی ئیبنو مەسعوود دا دانیشتبووین، ئەو لەنێوانمانا ڕاکشا بوو، پیاوێ هات بۆلای گوتی: ئەی باوکی ئەوڕەحمان! ئامۆژگاریخوێنێ لەدەروازەی کیندە، کە دەرگایەکە لەدەرگاکانی شاری کووفە، وەعظو ئامۆژگاری دەخوێنێ، دەڵێ گوایە: نیشانە گەورەکەی دووکەڵەکە، کەلەم ئایەتەدا باسکراوە {يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ} دەڵێ: ئەم نیشانەی دووکەڵە هێشتا نەهاتووە، لەمەو دوا دێ، کاتێ دێ بەری هەناسەی ناموسوڵمان دەگرێو پشووی لێ دەبڕێ وەك سەرخۆشی لێ دەکا، دووکەڵ لەکونە لووتیو گوێچەکەیو کۆمی دەردەچێ، بۆ موسوڵمانیش وەك هەلامەتێ بگرێ وایە. مەسرووق فەرمووی: جا ئیبنو مەسعوود توڕەبوو لەم قسەیەو هەڵسا ڕێك دانیشتو فەرمووی: ئەی موسوڵمانەکان! ئەی خەڵکینە! لەخودا بترسن، لەخۆتانەوە، بەبێ بەڵگەی ڕۆشن، شت بەدەم خوداو پێغەمبەرەوە بڵاو مەکەنەوە، هەرکەسێ لەئێوە کەشتێ دەزانێ، بابیڵێو بەخەڵکی تری ڕابگەیەنێ بەجوانی، بەڵام ئەگەر کەسێ شتێکی نەدەزانی باشەرم نەکاو بڵێ نایزانم، خوا بۆخۆی دەیزانێ، چونکە نیشانەی زانایيو دانایی کەسێ لەئێوە ئەوەیە: شتێ کەخۆی نایزانێ بڵێ: خوا ئەیزانێ. (تاج/٤ ز/٢١ ژ/٤٠٦٩ – سوورەتی ص). ئیبنو مەسعوود فەرمووی: ئەوەتا خودای گەورە لەم ئایەتەدا بەوە فەرمانمان پێ دەکاو دەفەرموێ: {قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ } (سورة ص-٣٨/٨٦)

واتە: ئەی خۆشەویست! ئەی موحەممەد! بفەرموو: داوای کرێو مزوشتی واتان لێ ناکەم، لەباتی ڕاگەیاندنی قورئانو پەیامی ئیسلام بەئێوە، لەهەمان کاتا من لەو جۆرە کەسانە نیم، شتێ کە نەیزانم، بەزۆر بڵێم دەیزانم!

ئیبنو مەسعوود فەرمووی: قسەی ڕاستو دروست سەبارەت بەم دووکەڵەی کەلەم ئایەتەدا باسکراوە، ئەمەیە کە من ڕوونی دەکەمەوە بۆتان: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کاتێ ڕوانی کە قوریشو خەڵکی مەککە مل نادەنو درەنگ ئیسلام دەبن، نزای شەڕی لێ کردنو فەرمووی: خودایە! تۆ لەجیاتی من چاری ئەم لەخودا یاخییانە بکەو بەحەوت ساڵ قاتوقڕی یاریدەم بدە بەسەریانا، کەوەك حەوت ساڵە گرانییەکەی کاتی یووسف پێغەمبەر وابێ. ئیتر نزاکەی پێغەمبەریان لێ گیرابوو، وە تووشی وشکە ساڵیو گرانیو قاتوقڕییەکی وەها بوون هەرمەپرسە، قڕی خستە هەموو شتێکیان، تەنانەت لەبرسانا کەوڵو پێستەو مردارو کەلاکی گەنیویان دەخوارد. وەلەبەر بێ هێزیو برسێتی، مرۆڤ چاوی ڕێشکەو پێشکەی دەکرد، بەڕەنگێکی وا کەتەماشای ئاسمانی دەکرد، لەبرسانا لەبەرچاوی تەمو دووکەڵی دەکرد.

هەتا ئەبوسوفیان، کە ئەوکاتە سەرۆکی بتپەرستەکانی مەککە بوو هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتی: ئەی موحەممەد! خۆتۆ لەلای خۆت، فەرمان دەکەی بەفەرمانبەرییو تاعەتی خوداو، هەروا بەخزم دۆستیو پەیوەندی خزمایەتی، کەچی بەپێچەوانەوە، وا بەهۆی نزای شەڕی تۆوە، زۆرکەس لەهۆزی تۆ لەبرسانا فەوتانو لەناو چوون، دەی ئەمەت لەچیو ئەوەت لەچی، کەواتە تازووە بۆیان بپاڕێرەوە کەخودا بارانیان بۆ ببارێنێ.




جا خودای گەورە بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: {فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَـأْتِي الـسَّمَاء بِـدُخَانٍ مُّـبِينٍ، إِنَّـا كَاشِـفُو الْعَـذَابِ قَلِيلًـا إِنَّكُـمْ عَائِـدُونَ} (الـدُّخان-٤٤/١٠-١٥)

واتە: جا تۆ چاوەنواڕی ئەو ڕۆژەیە بکە، کەلەبەر وشکە ساڵیو بێ بارانی، تـەمو مـژو تـەپوتۆزێکی ڕەشـی بـەدرەزا، لەچەشـنی دووکـەڵ، ڕووی ئاسمـان دادەگرێ، مەردوم دەگرێتە ناوو دایان دەپۆشێ، لـەتاوانا دەڵێن: ئەمـە سـزایەکی خودایی ئاشکرایە، بەئێشو بەسوێ یە، ئەی خودای ئێمە! ئەگەر ئەم سـزایەمان لەسەر لابەری، ئەوا باوەڕدەهێنین بەموحەممەدی پێغەمبەری تۆ، بەڵام دڵنیابن کاتێ ئەم سزایە هات بۆیان، دیسان بـاوەڕ نـاهێنن، ئەگـەر بیـشی هێـنن سـوودی نابـێ بۆیـان، چـونکە ئـەوان بـەو هـەموو بەڵگـەو مـوعجیزە گەورانـەی کـە موحەممەد بۆیهێنان، لەبارو دۆخێکی ئاساییدا، بەوانە باوەڕیان نەهێناو بەڵکوو دەیانگوت: لاوێکی بیانی ئەم قسانەی فێردەکاو ئەم قورئـانو دینـە قـسەی خـۆی نییەو خەڵکی تر فێری دەکەن، یا دەیانگوت: موحەممەد شێت بـووە، دەنـا چۆن قسەی وادەکا، دەی لـەبارو دۆخـی ئاسـایی دا ئەمـە قـسەیان بـێو بـاوەڕ نـەهێنن دەبێ لەبارودۆخی پەرێشانیو شپرزەیی دا چی بڵێنو چۆن موسوڵمان ببن؟

ئەی موحەممەد! بەپیتو فەڕی نزای تۆوە، کەلەخودا داواتکرد کە وشکەساڵییەکەیان لەسەر لابەرین، کەمێ ئەم سزایەیان لەسەر لادەبەین، وە ئێوە ئەی بێ باوەڕینە! بەبێگومان دەگەڕێنەوە بۆسەر کوفرو بێباوەڕییەکەتان.

مەسرووق فـەرمووی: جـا ئیبنـو مەسـعوود لـەپاش ئـەم ڕوونکردنەوەیـە، فـەرمووی: کەواتـە ئـەم سـزای دووکەڵـە ئەمەیـە کـەمن ڕوونم کـردەوە کەلەسەردەمی پێغەمبەر خۆی دا بووەو هـاتووەو ڕۆیـشتووەو تـەواو بـووە، نـەك

وەك ئەمەی ئەم ئامۆژگاری خوێنە دەیڵێ، کە سزایەك بێ لەسزاکانی قیامەت، چونکە سزای قیامەت کەهات لاناچێو ناڕواو تەواو نابێ.

ئەوجا ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەبەست لە {الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى} لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: {يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنتَقِمُونَ } (سوره الدخان-١٦/٤٤). کە خودا هەڕەشەی پێ دەکا لەناموسوڵمانەکان، ئەو هەڵمەتە گەورەیە بوو کە لەڕۆژی غەزای بەدردا رووی دا، کە خودا زەبرو زەنگێکی وەهای نواندو، گورزێکی جەرگبڕی وەهای وەشاند لەناموسوڵمانەکان، پێی تەمێ خواردبوون!

ئەوجا ئیبنو مەسعوود فەرمووی: دیارە کە ئەلبەطشەتولکوبراو گورزە جەرگبڕەکەیش، وەك مەسەلەی دووخانو تەمو مژوو و دوو کەڵەکەو، مەسەلەی (اللزام) کەلەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە، کەدەفەرموێ: {فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا} (سوره الفرقان/٧٧).

هەروا داستانی شەڕی رووموو فورس کەلەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {غُلِبَتِ الرُّومُ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ} (سورة الروم/٢-٣) دیارە کە ئەم کۆمەڵەشتانە، کە هەریەکەیان لەشوێنێکا، لە قورئانا ئامازەیان پێکراوە، هەموویان لەمەو پێش روویان داوەو تەواو بوونو چاوەڕوان ناکرێن!. (تاج/٤ ز/١٣ ژ/٣٩٢٩ — سورەی یوسف) + (تەجریدی بوخاری/٤ ژمارە/١٦٧٨ = ٤٧٧٤ فتح الباری).

ئەمەیش ژمارە: (١٦٧٨)ی تەجریدی بوخارییە، بەهەرەی جوانی واتیادا، نووسینی ڕەحمەتی لێ دەباریێ:

عَنْ مَسْرُوق (رَحِمَهُ الله تعالى ) قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يُحَدِّثُ فِي كِنْدَةَ فَقَالَ: يَجِيءُ دُخَانٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَاخُذ باسْمَاعِ الْمُنَافِقِينَ وَابْصَارِهِمْ يَاخُذ

الْمُؤْمِنَ كَهَيْئَةِ الزُّكَامِ فَفَزِعْنَا فَاتَيْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ وَكَانَ مُتَّكِئًا فَغَضِبَ فَجَلَسَ فَقَالَ: (مَنْ عَلِمَ فَلْيَقُلْ : وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلْ: ( اللّٰهُ اعْلَمُ ) فَانَّ مِنَ الْعِلْمِ انْ يَقُولَ لِمَا لايَعْلَمُ: (لا اعْلَمُ)، فَانَّ اللّٰهَ تعالى قَالَ: لِنَبِيِّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ﴿ قُلْ مَا اسْألُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ اجْرٍ وَمَا انَا مِنْ الْمُتَكَلِّفِينَ ﴾ وَانَّ قُرَيْشًا ابْطئُوا عَنْ الاسْلام فَدَعَا عَلَيْهِمْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (اللّٰهُمَّ اعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ) فَاخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَتَّى هَلَكُوا فِيهَا وَاكَلُوا الْمَيْتَةَ وَالْعِظَامَ وَيَرَى الرَّجُلُ مَا بَيْنَ السَّمَاء وَالارْض كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ فَجَاءهُ ابُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ جِئْتَ تَامُرُنَا بِصِلَةِ الرَّحِمِ وَانَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللّٰهَ فَقَرَا ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَاتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُبِينٍ ﴾ الَى قَوْلِهِ عَائِدُونَ افَيُكْشَفُ عَنْهُمْ عَذَابُ الْاخِرَةِ اذا جَاء؟ ثُمَّ عَادُوا الَى كُفْرِهِمْ فَذلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى﴾ يَوْمَ بَدْرٍ وَ لِزَامًا يَوْمَ بَدْرٍ الم غُلِبَتْ الرُّومُ الَى سَيَغْلِبُونَ وَالرُّومُ قَدْ مَضى)، (الحديث ٤٧٧٤– طرفه في: ٥١٨ = تجريد =١٠٠٧ فەتح = بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ٤٩٢ + بڕ: تاج/٧ ل/١٢٠ ز/٢١ ژ/٤ + تاج/٦ ز/١٣– سوورەتی یوسف ل/٢٤٨ ژ:٤) + (رياض الصالحين/٤ ل/١٢١٤ ز/٣٠١ ژ/٢):

مەسروق (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەولاتی کیندە پیاوێ خەریك بوو، فەرموودەی دەخوێندەوە، گوتی : لەڕۆژی قیامەت دا دوکەڵێ پەیدا دەبێ، دەدا بەسەر گوێو چاوی ناپاکە(منافق)ەکاندا، لەسەر شێوەی هەلامەتیش موسڵمان دەیگرێ، ئێمەش لەمە شڵەژاین وتۆقین.

جا من خۆم چووم بۆ خزمەتی ئیبنو مەسعود (رەزای خودای لێ بێ) کاتێ قسەی کابرام بۆ گێڕایەوە، پاڵ کەوتبوو، تووڕەبوو هەڵسا، فەرمووی: (ئەوەی شتێ دەزانێ، بابیڵێ، ئەوەی کەشتەکە نازانێ بابڵێ خودا خۆی دەیزانێ، چونکە ئەومیش هەر بەشێکە لە عیلم وزانست، کە کەسێك شتێکی لێ پرسین کە نەیزانێ با بڵێ نایزانم چونکە خودای گەورە بە پێغەمبەر ی خۆی دەفەرموێ:

﴿قُـلْ مَـا اسْـأَلُكُمْ عَلَيْـهِ مِـنْ اجْـرٍ وَمَـا انَـا مِـنْ الْمُـتَكَلِّفِينَ﴾ ص/٨٦، واتـه : ئـەی موحەممـەد! پێیـان بفـەرموو : مـن بەسـیفەتی ئـەوەی کـە پێغەمبـەرو ڕەوانـە کراوی خودام بۆسەر ئێوە، لەم ڕووەوە، لەسەر هەڵسان بـەم پەیامـە داوای پـارەو پووڵ و موزدو کرێتان لێ ناکەم، وە من لەو کەسانە نیم کە شت بـە زۆرەکـی وە بە تەکەللوف ئەنجام بدەم) ئەوی تری ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە لەم شـوێنەدا ڕابووورد).

مەسـروق (ڕەحمـەتی خـودای لـێ بـێ) تابیعییـە پیـاوێکی فـەرموودەزانی گەورەیە، لە ریجالی سەحیحەینە، سوار چاکێکی گـەورە بـوو، لەپـشتی حـەزرەتی ئەبوبـەکرەوە نوێـژی کـردووە، فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە لەعومـەرو عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعودو عائیـشەو کەسـانی تـریش، تەمـەن درێـژ بـووە، بـەکۆی دەنـگ پێـشەوایەکی مـەزنی متمانـەپێکراوی فـەرموودە زانـەکان بـووە، خوشـکەزای صەحابی ناودارو شکۆ دار مەعدیکە ریبـە بـووە، لـە پـێش وەفـاتی پێغەمبـەردا ئیسلام بووە، پێیـان دەگـوت ئـەبو عائیـشە سـەدری ئـەوەڵی سـەحابیەکانی دیـوە، عائیـشە بـە منـداڵی کردبـووی بـە کـوڕی خـۆی کۆمەڵـەی فـەرموودە زانـەکان فەرموودەی ئەویان گێڕاوەتەوە، مەسروق خۆی دەفەرموێ : عومەر لێی پرسـیم : نـاوت چـییە؟ گـوتم : مەسـروقی کـوڕی ئەجـدەع! فـەرمووی: ئەجـدەع نـاوی شەیتانە، تۆ لە ئێستاوە ناوت مەسروقی کوڕی عەبـدول ڕەحمانـە، سـاڵی شەسـت ودوو، یان شەستو سێی کۆچی عەمری حەقی بەجێ هێناوە.

## (٨) باب إنشقاق القمر

## باسی موعجیزەیەکی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە لەتکردنی مانگ بووە

١٧٨٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِـيَ اللهُ عنـهُ) قَـالَ انْـشَقَّ الْقَمَـرُ عَلَـى عَهْـدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شِقَّتَيْنِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اشْهَدُوا. (الحديث:٣٦٣٦، اطرافه في: ٣٨٦٩، ٣٨٧١، ٤٨٦٤، ٤٨٦٥):[١٧٨٤]

عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ لە مینا لە خزمەتی حەزرەتدا بووین، (دروودی خودای لێ بێ) بێبڕواکان داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەر کرد، جا لەسەر داواکردنی پێغەمبەر لەخودا مانگ بوو بە دوو کەرتەوە، کەرتێکیان کەوتە پشت کێوەکەوەو ئەو کەرتەکەی تریشیان کەوتە ئەو دیویەوە.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (تەماشاکەن و بەشایەت بن، کەوا ئەم موعجیزە گەورەیەتان بە چاوی خۆتان لەمن دی، کەشتی وا نیشانەو بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ڕاستی و دروستی پەیامەکەی من). (تاج/٧ ل/١٧٠ ز/٣٧ ف/١+ ٢+ ٣- سوورەتی قەمەر). (ف/١ + ٢+ ٣ = فەرموودەی ژمارە: ١، ٢، ٣).

١٧٨٥- حديث أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضى الله عنه – أَنَّهُ حَدَّثَهُمْ أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً ، فَأَرَاهُمُ انْشِقَاقَ الْقَمَرِ.[١٧٨٥]

بڕوانە ژمارە: (١٧٨٤) کە ئێستا ڕابورد.

---

[١٧٨٤] تجرید/٤، ژمارە: ١٤٤٧ = ٣٦٣٦ بخاری. مسلم: ٧٠٠٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/٢٧).

[١٧٨٥] بڕوانە ژمارە: (١٧٨٤) (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/٢٧).

١٧٨٦- حديثابْنِ عَبَّاسٍ – رضى الله عنهما أَنَّ الْقَمَرَ انْشَقَّ فِي زَمَانِ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – .[١٧٨٦]

بڕوانه ژماره: (١٧٨٤) لێرهدا ئاوایه:

ئیبنو عهبباس (رهزای خودای لێ بێ) فهرمووی: له سهردهمی پێغهمبهر خۆیدا، موعجیزهیهکی پێغهمبهر (درووودی خودای لهسهر بێ) ئهوهبوو، که مانگ شهق بوو.

## (٩) باب لا أحد أصبَرَ أذَى مِنَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ

## کهس وهك خودای گهورهو سهروهر ئارام ناگرێ لهسهر ئازاری بهندهکانی که بهبێ فهرمانیو گوناه ئازاری دهدهن

١٧٨٧- عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّه عَنْه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيْسَ أَحَدٌ أَوْ لَيْسَ شَيْءٌ أَصْبَرَ عَلَى أَذًى سَمِعَهُ مِنَ اللَّهِ إِنَّهُمْ لَيَدْعُونَ لَهُ وَلَدًا وَإِنَّهُ لَيُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ. (الحديث ٦٠٩٩ طرفه في: ٧٣٧٨):[١٧٨٧]

ئهبو مووسا (رهزای خوای لێ بێ) فهرمووی: خۆشهویست -درووودی خوای لهسهر بێ- دهفهرموێ: کهس نییه که وهك خودای گهوره بهئارام و بهحهوسهڵه بێ، لهسهر ئهو ههموو ئازارو قسه ناڕهوایانهی کهبهو دهکرێو بهگوێی خۆی دهیانبیستێ، ئهوهتانێ بتپهرستان و هاوبهش پهیداکاران، بڕیاری هاوتاو منداڵی بۆ دهدهنو دهڵێن: خودا منداڵی ههیه، خودا شهریكو هاوبهشی ههیه، کهچی لهگهڵ ئهم تانهو توانجهش دا، ئهوهتانێ خودا رزقو رۆزیی یان دهدا، ساخڵهمیان

---

[١٧٨٦] بڕوانه ژماره: (١٧٨٤) (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/٢٧).

[١٧٨٧] تجرید/٥، ژماره: ١٩٤٧ = ٦٠٩٩ بخاری. پوختهی موسلیم/٥، ژماره: ١٩٢٨ = ٧٠١٣ ترقیم وتخریج الشیخ خلیل مأمون شیحا - شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٨ رقم الباب/٧١).

دەكا، خۆشیو نازو بەهرەی خۆی دەڕژێنێ بەسەریانا، واتە: ئارامو حەوسەڵە و هێمنی سیفەتی خوداو پێغەمەرانو پیاو چاكانە. (تاج/٩ ز/٣٠ ل/٨١ ش-باسی صەبرو ئارامو لێبوردنو بەحەوسەڵەییو ئازاركێشی).

ئەمەیش دەقی ژمارە: (١٩٢٨)ی پوختەی موسلیمی ئەم فەرموودەیە:

عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ قَيْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَا أَحَدٌ أَصْبَرَ عَلَى أَذًى يَسْمَعُهُ، مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، إِنَّهُمْ يَجْعَلُونَ لَهُ نِدًّا، وَيَجْعَلُونَ لَهُ وَلَدًا، وَهُوَ مَعَ ذَلِكَ يَرْزُقُهُمْ، وَيُعَافِيهِمْ، وَيُعْطِيهِمْ». {الحديث: ٧٠١٣ = ٧٠٣٨ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٤٧ = ٦٠٩٩، ٧٣٧٨ فتح الباري. تحفة الأشراف: ٩٠١٥}:

ئەبو مووسای ئەشعەری، كەناوی عەبدوڵلای كوری قەیسە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كەس نییە كەئاوا وەك خودای گەورە بە ئارامو بە حەوسەڵە بێ، لەسەر ئەو گشتە ئازارو قسە نارەوایانەی كەبەو دەكرێو بەگوێی خۆی دەیانبیستێ، ئەوەتانێ بتپەرستان بڕیاری هاوتاو منداڵی بۆ دەدەنو دەڵێن: منداڵی هەیە، خودا شەریكو هاوبەشی هەیە، كەچی لەگەڵ ئەم تانەو توانجەشدا ئەوەتانێ خودای گەورە رزقو رۆژییان دەدا، ساخڵەمیان دەكا، خۆشیو نازو بەهرەو بەخششی خۆی دەڕژێنێ بەسەریانا). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٤٨٤٠ – باسی سەبرو ئارامو لێبووردن...}.

## روونكردنەوە:

واتە: ئارامو هێمنیو حەوسەڵەو شێنەیی رەفتاری خودای گەورەو پێغەمبەرانو زانایانو پیاوچاكانە.

### (١٠) باب طلب الكافر الفِداء بملء الأرض ذَهَباً

### بێباوەڕ لە قیامەتدا ئامادەیە کە ئەگەر پڕ زەوی زێڕی هەبێ، هەمووی بدات لە تۆڵەی خۆیدا بە مەرجێ لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری ببێ

١٧٨٨- عَنْ انَسٍ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) يَرْفَعُهُ: (انَّ اللَّهَ يَقُولُ لاهْوَنِ اهْلِ النَّارِ عَـذَابا: لَوْ انَّ لَكَ مَا فِي الارْض مِنْ شَيْءٍ كُنْتَ تَفْتَدِي بِهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَقَدْ سَالْتُكَ مَا هُوَ اهْوَنُ مِنْ هَذَا وَانْتَ فِي صُـلْبِ ادَمَ: انْ لا تُـشْرِكَ بِـي فَابَيْـتَ الا الـشِّرْكَ) (الحـديث ٣٣٣٤- طرفاه في: ٦٥٣٨، ٦٥٥٧)؛ [١٧٨٨]

ئەنـەس (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ( لە ڕۆژی قیامەتا خودای گـەورە، بەوکەسـە دەفـەرموێ: کـە لـەناو ئـاگری دۆزەخـدا سـزاو ئـێش و ئـازاری لەهـەموو دۆزەخییـەکانی تـر سووکترە ، خودا پێی دەفەرموێ: ئەگەر ئێستا جیهان و هەرچی لەجیهانـدا بـوو ، هی تۆبێت ئایا دەیدەیت لـە تـۆڵەی خۆتـدا، هـەتا لـەم ئـێش و ئـازارەی ئێـستات ڕزگارت بێت یان نا؟ دەڵێ: بەڵێ ئەی خودایە! دەیدەم.

جا خودا پێی دەفەرموێ: تۆ هێشتا لەپشتی ئادەم دا بـووی مـن شـتێکم لێ داواکردیـت ، کـە گـەلێ لەمـە ئاسـانتر بـوو کـە ئـەوە بـوو داوام لێ کردیـت، کەتۆ هاوبەشم بۆ بڕیار نەدەیت ومنیش نەتخەمـە نـاو ئاگرەوە،کەچـی تـۆ هـەر حەزت لەوەبوو هاوبەشم بۆ بڕیار بدەی) (ش = شەیخەین = بوخاری و موسلیم. ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ، تاج/٦ل-١٢٦ز-٦ف-٥ سورەتی مائیدە).

---

[١٧٨٨] تجريد البخاری/٤، ژمارە: ١٦٧٧ = ٤٦٧٠ بخاری. مسلم: ٧٠١٤ شیحا (بخاری رقـم الکتـاب/٦٠ رقم الباب/١).

## (١١) باب يَحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وَجْهِهِ
## بێباوەڕ لەسەر ڕوو حەشر دەكرێ

١٧٨٩- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يُحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ: «أَلَيْسَ الَّذِى أَمْشَاهُ عَلَى رِجْلَيْهِ فِى الدُّنْيَا قَادِرًا عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟». قَالَ قَتَادَةُ: بَلَى وَعِزَّةِ رَبِّنَا. {الحديث: ٧٠١٨ = ٧٠٤٣ فم. تجريد البخارى بالكوردى/٤، رقم: ١٦٧٧ = ٤٦٧٠، ٦٥٢٣ فتح البارى. تحفة الأشراف: ١٢٩٦} :[١٧٨٩]

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەڕۆژی قیامەتدا، بێبڕوا لەسەر روخسار چۆن حەشر دەكرێت؟ فەرمووی: (ئەو خودایەی كەلەم جیهانەدا دەتوانێ كارێكی وابكا كە ئادەمیزاد لەسەر دووپێ بڕوات، ئایا ناتوانێ كە لەوجیهاندا كارێكی وا بكا، كە لەسەر ڕوو بڕوات؟).

قەتادە فەرمووی: با، بەگەورەیی خودا، دەتوانێو زیاتریش. {تاج/٤، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٣٩٧٠ و ٣٩٧١ — سوورەتی ئیسرا}.

---

[١٧٨٩] تجريد البخارى/٤، ژمارە: ١٩٥٢ = ٧٠١٨ بخارى. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٥٢ = ٧٠١٨ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٢٥).

## (١٤) باب مَثَلُ المُؤمنِ كَالزَّرْعِ وَمَثَلُ الكافرِ كَشَجَرِ الأرز
## موسوڵمان وەك قەرسیلی سەوز وایە، ناپاك و بێباوەڕیش وەك درەختی داری كاژ وایە

١٧٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّه عَنْه قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللّـهِ صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ : مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْخَامَةِ مِـنَ الـزَّرْعِ مِـنْ حَيْـثُ أَتَتْهَـا الـرِّيحُ كَفَأَتْهَـا فَـإِذَا اعْتَـدَلَتْ تَكَفَّأُ بِالْبَلَـاءِ وَالْفَـاجِرُ كَالْـأَرْزَةِ صَـمَّاءَ مُعْتَدِلَـةً حَتَّـى يَقْـصِمَهَا اللّـهُ مَتَـى شَاءَ.(الحديث ٥٦٤٤ طرفه في: ٧٤٦٦)[١٧٩٠]:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست -دروودی خوای لەسـەر بێ- دەفەرموێ: (موسـوڵمان وەك قەرسـیلی سـەوزیی نـەرمو نـۆڵ وایە، هەروەك چۆن قەرسیل بەدەم باوە هەزارەدەكا، بەڵام بایەكـە قەرسـیلەكەی بـۆ هەڵناكـەنرێ، هەركـە باكـەی خـست قەرسـیلەكە قیت و قـنج و ڕەپ و ڕاسـت ڕادەوەستێت، موسـوڵمانیش ئـاوا دەردوبـەلا، لەهـەموو جۆرێ، لەهـەر چوارلاوە، دەیهێنێ و دەیبات، بەڵام موسوڵمانەكە خۆگرە، هەركـە ڕزگـاری بـوو دەسـت دەكا بەژیانێكی ئاسایی و سوپاسگوزاری خوا دەكا و هەمیشە سەركەوتوو دەبێ. بـەڵام مرۆی بەدكار (فـاجر) وەك شـێخەڵی دار كـاژ وایـە، قـەوی و پتـەوەو ڕەپ و ڕێـك ڕادەوەستێت، كەمتر تووشی دەردو بەلا دەبێ، هەتا لەناكاوێكا، بـای ئاكـام لـەڕەگ و ڕیشە هەڵی دەكەنێ و خوا لەكات و ساتی خۆیدا پشتی دەشكێنێ).

١٧٩١- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـه وَسَـلَّمَ): « مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْخَامَةِ مِنَ الزَّرْعِ، تُفِيئُهَا الرِّيحُ، وَتَـصْرَعُهَا مَـرَّةً وَتَعْـدِلُهَا أُخْـرَى، حَتَّى تَهِيجَ، وَمَثَلُ الْكَـافِرِ كَمَثَـلِ الأَرْزَةِ الْمُجْذِيَـةِ عَلَـى أَصْـلِهَا لاَ يُفِيئُهَـا شَـيْءٌ حَتَّـى

---

[١٧٩٠] تجریـد/٥، ژمـارە: ١٨٥٨ = ٥٦٣٧ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/١، ژمـارە: ٢٨ - ٧٠٢٥ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٥ رقم الباب/١).

يَـكونَ انْجِعَافُهَا مَرَّةً وَاحِـدَةً ». {الحـديث ٧٠٢٥. صـفات المنـافقين. بوخـاري: ٥٦٤٤، ٧٤٦٦. تحفة الأشراف: ١١١٣٣} . وَفِي رِوَايَةٍ: « وَتَعْدِلُهَا مَرَّةً حَتَّى يَأْتِيَهُ أَجَلُهُ. وَمَثَـلُ المُنَـافِقِ مَثَـلُ الأَرْزَةِ الْمُجْذِيَـةِ، الَتِـي لاَيُـصِيبُهَا شَـيءٌ ». { الحـديث ٧٠٢٦. إنفـردَ بِـهِ مُسْلِمٌ، تحفة الأشرافِ: ١١١٥٠} . (م – ٨/١٣٦).[١٧٩١]

كـەعبى كـوڕى ماليـك (ڕەزاى خـوداى لىّ بـىّ) فـەرمووى: پێغەمبـەر فەرمووى: (موسوڵمان وەك قەرسيلى سـەوزى نـەرمو نۆڵ وايـە، هـەروەك چۆن قەرسيلو سـەوزەگيا بـەدەم بـاوە هـەزارە دەكـا، بـەڵام بايەكـە قەرسيلەكەى بـۆ هەڵناكـەنێ، هـەر كەباكـەى خـست قەرسـيلەكە قيـتو قـنجو ڕەپو ڕاسـت ڕادەوەستێت، موسوڵمانيش ئاوا دەردو بەڵا، لە هەموو جۆرێ، لەهـەر چوار لاوە، دەيهێنىێو دەيبات. بەڵام موسوڵمانەكە خۆگرە، هەركە ڕزگـارى بـوو دەسـت دەكـا بە ژيانێـكى ئاسايىو سوپاسگوزارى خوا دەكاو هەميشە سەركەوتوو دەبـێ، هـەتا بە مەرگى خوا دەمرێو ئەنجامى خێر دەبێ، هـەروەك چۆن قەرسيلو گيـا، لـە كۆتايى ژيانيدا زەرد دەبێو دەگەيێو وشك دەبێ ئاوا. بەڵام بێباوەڕو كافر، وەك شێخەڵى داركاژ وايە، قەوىو پتەوەو ڕەپو ڕێـك ڕادەوەستێت لەسـەر بنكەكـەى، كەمتر تووشـى دەردو بـەڵا دەبـێ، هـەتا لـە ناكاوێـكا، بـاى ئاكـام لـە ڕەگـو ڕيـشە هەڵى دەكەنێو خوا لەكاتو سـاتى خـۆى دا پـشتى دەشـكێنێ). (تەجريـد/١٥٣/٥، ژمارە: ٥٦٤١/١٨٥٧ + تاج/٤، زنجيرە: ٥٢، ژمارە: ١، لاپەڕە: ١٧١ = تاج-٣ ژ-٢٩٣٥).

---

[١٧٩١] بخارى: ٥٦٤٤. پوختەى موسليم/١، ژمارە: ٢٨ = ٧٠٢٥ شيحا (بخـارى رقـم الكتـاب/٧٥ رقـم الباب/١).

**روونكردنەوە:**

كەعبی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) تاقانەی باوكی بووە، ناودارە بە كەعبی شاعیر، یەكێكە لە شاعیرە ناودارەكانی موسوڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەردا، یەكێكە لەو سیٚ كەسەی كە ئەم ئایەتە لەبارەیانەوە هاتووە: {وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ-سورة التوبة/ ١١٨}.

هەشتا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، چوار فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، لەكۆتایی تەمەنیدا كوێربوو بوو، عەبدوڵلای كوڕی چاوساغی بوو. لەسەر فەرمایشتی عەینی، لە ساڵی پەنجای كۆچیدا، لە مەدینە، مردووە). لە ئیستعابا دەفەرمویٚ: (حەفتاو حەوت ساڵ ژیاوە). (بڕوانە: ریاضی كوردی/٣٤/١، ژمارە: ٢١).

## (١٥) باب مثل المؤمن مثل النخلة
## موسوڵمان وەك دارخورما وایە

١٧٩٢- حديث ابْنِ عُمَرَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لاَ يَسْقُطُ وَرَقُهَا ، وَإِنَّهَا مَثَلُ الْمُسْلِمِ ، فَحَدِّثُونِى مَا هِىَ » . فَوَقَعَ النَّاسُ فِى شَجَرِ الْبَوَادِى . قَالَ عَبْدُ اللَّهِ وَوَقَعَ فِى نَفْسِى أَنَّهَا النَّخْلَةُ ، فَاسْتَحْيَيْتُ ثُمَّ قَالُوا حَدِّثْنَا مَا هِىَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ «هِىَ النَّخْلَةُ»[١٧٩٢]

لە ژمارە: (٢٩)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

[١٧٩٢] بخاری: ٦١، ٦٢، ٧٢، ١٣١، ٢٢٠٩، ٤٦٩٨، ٥٤٤٤، ٦١٢٢، ٦١٤٤. پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ٢٩ = ٧٠٢٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣ رقم الباب/٤).

عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما)، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « أَخْبِرُونِى بِشَجَرَةٍ تُشْبِهُ، أَوْ كَالرَّجُلِ الْمُسْلِمِ، لاَ يَتَحَاتُّ وَرَقُهَا، تُؤْتِى أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ » . قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَوَقَعَ فِى نَفْسِى أَنَّهَا النَّخْلَةُ، وَرَأَيْتُ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ لاَ يَتَكَلَّمَانِ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ، أَوْ أَقُولَ شَيْئًا، فَقَالَ عُمَرُ: لأَنْ تَكُونَ قُلْتَهَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كَذَا وَكَذَا. {الحديث ٧٠٢٩ – ٧٠٣٣ – صِفَاتُ الْمُنَافِقِين. بوخارى: ٦١، ٦٢، ٧٢، ١٣١، ٢٢٠٩، ٤٦٩٨، ٥٤٤٤، ٥٤٤٨، ٦١٢٢، ٦١٤٤. تحفة الأشراف: ٧٨٢٧} . (م – ٨/١٣٨).

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە خزمەتی حەزرەتدا بووین، فەرمووی: (درەختێ هەیە، گەڵاكەی هەڵناوەرێ، هەمیشە سەوزە، نموونەی موسوڵمانە، وەك ئەو بەپیتو فەڕە، ئادەی كێ دەزانێ كە ئەو درەختە چییە؟). خەڵكەكەیش پەلاماری دارو درەختی ئەو دەشتو دەرمیاندا، ناوی چەندین دارو درەختیان گوت، بەڵام هەڵیان نەهێنا، منیش هات بە دڵما، كە ئەوە دارخورمایە، ویستم بڵێم: ئەوە دارخورمایە، بەڵام كە سەرنجم دا، بە منەوە دە كەس بووین، لەناویانا ئەبوبەكرو عومەرم دی، ئەوان قسەیان نەكرد، لەم بارەیەوە، وە من لە هەموویان مناڵتر بووم، لەبەرئەوە شەرمم كردو قسەم نەكرد، جا خەڵكەكە عەرزیان كرد: قوربان! پێمان بفەرموو چییە؟ فەرمووی: (ئەوە دارخورمایە). لەپاشا كە ئەمەم عەرزی باوكم كرد، فەرمووی: خۆزگە دەتگوت، ئەگەر بتگوتبایە، لە ڕانە وشتری سووری مەرەز، كە باشترین سامانی عەرەبە، پێم باشتر بوو!. (تەجرید/١/٨٠، ژمارە: ٦١/٥٥ + تاج/٤/٧٤، ژمارە: ٧، زنجیرە: ٢١).

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، لە ژمارە: (٥٥)ی تەجریدی بوخاریدا:

عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنهُما) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ مِنْ الشَّجَرِ شَجَرَةً لَا يَسْقُط وَرَقُهَا وَإِنَّهَا مَثَلُ الْمُسْلِمِ فَحَدِّثُونِي مَا هِيَ؟؟ فَوَقَعَ النَّاسُ فِي شَجَرِ الْبَوَادِي قَالَ عَبْدُ اللَّهِ وَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ فَاسْتَحْيَيْتُ ثُمَّ قَالُوا حَدِّثْنَا مَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ هِيَ النَّخْلَةُ). (الحديث ٦١ ـ أطرافه في ٦٢، ٧٢، ١٣١، ٢٢٠٩، ٤٦٩٨، ٥٤٤٤، ٥٤٤٨، ٦١٢٢، ٦١٤٤):

ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (درەختێ هەیە گەڵاکەی هەڵناوەرێ، هەمیشە سەوزە، نموونەی موسوڵمانە، وەك ئەو بەپیتو فەرە، ئادەی كێ دەزانێ كەئەو درەختە چییە؟ خەڵكەكەیش پەلاماری دارو درەختی ئەو دەشتەیان دا بەڵام هەڵیان نەهێنامنیش هات بەدڵما كەئەوە دارخورمایە وە ویستم بڵێم: ئەوە دراخورمایە، بەڵام كەسەرنجم دا بەمنەوە دە كەس بووین، وەمن لەهەمووشیان منالتر بووم، لەبەرئەوە شەرمم كردو قسەم نەكرد، جا خەڵكەكە عەرزیان كرد: قوربان! پێمان بفەرموو چییە؟ فەرمووی: (ئەوە دارخورمایە) (ت-٤ ل-٧٤ ف-٧ ز-٢١ تاج-٣ ژ-٢٧١٣).

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە مەتەڵ داهێنان بۆ ڕوون كردنەوەی مەبەستی جوان سوننەتە: (تاج/٤ ل-٧٤ = تاج-٣ ژ-٢٧١٣) لە هەر شوێنێ هێمای لاپەڕە (ل) بوو مەبەست بەرگی تەرجەمە كوردییەكەیە لە تاج الأصول یا لە ریاض الصالحین، بەڵام ئەگەر ڕەمزەكە (ص) بوو ئەوە مەبەست ئەصڵە عەرەبیەكەیانە.

**(١٧) باب لَنْ يَدْخلَ أحَدُ الجَنَّةَ بِعَمَلِه، بَلْ بِرَحمة اللهِ تعالى**
**کەس بەهۆی کردەوەی باشی خۆیەوە ناچێتە بەهەشت، بەڵکوو هەرکەسی بڕواتە بەهەشت، لە ڕەحمەتی خودای گەورەوەیە، نەوەك بە کردەوەی خۆی**

١٧٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰه عَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَنْ يُنَجِّيَ أَحَدًا مِنْكُمْ عَمَلُهُ قَالُوا وَلَا أَنْتَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ وَلَا أَنَا إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللّٰهُ بِرَحْمَةٍ سَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَاغْدُوا وَرُوحُوا وَشَيْءٌ مِنَ الدُّلْجَةِ وَالْقَصْدَ الْقَصْدَ تَبْلُغُوا. (الحديث ٦٤٦٣ طرفه في رقم/٣٧ تجريد = رقم/٣٩ فتح الباري = بەرگی/١ ل/٥٦). (قَال العيني: الحديث من أفراده –المترجم–): [١٧٩٣]

**ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست -درووودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: کەستان کردەوەی خۆی ڕزگاری ناکات). یاران عەرزیان کرد: هەتا تۆیش؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: هەتا منیش بەکردەوەی خۆم ناچمە بەهەشت، مەگەر خودا بەبەرگی ڕەحمەتی خۆیدامپۆشێ‌و نوقمی ڕەحمەتی خۆیم بکا، هەوڵ‌و تەقەللایەکی ڕێك‌و پێکی مامناوەندی بدەن‌و لەکاری خێرا درێغی مەکەن‌و ئەوەندەی بۆتان دەلوێ بەڕاساڵی کۆتایی لەکردنی کاری چاك مەکەن، ئێوەش وەك ڕێبواری چالاك لەم سێ‌کاتەدا تێکۆشن و خواپەرستی‌و بەندەگی خۆتان بکەن‌و بیکەن بەدەسمایەو سەرمایەی خۆتان: سەرلەبەیانیان و سەرلەئێواران‌و دەمەو پارشێو! میانەکاربن میانەکار دەگەنە هەوار، کاروانی ئەگەر میانەڕەونەبێ، هەم خۆی هەم وڵاخەکانی دەپڕووکێن‌و لەپێ دەکەون. (ریاض/١ ل/٩٧ ژ/٨٦/٢/ زنجیرە ژمارە: ٨-باسی ڕاساڵی، واتە: ئیستیقامەت).**

---

[١٧٩٣] **تجرید/٥، ژمارە: ٢٠١٠ = ٦٤٦٣ بخاری. مسلم: ٧٠٤٣، ٧٠٤٤، ٧٠٤٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/١٨).**

١٧٩٤- عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «سَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، فَإِنَّهُ لَنْ يُدْخِلَ الْجَنَّةَ أَحَدًا عَمَلُهُ». قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَلاَ أَنَا، إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللَّهُ مِنْهُ بِرَحْمَةٍ، وَاعْلَمُوا أَنَّ أَحَبَّ الْعَمَلِ إِلَى اللَّهِ أَدْوَمُهُ وَإِنْ قَلَّ». {الحديث: ٧٠٥٣ = ٧٠٧٨ فم. تجريد البخاري بالكوردي/١، رقم: ٤٠ = ٤٣، ١١٥٣ فتح الباري}:[١٧٩٤]

عائيشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەوڵو تەقەللایەکی مامناوەندیو ڕێكو پێك بدەن، لەکاری خێردا درێغی مەکەنو مـوژدەی قەبووڵتان لێ بێ، بشزانن کەکەس بەهۆی کردەوەی خۆیەوە ناچێتە بەهەشتو لەسزا ڕزگاری نابێ!). یاران عەرزیان کرد: قوربان! هەتا تۆیش؟ فەرمووی: (بەڵێ منیش هەروا، مەگەر خودای گەورە بەرەحمەتو میهرەبانی خۆی دام بگرێو نوقمی دەریای ڕەحمەتی خۆیم بکا، بزانن کە خۆشەویسترین کردەوەی بەندە لەلای خودای گەورە ئەو کردەوەیەتی کە بەردەوامتربێ لەسەری با کەمیش بێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٥٢١٥ — چوونە بەهەشت لەسایەی خودای گەورەوەیە}.

---

[١٧٩٤] تجريد البخاري بالكوردی/١، ژمارە: ٤٠ = ٤٣، پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٢٧ = ٧٠٥٣ شیحا (بخاري رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٨١).





## (١٨) باب إكْثار الأعْمَالِ وَالإجْتِهَادِ في العِبَادَةِ
## زۆر کردنی کاری خێرو خۆمانووکردن له خودا پەرستیدا

١٧٩٥- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) صَلَّى حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: أَتَكَلَّفُ هَذَا وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ قَالَ: «أَفَلاَ أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا». {الحديث: ٧٠٥٥ = . تجريد البخاري/١، رقم: ٥٦٣ = ١١٣٠، ٤٨٣٦، ٦٤٧١. ترمذي. صلاة: ٤١٢. نسائي. صلاة: ١٤١٩. تحفة الأشراف: ١١٤٩٨}:[١٧٩٥]

موغیرەی کوڕی شوعبه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە لەشەو نوێژدا بەپێوە ڕاوەستابوو، هەردوو قاچی، یا هەردوو لاقی پەنەما بوون!

یاران (رەزای خودایان لێ بێ) عەرزیان کرد: ئەی خۆشەویستی خودا! بۆچی ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەی، خۆ تۆ خودا لە گوناهی بەرودوات خۆش بووە، کەواتەبۆ وا لەخۆت دەکەی؟ ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدی نابێ کەمنیش بەندەیەکی ستایشکارو عەبدێکی سوپاس گوزاربم؟). {تاج/١، زنجیرە: ١٨١، ژمارە: ٩٧١. چاپی چوارەم} + {ریاض/١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٩٨}.

### روونکردنەوە:

ئەبو حومەیدی ئەل-ساعیدی (رەزای خودای لێ بێ) هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، ناوی عەبدورەحمانی کوڕی سەعدە، ئەنصارییە، خەڵکی مەدینەیە، ئامادەی جەنگی ئوحودو مەڵبەندو شەڕگاکانی دوای ئوحود بوو، لەخزمەت

[١٧٩٥] تجريد البخاري/١، ژمارە: ٥٦٣ = ١١٣٠ بخاری. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم بالكوردی/٤، ژمارە: ١٥٤٧ = ٧٠٥٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/١٩ رقم الباب/٦).

پێغەمبەردا، لەدژی بێباوەڕان، لەپیاوانی صەحیحەینە، واتە: لەو صەحابانەیە کە گێڕانەوەیان لە صەحیحی بوخاریو لە صەحیحی موسلیمدا هەیە، لەکۆتایی جێنشینی موعاوییەدا فەوتی کردووە (ڕەزای خودای لێ بێ).

## (١٩) باب الإقْتِصَادِ في المَوْعِظَةِ
## میانەڕەوی لە پەندو ئامۆژگاریدا

١٧٩٦- عَنْ شَقِيقٍ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُذَكِّرُنَا كُلَّ يَوْمِ خَمِيسٍ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّا نُحِبُّ حَدِيثَكَ وَنَشْتَهِيهِ، وَلَوَدِدْنَا أَنَّكَ حَدَّثْتَنَا كُلَّ يَوْمٍ، فَقَالَ: مَا يَمْنَعُنِي أَنْ أُحَدِّثَكُمْ إِلاَّ كَرَاهِيَةُ أَنْ أُمِلَّكُمْ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَانَ يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوْعِظَةِ فِي الأَيَّامِ كَرَاهِيَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا). {الحديث: ٧٠٥٨ = ٧٠٨٣ فم. تجريد البخاري/١/٨٧. مجلد/١، رقم: ٦١ = ٦٨، ٧٠، ٦٤١١ فتح الباري. ترمذي. أدب: ٢٨٥٥. تحفة الأشراف: ٩٢٥٤}:[١٧٩٦]

شەقیق ناسراو بە ئەبو وائیل فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەستووری وابوو، هەموو ڕۆژی پێنج شەموانێ، تەمێو ئامۆژگاریی دەکردینو وەعزی دەخوێندەوە بۆمان، ڕۆژێ پیاوێ پێی گوت: ئەی باوکی ئەورەحمان! خۆزگەم هەموو ڕۆژێ ئەم پەندو ئامۆژەت بۆمان دەخوێندەوە، چونکە ئێمە حەزمان لەم فەرمایشتانەی تۆیەو ئەم قسانەی تۆمان پێ خۆشە، فەرمووی: ئەدیی من لەبەرئەوە واناکەم چونکە حەزناکەم بەوەعزی زۆر وەڕستان بکەم، منیش وەك جارانی پێغەمبەر خۆی دەکەم، ئەو

---

[١٧٩٦] تجريد/١، ژمارە: ٦١ = ٦٨ بخاری. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٥٨٤ = ٧٠٥٨ شيحا = ترقيم وتخريج الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم. (بخاری رقم الكتاب/٣ رقم الباب/١٣).

جـاران نـــاو بـــەناو پەنـــدی ئێمـــەی دادەداو ئامۆژگـــاری‌و فەرمایـــشتی بـــۆ دەخوێندینـــەوە، نـــەبادا ئەگـــەر هـــەموو رۆژێ پەنـــدمان دابـــداو وەعزمـــان بـــۆ بخوێنێتـــەوە جـارِس ببین، منـیش ئێـستا لەگـەل ئێـوەدا ئـاوا دەکـەم‌و چـاو لـەو دەکەم). {ریاض/٢، لاپەرِە: ٢١٩، زنجیرە: ٩١، ژمارە: ٦٩٩/١ چاپی دووەم}.

ئەمەیش گێرِانەوەی ژمارە: (٦١)ی تەجریدە:

عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَـانَ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَتَخَوَّلُنَـا بِالْمَوْعِظَةِ فِي الْأَيَّامِ كَرَاهَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا). (الحديث ٦٨ ـ طرفاه في: ٧٠، ٦٤١١):

ئەبووائیل (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: عەبـدوڵلای کورِی مەسعوود (رەزای خودایان لـێ بێ) دەستووری وابوو هەموو رۆژی پێـنج شـەموانێ تـەمێ‌و ئامۆژگاری دەکردین‌و وەعزی دەخوێندەوە بۆمان، رۆژێ پیـاوێ پێـی گـوت: ئـەی بـاوکی ئـەورِەحمان! خۆزگـەم هـەموو رۆژێ ئـەم پەنـدو ئامۆژگارییـەت بۆمـان دەخوێنـدەوە. فـەرمووی: ئـەدی مـن لەبەرئـەوە واناکـەم چـونکە حەزناکـەم وەرِسـتان بکـەم، منـیش وەك جـارانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەکەم، ئەو جاران ناوبەناو پەندی ئێمەی دادەداو ئامۆژگاری بـۆ دەخوێندینـەوە نـەبادا ئەگـەر هـەموو رۆژێ پەنـدمان دابـداو وەعزمـان بـۆ بخوێنێتـەوە جارِس ببین. (ریاض-٢ ل-٦١١ ژ-٦٩٩ ز-٩١ + تاج-١ ل-٩١ = ژ-١٢٣٠ ز-١٧).

## ٥١- كِتَاب الجَنَّةِ وَصِفَةُ نَعِيمِهَا وَ أَهْلِهَا
## نامەی بەهەشتو چۆنێتی نازو بەهرەکەیو خۆشی گوزەرانی دانیشتوانی

١٧٩٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ». {الحديث: ٧٠٦١ = ٧٠٨٦ فـم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ٢٠١٧ = ٦٤٨٧ فتح الباري}:[١٧٩٧]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەهەشت بەناخۆشیو نارەحەتی دەورەگیراوە، دۆزەخیش بە هەوەسو ئارەزوو بازی دەورە دراوە!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ١٠١ – باسی تێکۆشانو لێبڕان بۆ خودا + تاج/٥، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٥١٨٦ – ترسی خودای گەورەو پیرۆز}.

### روونکردنەوە:

واتە: بەجێهێنانی ئارەزووەکانی دەروون، وەك ئەوە وایە پەردەو پەرژینی دەوری دۆزەخ بەدەستی خۆت بدڕێنیتو لابدەیت، ئەوجا بەپێی خۆت بچیتە ناوی، هەروەها بەجێهێنانی ئەرکە ئایینییەکانیش، کە بەجێهێنانیان زۆر ناخۆشو قورسو گرانە، لەسەر شانی نەفسو دەروون، وەك ئەوە وایە: پەردەو پەرژینی دەوری بەهەشت بەدەستی خۆت لادەیتو، ئەوجا بەهاسانی خۆت بکەیت بەناو بەهەشتدا).

ئەمەیش گێڕانەوەی تەجریدی بوخارییە، ژمارە: (٢٠١٧):

---

[١٧٩٧] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠١٧ = ٦٤٨٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٦٩ = ٧٠٦١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/٢٨).

عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ رَضِيِ اللّٰهُ عَنه أنَّ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: حُجِبَتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ وَ حُجِبَتِ الجَنَّةُ بِالمَكَارِهِ. (الحديث ٦٤٨٧):

ئـەبوهورەیره (ڕەزای خـوای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- دەفـەرموێ: ئـاگری دۆزەخ بـەئارەزووبازی پـەرژین کـراوە، بەهەشتیش بەبێ دڵی کردنی دەروون پەرژین کراوە. (تـاج/١٠ ل/٤٧ ز/١٤ ژ/٢-ش/ت).

١٧٩٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ): « قَالَ اللّٰهُ أَعْدَدْتُ لِعِبَادِى الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَـيْنَ رَأَتْ ، وَلاَ أُذُنَ سَـمِعَتْ ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ ذُخْراً، بَلْهَ مَا أَطْلَعَكُمُ اللهُ عليـه. ثُـمَّ قَـرَأَ: ( فَـلاَ تَعْلَـمُ نَفْـسٌ مَـا أُخْفِىَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ ) . (الحديث ٧٠٦٥ حسب ترقيم الشيخ خليل مـأمون شـيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٧٠٩٠ حسب تـرقيم فـتح الملـهم لـشرح صـحيح مسلم. تجريد البخاري بـالكوردي/٤ رقـم: ١٦٧٩ = ٤٧٧٩، ٤٧٨٠، ٣٢٤٤، ٧٤٩٨، تحفة الأشراف/١٢٥٠٩).[١٧٩٨]

ئەبوهورەیره (ڕەزای خوای لـێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) لەفەرموودەیـەکی پـیرۆزدا، دەفـەرموێ: خـودای گـەورەو سـەروەر دەفـەرموێ: ئـەو بـەهرەو نـازو نیعمـەتو خۆشـیو شـادییە، کـە خـۆم ئامـادەم کردووەو، هەڵم گرتووە بەتایبـەتی بـۆ بەنـدە باشو خاسەکانی خـۆم، ئەوەنـدە بـاشو نایـابن، نەباچـاو بینـراوانو نەبـە گـوێ بیـسراونو، نەبـەدڵی کـەس دا هاتوونو نەبەخەیاڵی دا ڕابووردوون، سەرەڕای ئەم گشتە نازو بـەهرەو خۆشـیو

---

[١٧٩٨] بخـاری/٤، ژمـارە: ١٦٧٩ = ٤٧٧٩ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٥، ژمـارە: ٢١٥٧ - ٧٠٦٥ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٩ رقم الباب/٨).

موژدانەی کە خۆتـان ئاگاداریـانن‌و لـەقورئان‌و فـەرموودەو سـوننەتدا باسـکراون بۆتان.

ئەنجا خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بۆ پشتیوانی ئـەم فەرمایشتەی خـودا: {فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ} (سورة السجدة-٣٢/١٧).

واتـە: کـەس پـەی نابـات بـەو هەمکـە خێـرو خۆشـییە، کـە چـاوو دڵـی خاوەنەکانیان ڕۆشن دەکەنەوە، کە بۆچاکان‌و خواناسان ئامادەکراون، لەپاداشتی کردەوەی باشی خۆیان دا. (تاج/٤ ز/١٥ ژ/٤٠٣٣).

## (١) باب إِنَّ في الجَنَّةِ شَجَرَةً يَسيرُ الرَاكِبُ في ظلها مائة عَامٍ لا يَقْطَعُهَا درەخی وا لە بەهەشتا هەیە، سوار سەد ساڵ بە سێبەرەکەیدا ئەڕوات، ناگاتە ئەوپەڕی

١٧٩٩- وعَنْه (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لا يَقْطَعُهَا). (الحديث ٣٢٥١(ر أنظر ٣٢٥٢): [١٧٩٩]

ئەنـەس (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویست(دروودی خـوای لەسەر بێ) فـەرمووی: (درەختـێ هەیـە لەبەهەشـتا سـواری ئەسـپی خێـرای زۆر چاك کەمەشق دیدەبێ‌و ئامادە کرابێ بۆ قۆچ‌و تەراتێن، سەد سـاڵ بـەغار بـەبن سێبەری لقەکانی دا دەڕوا ناگاتە ئەو پـەڕی!) (ش/ت‌تـاج/١٠ل- ٤٤٢ ز-١٣٧ ف –٢. باسی دارو درەخت‌و میوەی بەهەشت).

---

[١٧٩٩] تجریـد/٣، ژمـارە: ١٣١٥ = ٣٢٥١ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٥، ژمـارە: ١٩٦٥ = ٧٠٦٩ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٥٦).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لا يَقْطَعُهَا وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ وَظِلٍّ مَمْدُودٍ ولقابُ قوس احدِكم في الجنَّةِ خيرٌ مما طلعت عليهِ الشّمسُ أوْ تغرُبُ) (الحديث ٣٢٥٢، طرفُهُ في: ٤٨٨١+ الحديث٣٢٥٣، طرفُهُ في: رقم: ١١٥١ تجريد = ٢٧٩٣ فتح):

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بیٚ) فەرمووی: لەم گێڕانەوەدا: (... ئەگەر حەزیش دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە کە دەفەرمویٚ: ﴿وظِلٍ ممدُودٍ﴾) -٥٦/٣٠- واتە: وە وان لەسێبەری خەستی درێژی ئاوڕشێنکراودا. وەبەقەد جێگەی کەوانیٚ لەبەهەشتا، کەهی یەکیٚ لەئێوە بیٚ چاکترە لەهەموو سامانو موڵکی هەموو جیهان). (ش/ت-تاج/٧/ل – ١٧٥ز –٣٩- سوورەتی واقیعە).

١٨٠٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ فِى الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِى ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لاَ يَقْطَعُهَا». قَالَ أَبُو حَازِمٍ: فَحَدَّثْتُ بِهِ النُّعْمَانَ بْنَ أَبِى عَيَّاشٍ الزُّرَقِىَّ فَقَالَ: حَدَّثَنِى أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِىُّ عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ فِى الْجَنَّةِ شَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ الْجَوَادَ الْمُضَمَّرَ السَّرِيعَ مِائَةَ عَامٍ مَا يَقْطَعُهَا». {الحديث: ٧٠٦٩ = ٧٠٩٤ فم. تجريد البخارى بالكوردى/٣، رقم: ١٣١٥ = ٣٢٥١ = ١٣١٦ = ٣٢٥٢ فتح البارى} :[١٨٠٠]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (درەختیٚ هەیە لە بەهەشتدا، سواری ئەسپی خێرا، سەد ساڵ بەغار بەبن سێبەری لقەکانیدا دەڕوات ناگاتە ئەو پەڕی!).

---

[١٨٠٠] بڕوانە ژمارە: (١٧٩٩) (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/٥١).

ئـەبو حـازم كـە تابعییـەو فـەقێی سـەهلەو ئـەم فەرموودەیـەی لـە سـەهل وەرگرتووە فەرمووی: ئـەم فەرموودەیـەی سـەهلم گێڕایـەوە بـۆ نوعمـانی كـوڕی ئەبو عەییاش ئەل – زورەقی فەرمووی: من لە ئـەبو سـەعیدی خـودریم بیـست دەیفـەرموو: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (درەختـێ لـە بەهەشـتا هەیـە، سواری ئەسـپی خێـرای چابوكی زۆر چـاك، كـە مەشـق دیـدەو ئامادەكرابێ بۆ قـۆچو تـەراتێن، سـەد سـاڵ بـەغار بـەبن لقەكانیـدا دەڕوا هێـشتا ناگاتـە ئەوپـەڕی!). {تـاج/٥، زنجـیرە: ١٣٧، ژمـارە: ٥٧٢٢ – باسـی دارو درەخـتو میـوەی بەهەشـت} . {ریـاض/٤، زنجـیرە: ٣٧٢، ژمـارە: ١٨٨٦ – ئـەو خۆشـیو بەهرانەی كەخودا لەبەهەشتا ئامادەی...} .

١٨٠١- حديث أبی سَعِیدٌ (رضی الله عنه) عَنِ النَّبِیِّ (صلی الله علیه وسلم) قَالَ: «إِنَّ فِی الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً یَسِیرُ الرَّاكِبُ فِی ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لاَ یَقْطَعُهَا»[١٨٠١]

بڕوانە ژمارە: (١٨٠٠).

## (٢) باب إِحْلاَلُ الرِّضْوَانِ عَلی أَهْلِ الجَنَّةِ فَلاَ یَسْخَطُ عَلَیْهِم أَبَداً

## ڕژاندنی خۆشنوودیی خودا بەسەر دانیشتوانی بەهەشتدا، پاش ئەوە هەرگیز خودا لێیان نارەنجێت

١٨٠٢- عَنْ أَبِی سَعِیدٍ الْخُدْرِیِّ أَنَّ النَّبِیَّ (صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ اللَّـهَ عَزَّ وَجَلَّ یَقُولُ لأَهْلِ الْجَنَّةِ: یَا أَهْلَ الْجَنَّةِ! فَیَقُولُونَ: لَبَّیْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَیْكَ وَالْخَیْـرُ فِـی یَدَیْكَ، فَیَقُولُ: هَلْ رَضِیتُمْ؟ فَیَقُولُونَ: وَمَا لَنَا لاَ نَرْضَی یَـا رَبِّ وَقَـدْ أَعْطَیْتَنَـا مَـا لَـمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، فَیَقُولُ: أَلاَ أُعْطِیكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، فَیَقُولُونَ: یَا رَبِّ وَأَیُّ شَیْءٍ أَفْضَلُ مِـنْ ذَلِـكَ؟ فَیَقُـولُ: أُحِـلُّ عَلَـیْكُمْ رِضْـوَانِی، فَـلاَ أَسْـخَطُ عَلَـیْكُمْ بَعْـدَهُ أَبَـدًا».

---

[١٨٠١] بڕوانە ژمارە: (١٧٩٩) (بخاری رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٥١).

{الحديث: ٧٠٧٠ = ٧٠٩٦ فم. تجريد البخاري = الترجمة الكردية = مختصر صحيح البخاري/٥، رقم: ٢٠٣٣ = ٦٥٤٩، ٧٥١٨ فتح الباري. ترمذي. صفة الجنة: ٢٥٥٥. تحفة الأشراف: ٤١٦٢}:[١٨٠٢]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزاو خۆشنوودیی خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورەو سەروەر بە بەهەشتییەکان دەفەرموێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! ئەی دانیشتوانی بەهەشت! ئەوانیش بەیەك دەنگ دەڵێن: بفەرموو ئەی پەروەردگارمان! هەمیشە ئێمە بەندەی کەمەر بەستەین‌و ئامادەین بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانت، سەرچاوەی گشت خێرو خۆشیو بەهرەیێ، وا لەهەردوو دەستی توانایی تۆدا، خودای گەورە پێیان دەفەرموێ: ئایا بەبەش‌و بارەی باشی خۆتان لەبەهەشتا رازین‌و پێی خۆشنوودن؟ دەڵێن: ئەی بۆ رازی نین، دەبێ لەم بەش‌و بارە باشە کەتۆ داوتە بەئێمە باشتر هەبێ؟ کێی تر بەش‌و بارەی واباشی پێ دراوە؟

خودا دەفەرموێ: ئەدی دەڵێن چی ئەگەر لەوەیش باشترتان پێ بدەم؟ دەڵێن: جا شتی واهەیە، دەبێ چی شتێ هەبێ کە لەمە باشتربێ؟! دەفەرموێ: خۆشنوودی‌و رەزامەندیی خۆمتان دەدەمێ‌و لێزەمەی لێرازی بوونی خۆم دادەبارێنم بەسەرتانداو، لەناو بەهەشتی ریزوانی خۆمدا جێتان دەکەمەوەو ئیتر بەهۆی ئەوەوە هەتا هەتایەو هەرگیزو قەت قەت‌و بڕای بڕای لەمڕۆ بەدواوە لێتان نارەنجێم!). {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٣٧٢، ژمارە: ١٨٩٤} +

---

[١٨٠٢] تجرید البخاری/ مختصر صحیح البخاری بالکوردی/٥، ژمارە: ٢٠٣٣ = ٦٥٤٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٦٠ = ٧٠٧٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/٥١).

{تاج/٥، زنجیره: ١٥٠، ژماره: ٥٧٥٩ — خودا میهرەبانیو نەوازشت لەگەڵ خەڵکی بەهەشتدا دەنوێنیو کاڵای ڕەزامەندیی خۆییان بەباڵا دەبڕێ}.

## (٣) باب تَرَائي أهلَ الغُرَفِ كَمَا يَرى الكَوْكَبِ فِي السَّمَاءِ
## بەهەشتییەکان کە تەماشای دانیشتوانی ناو باڵەخانەکان دەکەن، کەوان لە قاتەکانی سەرەوە دەڵێی چاو بۆ ئەستێرە دەگێڕن

١٨٠٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ يَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا يَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الْغَابِرَ فِي الأُفُقِ مِنْ الْمَشْرِقِ أَوْ الْمَغْرِبِ لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ) قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: تِلْكَ مَنَازِلُ الأَنْبِيَاءِ لا يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: (بَلَى وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ رِجَالٌ آمَنُوا بِاللَّهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ) (الحديث ٣٢٥٦، طرفُهُ في: ٦٥٥٦)[١٨٠٣].

ئەبوسەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەهەشتیەکان کەتەماشای خەڵکی ناو باڵەخانەکان دەکەن کەوان لەسەرووبانەوە، وەها پیایاندا هەڵدەڕوانن وەك چاو بۆ ئەستێرە بگێڕن ئاوا، دەق وەك ئێوە چۆن چاو دەگێڕن بۆ ئەو ئەستێرە گەشانەی کە تەواو تەواو دوورکەوتوونەتەوەو، لەکەناری ئاسمان نزیك بوونەتەوەو لەخۆرهەڵاتەوە یا لەخۆرئاواوە خەریکن ئاوادەبن، دیارە کە ئەم بەرزیو نزمییەیش لەبەر جیاوازی پلەو پایەی نێوانیانەوە).

یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا!دیارە ئەو جێگە بەرزانە هەوارو بارەگای پێغەمبەرانن، پێغەمبەران نەبێ کێ دەگاتە ئەوێ؟ فەرمووی: (وانییە،

---

[١٨٠٣] تجرید/٣، ژمارە: ١٣١٧ = ٣٢٥٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٦١ = ٧٠٧٣ ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا = شیحا = ترقیم شیحا لصحیح مسلم. (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/٥١).

بەو خودایە کەهەر خۆی خودایە کە گیانی هەمووامان والەدەستی تەوانایی ئەودا، زۆر کەسی تریش هەیە، کەدەگەنە ئەو پلەو پایە بەرزانە، لەگەڵ ئەوەشا پێغەمبەر نەبوون، بەلام لەئۆمەتەکانیان بوون، باوەڕی ساخیان بەخودا هەبووەو، بەدەمەو بەدڵو بەکردەوەی باش باوەڕیان بەپێغەمبەران بووە) (ش/ت- تاج/١٠ل — ٤٤٣ ز- ١٣٨ ف- ١. باسی هۆدەو ماڵی بەهەشتیەکان).

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، لە ژمارە: (١٩٦١)ی پوختەی موسلیمە:

عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ لَيَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا تَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الدُّرِّىَّ الْغَابِرَ مِنَ الأُفُقِ مِنَ الْمَشْرِقِ أَوِ الْمَغْرِبِ، لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ تِلْكَ مَنَازِلُ الأَنْبِيَاءِ، لاَ يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: «بَلَى وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ، رِجَالٌ آمَنُوا بِاللَّهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ». {الحديث: ٧٠٧٣ = ٧١٠٠ فم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية/٣، رقم: ١٣١٧ = ٣٢٥٦، ٦٥٥٦ فتح الباري. تحفة الأراف: ٤١٧٣} :

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێو سەرو ماڵو منداڵو گیانو دڵو هەستو نەسنت گشتی بەقوربانی تۆزی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ لەمەدینەی نازدارو خودا چاوی دڵو دەروونو سەرمان بەو سورمەیە رۆشن بکاتەوە).

دەفەرموێ: (بەهەشتییەکان کە تەماشای دانیشتوانی ناو باڵەخانەکان دەکەن، کەوان لەقاتە هەرە بەرزەکانی سەروویانەوە، وەها پیایاندا هەڵدەڕوانن وەك چاو بۆ ئەستێرە بگێڕن ئاوا، دەق وەك چۆن ئێوە چاو دەگێڕن بۆ ئەو ئەستێرە گەشانەی کەتەواو تەواو دوورکەوتوونەتەوەو، لەکەناری ئاسمان نزیکبوونەتەوەو لەخۆرهەڵاتەوە، یان لەخۆر ئاواوە خەریکن ئاوادەبن!

دیاره کەئەم بەرزیو نزمییەیش لەبەر جیاوازیی پلەو پایەی نێوانیانە!

یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! دیارە کە ئەوجێگە بەرزانە هەوارو بارەگای پێغەمبەرانن، پێغەمبەران نەبێ کێ دەگاتە ئەوێ؟ فەرمووی: (وانییە، بەو خودایە کەهەر خۆی خودای بەهەقو راستو دروستە، کە گیانی هەمووان وا لەدەستی توانایی ئەودا، زۆر کەسانی تریش هەن، جگە لە پێغەمبەران، کە دەگەنە ئەو پلەو پایە بەرزانە، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەر نەبوون، بەڵام لە گەلانی ئەوان بوون، باوەڕی ساخیان بەخودا هەبووەو، هەروا بەدەمو بەدڵو بە کردەوەی باش باوەڕیان بە پێغەمبەر هەبووە!) . {تاج/٥، زنجیرە: ١٣٩، ژمارە: ٥٧٢٤ — هۆدەو ماڵی بەهەشتییەکان} + {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٣٧٢، ژمارە: ١٨٩٠ — ئەو خۆشیو بەهرانەی کەخودا لە بەهەشتا ئامادەی کردوون بۆ بڕواداران}.

١٨٠٤- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ لَيَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا تَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الْغَابِرَ مِنَ الأُفُقِ مِنَ الْمَشْرِقِ أَوِ الْمَغْرِبِ، لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ تِلْكَ مَنَازِلُ الأَنْبِيَاءِ، لاَ يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: «بَلَى وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ، رِجَالٌ آمَنُوا بِاللَّهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ». {الحديث: ٧٠٧٣ = ٧١٠٠ فم. تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى = الترجمة الكردية/٣، رقم: ١٣١٧ = ٣٢٥٦، ٦٥٥٦ فتح البارى. تحفة الأراف: ٤١٧٣}:[١٨٠٤]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێو سەرو ماڵو مناڵو گیانو دڵو هەستو نەستت

---

[١٨٠٤] بڕوانە ژمارە: (١٨٠٣) (بخاری رقم الكتاب/٥٩ رقم الباب/٨).

گشتی بەقوربانی تۆزی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ لەمەدینەی نازدارو خودا چاوی دڵو دەروونو سەرمان بەو سورمەیە رۆشن بکاتەوە).

دەفەرموێ: (بەهەشتییەکان کە تەماشای دانیشتوانی ناو باڵەخانەکان دەکەن، کەوان لەقاتە هەرە بەرزەکانی سەروویانەوە، وەها پیایاندا هەڵدەڕوانن وەك چاو بۆ ئەستێرە بگێڕن ئاوا، دەق وەك چۆن ئێوە چاو دەگێڕن بۆ ئەو ئەستێرە گەشانەی کەتەواو تەواو دوورکەوتوونەتەوەو، لەکەناری ئاسمان نزیکبوونەتەوەو لەخۆرهەڵاتەوە، یان لەخۆر ئاواوە خەریکن ئاوادەبن!

دیارە کەئەم بەرزیو نزمییەیش لەبەر جیاوازیی پلەو پایەی نێوانیانە!

یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! دیارە کە ئەوجێگە بەرزانە هەوارو بارەگای پێغەمبەرانن، پێغەمبەران نەبێ کێ دەگاتە ئەوێ؟ فەرمووی: (وانییە، بەو خودایە کەهەر خۆی خودای بەهەقو راستو دروستە، کە گیانی هەمووومان وا لەدەستی توانایی ئەودا، زۆر کەسانی تریش هەن، جگە لە پێغەمبەران، کە دەگەنە ئەو پلەو پایە بەرزانە، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەر نەبوون، بەڵام لە گەلانی ئەوان بوون، باوەڕی ساخیان بەخودا هەبووەو، هەروا بەدەمو بەدڵو بە کردەوەی باش باوەڕیان بە پێغەمبەر هەبووە!) . {تاج/٥، زنجیرە: ١٣٩، ژمارە: ٥٧٢٤ — هۆدەو ماڵی بەهەشتییەکان} + {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٣٧٢، ژمارە: ١٨٩٠ — ئەو خۆشیو بەهرانەی کەخودا لە بەهەشتا ئامادەی کردوون بۆ بڕواداران} .

## (٦) باب أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ وصفاتهم وَ أزواجهم

## یەکەم دەستە کە دەچنە ناو بەهەشت لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردەن، وە باسی شێوەی شیرینی خۆیانو هاوسەرەکانیان

١٨٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ، مِنْ أُمَّتِي عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ نَجْمٍ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً، ثُمَّ هُمْ بَعْدَ ذَلِكَ مَنَازِلُ، لاَ يَتَغَوَّطُونَ وَلاَ يَبُولُونَ، وَلاَ يَمْتَخِطُونَ وَلاَ يَبْزُقُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَمَجَامِرُهُمُ الأَلُوَّةُ وَرَشْحُهُمُ الْمِسْكُ، أَخْلاَقُهُمْ عَلَى خُلُقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، عَلَى طُولِ أَبِيهِمْ آدَمَ، سِتُّونَ ذِرَاعًا»، قَالَ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ: عَلَى خُلُقِ رَجُلٍ. وَقَالَ أَبُو كُرَيْبٍ: عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ، وَقَالَ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ: عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ. {الحديث: ٧٠٧٩ = ٧١٠٦ فـم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = تجريد البخاري بالكوردي/٣ رقم:١٣١٢ = ٣٢٤٥، ٣٢٤٦، ٣٢٥٤، ٣٣٢٧. ابن ماجة. زهد: ٤٣٣٣. تحفة الأشراف: ١٢٥٢٥}:[١٨٠٥]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودو سڵاوو میهرەبانیو رەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێو، سەرومالّو منالّو گیانو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دینکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: (یەکەم دەستەیێ کەدەچنە بەهەشت، لەسەر شێوەی مانگی چواردەن، ئەم یەکەم کۆمەڵە لە نەتەوەی ئیسلامی منو لە موسوڵمانانن، دەستەی دوای ئەوان وەك گەشترین ئەستێرەی ئاسمان وان، لەبەهەشتا بەهەشتیەکان دەبن بە چەندین پلەو پایەوە، کە هەندێکیان لە هەندێکیان نایابترن، خەڵکی بەهەشت نەسەراو دەکەن، نە گمێز دەکەن، نە چڵم

---

(١٨٠٥) تجريد البخاری بالکوردی/٣، ژمارە: ١٣١٢ = ٣٢٤٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٥٧ = ٧٠٧٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/١).

دەسرن، نـە تـفـو بەلغـەم رۆدەكـەنو (نـە قـرخنن‌و لـرخنن) شـانەكانیان زێـڕە، بخووریـان عـوودەو لـە بخووردانەكانیانـدا عـوودی هینـدی دەسـووتێنن، كـە خۆشترین بۆنی هەیە، ئارەقیـان میـسكە، رەفتـارو رەوشـت‌و شـێوەیان وەك یـەك جوانە، ناشیرین‌و بـەد رەوشـتیان تیـادا نییـە، لەسـەر رەفتـارو شـێوەو قەلافـەتی ئادەمی باوكیانن، بالایان شەست باڵ درێژە).

ئیمـامی موسـلیم (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) ئـەم فەرمـوودەیـەی لـەدوو مامۆستای خۆیەوە دەرهێناوە، كە ئەم دوو مامۆستایانەی موسلیم: ئەبوبـەكری كوڕی ئەبو شەیبەو ئەبو كورەیبن، كـە لەخوێندنـەوەو گێڕانـەوەی دوو وشـەدا، كەمێ جیاوازییان هەیە، كە ئەو جیاوازییانە كاریگەرییان لەسەر واتاو مەبەست هەیە، جا لەم روانگەیەوە ئیمامی موسلیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:

١- ئەبوبەكر، كە ناسراوە بە (ئیبنو ئەبی شەیبە) وشەی (علی خلق) ئـاوا خوێندۆتەوە: (عـەلا خولـوقی). واتـە: لەسـەر رەفتـارو خـووی یـەك پیـاو، بـەلام ئـەبو كورەیـب هـەمان وشـەی ئـاوا خوێندۆتـەوە (عـەلا خـەلقی). واتـە: لەسـەر شێوەو قەلافەتی یەك پیاو.

٢- ئـەبو كورەیـب فەرموویـەتی (عَلَـى طُـولِ أَبِـيهِمْ آدَم) بـەلام ئیبنـو ئـەبو شەیبە فەرموویەتی: (عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ).

**روونكردنەوە:**

١- بـەكۆی دەنـگ ژنـان هـەم زۆرینـەی خـەڵكی بەهەشـت‌و هـەم زۆرینـەی خەڵكی دۆزەخـن بەڵگـەی رۆشـنی زۆر لەسـەر ئـەم بابەتـە لـە سـوننەتدا هەیـە. {بڕوانە: ژمارە: ١٩٧٠ لەپوختەی موسلیم}.

٢- ئیبنو سیرین، كە خەونزانێكی گەورە بـووە، لـەناو كـوردەواری خۆمانـدا بەناوبانگە، ناوی موحەممەدی كوڕی شیرینە، ناسراویشە بە (ئەبوبـەكری كـوڕی




**ئەبو عەمری ئەل‌بەصری) پێشەواو ئیمامی سەردەمی خۆی بووە، لە کۆمەڵێکی زۆر، لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕانەوەی هەیە، وەك ئەنەسی کوڕی مالیكو زەیدی کوڕی ثابیتو حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالیبو ئەبو هورەیرەو دایکی باوەڕداران عائیشەو ئوم عەطیەو کەسانی تریش، کۆمەڵێ شاگردی ناوداری بووە لە تابیعین کە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، وەك: شەعبیو خالیدی ئەل- حذذاو عاصمی ئەل‌ئەحوەلو قەتادە، لەڕێگەی عیکریمەوە، فەرموودەی لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاوەتەوە ئیمامی بوخاری دەفەرموێ: ئیبنو سیرین لەسەردەمی فەرمانڕەوایی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا چوو بۆ حەج، لەو ماوەیەدا فەرموودەی لێ وەرگرتووە.**

**دوو ساڵ لە جێنشینی عوثمان دەمێنێ، کە ئیبنو سیرین لەدایك دەبێ. هیشامی کوڕی حسان دەیفەرموو: (راستترین کەس لەسەردەمی خۆمدا کەپێی گەیشتووم، کە فەرموودەم لێ وەرگرتووە: موحەممەدی کوڕی سیرینە).**

**ئیبنو سیرین بەصرییە تابیعییە، جێگەی متمانەو باوەڕی فەرموودە شوناسەکانە، بەڕاستی پێشەوایەکی زاناو شارەزای ئایینو یاسا نامەی خودا بوو، زۆر بە وەرعو بە تەقوا بوو.**

**ئیبنو عەون دەیفەرموو: باشترین کەس بوو کە ئومێدی خێری لێ بکرێ بۆ نەتەوەی ئیسلام، لەهەمان کاتدا هەتا دەیتوانی نەفسی خۆی دەچرووساندەوە. هەروا ئیبنو عەون دەیفەرموو: لەم جیهانەدا، وەك ئەم سێ کەسە پیاوی زاناو باشم نەدیوە:**

**١- موحەممەدی کوڕی سیرین لە عێراق.**

**٢- قاسمی کوڕی موحەممەد لەحیجاز.**




٣- رجائی کوڕی حەیوە لەشام، شازی ئەم سیانەیش موحەممەدی کوڕی سیرینە. کەمێ کەڕ بووە، شەرعزانێکی وەك خۆی کەم بوو، لە قەزاوەتا دەستی بالآی هەبوو.

ئیبنو حیببان دەیفەرموو: موحەممەدی کوڕی سیرین ئەورەعترینی کەسی خەڵکی بەصرە بوو، شەرعزان (فەقیە)ێکی گەورە بوو، پیاوێکی ڕێزداری پایە بەرزبوو، فەرموودەکانی لەبەربوو، زۆر بەجوانیو ڕەوانی، خەونزانێکی ناسراوە. لەتەمەنی (٧٧) حەفتاو حەوتساڵیدا عەمری خودایکرد.

ئەم چەند هەواڵە لە (البدایة والنهایة)ی ئیبنو کەثیرەوە سەبارەت بە ئیبنو سیرین ڕاگوێز دەکەین:

١- ئەبو عەمری باوکی ئیبنو سیرین، لە کۆیلە دیلەکانی عەینول تەمرە، خالیدی کوڕی وەلید دیلی کرد، ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك کڕیو موکاتەبەی لەگەڵ کردو ئازادبوو، کۆمەڵێ منالی لێ بوو، هەموویان لە خاسانی خودان:

أ- موحەممەد.

ب- ئەنەسی کوڕی سیرین.

ج- مەعبەد.

د- یەحیا.

هـ- حەفصە.

و- کەریمە هەرشەشیان تابیعینو هەر شەشیان ثقەو متمانە پێکراوی پیاوانی فەرموودەن.

٢- دەستووری ئیبنو سیرین وابوو، کە لەلایا باسی خراپەی کەسێ بکرایە، ئەو بە پێچەوانەوە باسی باشەی ئەوی دەکرد.

قووتیو بەسوننەتنەکراوی حەشر دەکرێنو کۆدەکرێنەوەو دەبرێن بۆ مەیدانی مەحشەرو لێپرسینەوە، بۆلای خودای گەورە).

ئەوجا خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) ئەم ئایەتەی بۆ پشتیوانی ئەم مەبەستە خوێندەوە: {كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ } (سورة الأنبياء-٢١/١٠٤)

واتە: خودا لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: لەرۆژی زیانەوەدا، وەك چۆن خودای گەورە لەسەرەتاوە، مرۆڤی دروست کردووە، کەلەسکی دایکی دەکەوێتە خوارەوە، رووتو قووتو خەتەنە نەکراوەو، بێ ماڵو بێ پارەو پوولە، ئاوەهایش بەبێ کەمو زیاد، لەسەر هەمان شێوەو حاڵی رووتوقووتیو پێخاوسیو سوننەتنەکراوی خودا سەرلەنوێ دروستی دەکاتەوە!.

ئینجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: بزانن! رۆژی ژینەوە یەکەم کەسێ کە پۆشتە دەکرێتەوەو بەرگی لەبەر دەکرێتەوە ئیبراهیمە، هۆشیاربن! کە چەن پیاوێ لەگەڵ ئیسلامی من دەهێننو، بەرەولای چەپ، بەرەو ناو ئاگری دۆزەخ بەکێشیان دەکەن، ئەوانە لەتاقمەی ئەم ئایەتەن کەدەفەرموێ: {وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ} (سورة الواقعة-٥٦/٤١)

خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ بە بەرچاومەوە ئەوانە بەکێش دەکرێن بەرەو دۆزەخ، بەسەرسامی دەڵێم: ئەی پەروەردگارم! خۆ ئەمانە لەکن خۆیان هاوڕێی من بوون، ئەوە بۆ کوێیان دەبەن؟ دەفەرموێ: ئەی موحەممەد! تۆ ئاگات لێ نییە، کەئەمانە لەپاش مەرگی تۆ چی فەرتەنەیەکیان بەرپاکرد بوو، ئەوجا منیش وەك بەندەی فرەباش، عیسای

کوڕی مەریەم دەڵێم: {وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ} (سورة المائدة-٥/١١٧).

عیسای کوڕی مەریەم، لەڕۆژی ژینەوەدا، وەڵامی پەروەردگاری خۆی دەداتەوە، کەلێی دەپرسێ ئەی عیسا! ئایا تۆ کاتێ پێغەمبەر بووی بەو خەڵکەت گوتووە: کە منو دایکیشم بکەن بەخوداو وەك خودا منو دایکم بپەرستن؟ عیسا لەسەر ئەم شێوەیە وەڵامی ئەم پرسیارەی پەروەردگار دەداتەوە: پەروەردگار! من هەتا لەناویانا بووم ئاگاداریم دەکردنو چاودێریم دەکردن، نەم دەهێشت کەشتی وا نابەجێ بکەن، بەڵام کاتێ تۆ منت بردەوە بۆلای خۆت ئیتر تۆ خۆت چاودێربووی بەسەریانەوە، هەروەك خۆت چاودێری بەسەر هەموو شتێکی ترەوە، خۆت دەزانی ئەی خودایە! کەشانیان چی هەڵ دەگرێ، ئەگەر سزایان دەدەی ئەوا دیارە سزاواری ئەوەنو موڵك موڵکی خۆتە، چی لێ دەکەیت ڕەوایە، کەس هەقی قسەو ڕەخنەی بۆنییە، خۆ ئەگەر بەمیهرەبانی خۆشت لێیان دەبووریت، ئەوا گەورەیی خۆتە، بەڕاستی تۆ ئەی خودایە! دڵنیام کەتەواناو لێزانو داناو زاناو کاردروستی، کاری نابەجێو هەڵە لەتۆوە دوورە.

خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: جا منیش وەك عیسا دەڵێم: خودایە! من هەتا لەناویانا بووم چاودێریم کردوون، لەپاش مەرگم خۆت ئاگات لێیانە، سزایان دەدەی کەیفی خۆتە، لێیان خۆش دەبی، فەرمان فەرمانی تۆیە.

خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەپاش ئەم پرسیارو وەڵامە، دەفەرموێ پێم: ئەی موحەممەد! ئەمانە هەر لەگەڵ تۆ مردیتو لێیان جیابوویتەوە، پاشەو پاش لەئایین هەڵگەڕانەوەو پاش گەز بوونەوە! (تاج/٤ ژ/٦ ژ/٣٨٥١ – سوورەتی مائیدة) + (ریاض/١ ژ/١٦ ژ/١٦٥ + ریاض/٢ ژ/٥١ ژ/٤٢٥).

١٨١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلاَثِ طَرَائِقَ: رَاغِبِينَ، رَاهِبِينَ، وَاثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلاَثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ، تَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا، وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا». {الحديث: ٧١٣١ = ٧١٥٨ فم. تجريد البخاري بالكوردى/٥، رقم: ٢٠٢٨ = ٦٥٢٢ فتح الباري. نسائى. جنائز: ٢٠٨٤. تحفة: ١٣٥٢١}:[١٨١٩]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تۆزێ لەپێش بەرپابوونی قیامەتا، حەشرێ لە جیهاندا دەبێ، لەو حەشرەدا مەردوم بەسێ کۆمەڵ کۆدەکرێنەوەو دەبن بەسێ دەستەی سەرەکییەوە:

**دەستەی یەکەم:** پێشەنگەکانن، ئارەزوومەندانی دیداری خودانو، لەرابووردووی خۆیان بێزارن، چونکە ئەوەندە تامەزرۆی دیداری خودای خۆیانن، لەهەموو شتێکی تر بێزارن.

**دەستەی دووەم:** ئەوانەن کە دوو کەس، یاسێ کەس، یاچوار کەس، یا پێنج کەس، یا شەش کەس، یا حەوت کەس، یا هەشت کەس، یا نۆکەس، یا دەکەس، بەسەرەو بەنۆرە، بەرودوای یەکتری، سواری یەك وشتر دەبن، یاخود دووکەس دوو کەس، یا سێ کەس سێ کەس، یا چوار کەس چوار کەس... تاد، پێکەوە لە پاشکۆی یەکترییەوە سواری یەك وشتر دەبنو ئەم دەستەیە لە پلەو پایەدا ناوەندین.

[١٨١٩] تجريد البخارى بالكوردى/٥، ژمارە: ٢٠٢٨ = ٦٥٢٢ بخارى. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٥١ = ٧١٣١ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٤٥).

**دەستەی سێیەم:** وە هەرچی لەمانە مایەوە دەستەی سێیەمن و ئایەخی هەرسیٚ کۆمەڵەکەن، ئاگر وەك شوان دەیانداتە بەرو وەك ران بەرەو سارای مەحشەر لێیان دەخوڕێ، ئیتر چەند ڕۆژ بەرێوەبن ئاگرەکەیش لەگەڵیاندایە، لە هەرکوێ شەو بکەنەوە ئاگرەکەیش بەدیاریانەوە لەوێ شەو دەکاتەوە، لە هەرکوێ نیوەڕوان وچان بگرن، ئاگرەکەیش لەگەڵیانا لەوێدا وچان دەگرێ، لە هەرکوێ بەیان بکەنەوە، ئاگرەکەیش هەروا، لەکوێ ئێوارە بکەنەوە ئاگرەکەیش هەروا). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٥٦٤١ — زیندوو بوونەوەو کۆمەڵبوون بۆ لێپرسینەوە} .

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم واتایە بۆ ئەم فەرموودەیە، کە ئەم کۆبوونەوەیە لەدنیادا دەبێ، وەسێ کۆمەڵەکەیش ئەو سێ دەستەیەن کە باسکران ئەمە پەسەندی ئیمامی نەوەوییە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا، وە لێکدانەوەی تریش بۆ ئەم فەرموودەیە کراوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ئێمە لە کرۆکی حاڵەکە تێ بگەین و پەندو ئامۆژی لێ وەربگرین و خۆمانی بۆ ئامادە بکەین.

### (١٥) باب في صِفَةِ يَوْمِ القِيَامَةِ أَعَانَنَا اللّٰهُ عَلَى أَهْوَالِهَا
### باسی چۆنێتی ڕۆژی قیامەت، خودا بە لوتفی خۆی پەنامان بدا لەو کشتە ترس و سامو بیمانەی کە وا لە ڕێماندا

١٨٢٠- عن ابن عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «(يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ)، قال: (حتى يَقُومَ أَحَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ» . (الحديث ٧١٣٢ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧١٥٩ حسب

ترقيم فتح الملهم شرح صحيح الإمام مسلم. تجريد البخاري بـالكوردي/٤ رقـم: ١٧١٤ = ٤٩٣٨، ٦٥٣١ فتح الباري).[١٨٢٠]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ = ڕەزای خودا لەخۆی و لەعومەری باوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ} (المطففين — سورەتی ژمارە:٨٣ ئایەتی ژمارە:٦) واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی گەلێ گەورەیە، ئەو خەڵکە سەرجەم لەبەر بارەگای پەروەردگاری هەردوو جیهان دا، بۆ پرسینەوەو دادپرسی، دەستەو نەزەر ڕادەوەستن.

فەرمووی: لەکاتی ڕوودانی ڕاوەستانی ئەم ڕۆژەدا هەڵوێست وا ئاڵۆز دەبێ و، ئەوەندە بەپێوە ڕادەوەستن و ئەوەندە ماندوو و شەکەت دەبن، هی وایان هەیە ئەوەندە دەوەستێ، هەتا بنا گوێی لەئارەقی خۆی دا دەچەقێ. (تاج/٤ ز/٦٦ ژ/٤٢٠٥ — سورەتی موطەففیفین).

١٨٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَعْرَقُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَذْهَبَ عَرَقُهُمْ فِي الْأَرْضِ سَبْعِينَ ذِرَاعًا وَيُلْجِمُهُمْ حَتَّى يَبْلُغَ آذَانَهُمْ. (الحديث):[١٨٢١]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (لەڕۆژی زیانەوەدا ئەو خەڵکە دەکەونە سەخڵەتیەکی واوە ئارەق دەکەن، ئارەقێکی زۆر زۆر، تەنانەت حەفتا باڵ ئارەقیان بەناخی

---

[١٨٢٠] تجرید/٤، ژمارە: ١٧١٤ = ٤٩٣٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٧٤ = ٧١٣٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٨٣).

[١٨٢١] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٣٠ = ٦٥٣٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٥٤ = ٧١٣٤ ترقیم شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٤٧).

زەویـدا دەچـێتە خـوارەوە، وەکـی تـریش پـەنگاوی ئـارەقی لەشـیان وائـەوق دەکاتەوە، هـەتا دەگاتـە لالغاومیـان، گـەلێ جار دەگاتـە بنـاگوێ یـان!) . (ریـاض/١ ل/٣١٤ ژ/٤٠٣/٨/ ش).

ئەمـەیش گێڕانـەوەی پێـشەوا موسـلیمە، کـە وا لـە پوختـەی موسـلیم (موختەصەری صەحیحی موسلیم)دا:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) قَـالَ: «إِنَّ الْعَـرَقَ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ لَيَذْهَبُ فِى الأَرْضِ سَبْعِينَ بَاعًا، وَإِنَّهُ لَيَبْلُغُ إِلَى أَفْوَاهِ النَّـاسِ أَوْ إِلَـى آذَانِهِـمْ». (يَـشُكُّ ثَـوْرٌ أَيَّهُمَـا). {الحـديث: ٧١٣٤ = ٧١٦١ فـم = ف.م = فـتح الملـهم + تجريـد البخارى بالكوردى/٥، رقم: ٢٠٣٠ = ٦٥٣٢ فتح الملهم. تحفة الأشراف: ١٢٩١٩} :

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (لـەڕۆژی زیانـەوەدا، ئـەو خەڵکـە دەکەونـە سـەخڵەتییەکی واوە، ئـارەق دەکـەن، ئـارەقێکی زۆر زۆر، بـەهۆی ناڕەحـەتیو مەینـەتی زۆرەوە، تەنانـەت ئارەقیـان حـەفتا گـەز بـەناخی زەویـدا دەچـێتە خوارەوە!

لەلایـەکی تریـشەوە پـەنگاوی لافـاوی ئـارەقی لەشـیان وا ئـەوق دەکاتـەوە، هەتا دەگاتە لالغاومیان، گەلێ جار دەگاتە بناگوێیان!).

فەرموودەکـە لـە بوخاریـدا، بـەم شـێوەی پێـشەومیە، هـەروا لـە ریـاض الـصالحیندا، بـەڵام لـە موسـلیمدا، لـە کۆتـاوە ئـەم پترییـە هەیـە: ثـەور کـە لـە ئەبولغـەیثـەوە، ئـەویش لـە ئـەبو هـورەیرەوە، ئـەم فەرموودەیـە دەگێڕێتـەوە، گومـانی بـۆ پەیـدابوو بـوو، لـەوەدا کـە فەرموویـەتی: (دەگاتـە لالغاومیـان) یـا فەرموویەتی: (دەگاتە بناگوێیان!). {تـاج/٥، زنجیرە: ١٢٠، ژمـارە: ٥٦٤٩ + ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٤٠٣ — ترسان لەقاری خودا} .

## (١٧) باب عرض مقعد الميت منَ الجَنَة أوالنَار علَيه وَ إثبَاتُ عَذاب القَبْر وَالتَعوذ مِنهُ

## ئەوەی دەمرێ بەیانیانو ئێواران جێگەی خۆی لەبەھەشتا پێ نیشان دەدرێ، ئەگەر بەھەشتی بێ، وە جێگەی خۆی لەدۆزەخا پێ نیشان دەدرێ ئەگەر دۆزەخی بێ، لەناو گۆڕەکەیدا، سزای ناو گۆڕ چەسپاوەو پەناگرتن بەخودا لەسزای ناو گۆڕ کارێ پەسەندەو سوننەتە

١٨٢٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضی الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم) قَالَ: « إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، يُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ». {الحديث: ٧١٤٠ = ٧١٦٧ فـم. تجريد/٢/٧٨، رقم: ٦٥٨ = ١٣٧٩، ٣٢٤، ٦٥١٥}:[١٨٢٢]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێوە کاتێ دەمرن، گشت ڕۆژێ بەیانیانو ئێواران، هەرکەسەتان، جێگەی خۆی پیشان دەدرێ، جا ئەگەر بەھەشتی بێ ئەوا جێگەی خۆی لەبەھەشتا دەبینێ، وە ئەگەر دۆزەخی بێ، ئەوا جێگەی خۆی لە دۆزەخا دەبینێ، وە پێی دەڵێن: ئەمە جێگەتە، لە ڕۆژی قیامەتا، کەخودا زیندووت دەکاتەوە، دێیتە ئێرەو ئەمە ماڵی ھەتا ھەتاییتە).

{تاج/١/٥٧٠، زنجيره: ٢٢٤، ژمارە: ١١٤٨} .

١٨٢٣- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رضی الله عنه) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم) بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَسَمِعَ صَوْتًا، فَقَالَ: « يَهُودُ تُعَذَّبُ فِي قُبُورِهَا ».

---

[١٨٢٢] تجريد/٢، ژمارە: ٦٥٨ = ١٣٧٩ بخاری. پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ٤٩٠ = ٧١٤٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٢٣ رقم الباب/٩٠).

{الحديث: ٧١٤٤ = ٧١٧١. تجريد/٢/٧٨ رقم: ٦٥٦ = ١٣٧٥. نسائى. جنائز: ٢٠٥٨. تحفة الأشراف: ٣٤٥٤} :[١٨٢٣]

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (رەزای خوداى لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش خۆرئاوا بوون، تەشریفی دەرچوو بۆ دەرەوەی مەدینە، دەنگێکی سامناکی بیست، لەبارەیەوە فەرمووی: (ئەوە جوولەکەن لە گۆڕەکانیانا سزاو ئازار دەدرێن!).

١٨٢٤- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِى قَبْرِهِ، وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ، إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ». (زَادَ فِي رِوَايَةٍ: إِذَا انْصَرَفُوا) قَالَ: « يَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُقْعِدَانِهِ، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِى هَذَا الرَّجُلِ؟». قَالَ: « فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ ». قَالَ: « فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ قَدْ أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنَ الْجَنَّةِ، قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا ». قَالَ قَتَادَةُ: وَذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ فِى قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِرَاعًا، وَيُمْلأُ عَلَيْهِ خَضِرًا إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ). {الحديث: ٧١٤٥ = ٧١٧٢ فم. تجريد/٢/٥٨، رقم: ٦٣٨ = ١٣٣٨، ١٣٧٤. أبو داود. جنائز: ٣٢٣١. نسائى. جنائز: ٢٠٥٠. تحفة الأشراف: ١٣٠٠} :[١٨٢٤]

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ بەندە دایدەنێن لەناو گۆڕەکەیداو، هاوڕێکانی بەرەودوا دەگەڕێنەوە، هێشتا گوێی لە چرپەی

---

[١٨٢٣] تجرید/٢، ژمارە: ٦٥٦ - ١٣٧٥ بخاری. پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ٤٩٤ = ٧١٤٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٣ رقم الباب/٨٨).

[١٨٢٤] تجرید/٢، ژمارە: ٦٣٨ = ١٣٧٤ بخاری. پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ٤٩١ - ٧١٤٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٣ رقم الباب/٨٧).

کەوشەکانیانە، کە دوو فریشتە کە ناویان نەکیرو مونکەرە، دەگەنە سەری‌و دایدەنیشێنن‌و پێی دەڵێن: باوەڕت چییە سەبارەت بەم پیاوە؟ واتە: دەربارەی ئەم پیاوە کەناوی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلایە بیرو باوەڕت چییەو چی نییە؟! فەرمووی: (جا ئەوەی موسوڵمان بێ، لە وەڵامیانا بە زمانێکی ڕەوان دەڵێ: ئاگادارم کە ئەم پیاوە بەندەی باش‌و پێغەمبەری خودایە، ئەوجا پێی دەگوترێ: ئائەوە جێگەی تۆ بوو لەناو ئاگری دۆزەخدا، سەیریکە خودا بۆی گۆڕیویتەوە بەو شوێنە خۆشە، لەبەهەشتا، جا ئەویش هەردوو جێگەکە بەچاوی خۆی دەبینێ، قەتادە فەرمووی: باسکرا بۆ ئێمە: کە ئیتر حەفتا باڵ گۆڕەکەی گوشاد دەکرێ بۆی‌و پڕ ئەبێ لە بەهرەو خەڵاتی تەڕو تازەو زۆر هەتا ڕۆژی قیامەت).

لە بوخاریدا ئەمەی پترە: (بەڵام بێبڕوا (یا دوو ڕوو) کە هەمان پرسیاری لێ دەکرێ، دەڵێ: ئاگام لەهیچ نییە، ئەوەندە هەیە سەیری دەمی خەڵکم کردووە، ئەوان چییان گوتووە منیش ئەوەم گوتووە! ئەوانیش پێی دەڵێن: دەك هەر نەزانیت! ئیتر یەك گورزی ئاسنینی لێ دەدەن، ئەوسا لەتاوا یەك قیژە دەکا، هەرچی لەدەورو بەریەتی دەیبیستێ، مرۆڤو جنۆکە نەبێ، ئەو دوو ڕەگەزە نایبیستن). {تاج/١/٥٦٨، ژمارە: ١١٤٦، زنجیرە: ٢٢٤}.

١٨٢٥- عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا أُقْعِدَ الْمُؤْمِنُ فِي قَبْرِهِ، أُتِيَ، ثُمَّ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ). (الحديث١٣٦٩- طرفه في:٤٦٩٩): [١٨٢٥]

[١٨٢٥] تجرید/٢، ژمارە: ٦٥٢ - ١٣٦٩ بخاری. پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ٤٩٢ - ٧١٤٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٣ رقم الباب/٨٧).

بەراء (رەزای خوای لێ بێ) گوتی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (موسوڵمان کاتێ دەینێژن، دوو فریشتە - کە ناویان نەکیرو مونکیرە - بۆ تاقیکردنەوە دێنەسەری و دایدەنیشێنن و لێی دەپرسن: خوات کێیە؟ پێغەمبەرت کێیە، لەسەر چی ئاینێکی ؟ خودای گەورەیش توفیقی دەدات و دەڵێ: اشهد ان لا اله الا الله وان محمد رسول الله).

شایەتی دەدەم کە هەرخودا خودایەو خودای بەهەقی تر نییەو محمد پێغەمبەری خودایە، خودای من ئەڵلایەو پێغەمبەرم موحەممەدە، جا مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزە ئەم پرسیارو وەڵامەی ناوگۆڕە، کە لەقورئان دا دەفەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ -١٤-٢٧- ﴾.

واتە: خودای گەورە بەهۆی ئەم وتارە دامەزراوە جوانەوە، کە ووشەی (لا اله لا الله محمد رسول الله) یە موسوڵمان رزگار دەکاو دایدەمەزرێنێ لە دنیاو قیامەتدا. (تاج/١/٥٨٠ ف/١) بڕوانە: فەرموودەی ژمارە/٦٣٨ لەتەجرید.

لە پوختەی موسلیمدا، ژمارە: (٤٩٢)دا ئاوایە:

عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ). قَالَ: « نَزَلَتْ فِى عَذَابِ الْقَبْرِ، يُقَالُ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّىَ اللَّهُ، وَنَبِيِّىَ مُحَمَّدٌ (صلى الله عليه وسلم)، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِى الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِى الآخِرَةِ). {الحديث: ٧١٤٨ = ٧١٧٥ فـم. تجريد/٢/٧٥، رقم: ٦٥٢ = ١٣٦٩، ٤٦٩٩. أبو داود. سنة: ٤٧٥٠. ترمذي. تفسير: ٣١٢٠. نسائي. جنائز: ٢٠٥٦. ابن ماجة. زهد: ٤٢٦٩}:

بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: {يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ – ١٤/٢٧} واتە: خودای گەورە بەهۆی ئەم وتارە

دامەزراوە جوانەوە کەوشەی (لاَ إلهَ إلاّ اللّهُ وَأنَّ محمداً رَسُولُ اللّه)یە موسوڵمان رزگار دەکاو دایدەمەزرێنێ لە دنیاو لە قیامەتدا} . فەرمووی: ئەم ئایەتە سەبارەت بەسزای گۆڕ هاتە خوارەوە، موسوڵمان کاتێ دەمرێو دەینێژن، دوو فریشتە (کە ناویان نەکیرو مونکیرە) بۆ تاقیکردنەوە، دێنە سەرێو دایدەنیشێننو لێی دەپرسن: خوات کێیە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ لەسەرچی ئاینێکی؟ خودای گەورەیش ئاڕاستەی دەکاو دەڵێ: خودای من یەزدانی پاکەو موحەممەد پێغەمبەرمە، جا مەبەست ئەم پرسیارو وەڵامەیە، کە لەقورئاندا دەفەرموێ: {يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ – ٢٧/١٤ – سورة إبراهيم} . {تاج/١/٥٦٨، ژمارە: ١١٤٥} .

١٨٢٦- عَنْ ابِي طَلْحَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّ نَبِيَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) امَرَ يَوْمَ بَدْرٍ بارْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ رَجُلا مِنْ صَنَادِيدِ قُرَيْشٍ فَقُذِفُوا فِي طَوِيّ مِنْ اطْوَاء بَدْرٍ خَبِيث مُخْبِث وَكَانَ اذا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ اقَامَ بالْعَرْصَةِ ثلاث لَيَالٍ فَلَمَّا كَانَ بِبَدْرٍ الْيَوْمَ الثالِث امَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَشُدَّ عَلَيْهَا رَحْلُهَا ثمَّ مَشَى وَاتَّبَعَهُ اصْحَابُهُ وَقَالُوا: مَا نُرَى يَنْطلِقُ الا لِبَعْض حَاجَتِهِ حَتَّى قَامَ عَلَى شَفَةِ الرَّكِيِّ فَجَعَلَ يُنَادِيهِمْ باسْمَائِهِمْ وَاسْمَاء ابائِهِمْ يَا فُلانُ بْنَ فُلان وَيَا فُلانُ بْنَ فُلان ايَسُرُّكُمْ انَّكُمْ اطعْتُمْ اللّهَ وَرَسُولَهُ فَانَّا قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا) قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللّهِ مَا تُكَلِّمُ مِنْ اجْسَادٍ لا ارْوَاحَ لَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَالَّذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا انْتُم باسْمَعَ لِمَا اقُولُ مِنْهُمْ) (الحديث:٣٩٧٦): [١٨٢٦]

ئەبو طەلحە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لە ڕۆژی بەدردا، فەرمانی فەرموو لاشەی بیستو چوارکەسیان

[١٨٢٦] تجريد/٤، ژمارە: ١٥٢٧ = ٣٩٧٦ بخاری + تجريد/١، ژمارە: ١٧٢ = ٤٤٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٥٩ = ٧١٥٢ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٨).

لەگەورە پیاوانی قورەیش، کە لەغەزای بەدردا کوژرا بوون، برك دایە ناو بیری لەبیرەکانی بەدرەوە کە بەبەرد هەڵچنرابوون، بەڕاستی تابڵێی بیرێکی پیس و چەپەڵ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەستووری وابوو کە خودا سەری دەخست بەسەر هۆزێکا سێ شەو لەو مەیدانەدا، لەدەشتایی بەرمالان دا دەمایەوە، لە غەزای بەدریش دا لە ڕۆژی سێیەمی زاڵبوونی دا، فەرمانی فەرموو وشترەکەیان بۆ کۆپان کرد، ئەوسا سواربوو و ڕۆیست و، یارانی شوێنی کەوتن و گوتیان: ببێ و نەبێ بۆ کارێکی تایبەتی خۆی دەچێ، خەشەویست (دروودی خودای لێ بێ) سواربوو، ڕۆیشت هەتا چووە سەر لێواری بیرەکەو، لەوێ ڕاوەستاو دەستی کرد بە بانگ کردنی کافرە کوژراوەکانی ناو بیرەکەو یەکە یەکە بەناوی خۆیان و بەناوی باوکیانەوە بانگی دەکردن و دەیفەرموو: (ئەی فیساری کوڕی فیسار! ئەی ئەوەو ئەی ئەوە! ئایا پەشیمانیتان حاسڵ کردو، ئێستا خۆزگە دەخوازن کە ئەم پەندەتان بەخۆتان نەدایە، وە لە دنیادا موسوڵمانان ببونایەو، لە فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا دەرنەچوونایەو، ئەم ڕۆژی ڕەشەتان بەسەرخۆتان نەهێنایە، دەی بزانن ئەوا ئێمە لە سایەی خواوە بە ئاواتی خۆمان گەیشتین و ئەو مژدەو بەڵێنەی کە خودای خۆمان وا دەی پێ دابووین دەستمان کەوت و بە چاوی خۆمان دیمان، دیارە ئێوەش بەتۆڵەی سەختی کاری بەدی خۆتان گەیشتوون و ئەو هەڕەشەو ئێش و ئازارەی کە خودا وادەی ئەوەی پێیتان دابوو، بەچاوی خۆتان دیتان، عومەر(ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قوربان! قسەی چی لەگەڵ جستەی بێ گیاندا دەکەی؟ فەرمووی: (بەو خودایەی کەرۆحی من واله دەستیدا، ئەوانیش وەك ئێوە ئاوا گوێیان لەم قسانەی منە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ناتوانن وەلام بدەنەوە) (تاج/٨ ل/٢٠٠ ز/٨٤ ف/٦- باسی غەزای بەدر).

**ئەم فەرموودەیە لە گێڕانەوەی ژمارە: (١١٥٩)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:**

**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَرَكَ قَتْلَى بَدْرٍ ثَلاَثًا ثُمَّ أَتَاهُمْ، فَقَامَ عَلَيْهِمْ فَنَادَاهُمْ فَقَالَ: « يَا أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، يَا أُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، يَا عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، يَا شَيْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، أَلَيْسَ قَدْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا، فَإِنِّي قَدْ وَجَدْتُ مَا وَعَدَنِي رَبِّي حَقًّا »؟ فَسَمِعَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَوْلَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يَسْمَعُوا وَأَنَّى يُجِيبُوا وَقَدْ جَيَّفُوا؟ قَالَ: « وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ وَلَكِنَّهُمْ لاَ يَقْدِرُونَ أَنْ يُجِيبُوا »، ثُمَّ أَمَرَ بِهِمْ فَسُحِبُوا فَأُلْقُوا فِي قَلِيبِ بَدْرٍ. {الحديث: ٧١٥٢ = ٧١٧٩ فم. تجريد/١/١٩٠، رقم: ١٧٢ = ٢٤٠، ٢٩٣٤، ٥٢٠، ٣١٨٥، ٣٦٦٠، ٣٨٥٤، ٣٩٦٠. نسائي. جهاد: ٣٠٦ + تجريد/٤، رقم: ١٥٢٧ = ٣٩٧٦}:**

**ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تاسێ ڕۆژ وازی لە کوژراوەکانی جەنگی بەدر هێناو سەری لێ نەدان، ئەوجا چوو بۆلای لاشەکانیان، لەدیاریان ڕاوەستا، کە لاشەی بیستو چوار کەسیان بوو، لەگەورە پیاوانی بێباوەڕانی قوڕەیش، ئەوجا یەکە یەکە بەناوی خۆیانەوەو بەناوی باوکیانەوە، بانگی دەکردنو دەیفەرموو: ئەی ئەبو جەهلی کوڕی هیشام!، ئەی ئومەییەی کوڕی خەلەف!، ئەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە!، ئەی شەیبەی کوڕی ڕەبیعە!، ئەی فیساری کوڕی فیسار! ئەی ئەوەو ئەی ئەوە! ئایا پەشیمانیتان حاصڵ کردو ئێستا خۆزگە دەخوازن کە ئەم پەندەتان بەخۆتان نەدایەو لەدنیادا موسوڵمان ببونایەو لەفەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا دەرنەچوونایەو ئەم ڕۆژە ڕەشەتان بەسەر خۆتان نەهێنایە، دەی بزانن کەئەوا ئێمە لەسایەی خوداوە بە ئاواتی خۆمان گەیشتینو ئەو موژدەو بەڵێنەی کە خودای خۆمان وادەی پێدابووین دەستمان کەوتو بەچاوی**

خۆمان دیمان، دیاره ئێومیش بەتۆڵەی سەختی کاری بەدی خۆتان گەیشتوونو ئەو هەڕەشەو ئێشو ئازارو سزایەی کەخودا وادەو بەڵێنی ئەوەی پێتان دابوو بەچاوی خۆتان دیتان!). کاتێ ئیمامی عومەر گوێی لەم قسانەی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! قسەی چی لەگەڵ ئەم لاشە بێ گیانانەدا دەکەی، ئەمانە چۆن گوێیان لەقسەیەو چۆن دەتوانن کە وەڵام بدەنەوە، پاش ئەوە کە مردوونو لاشەکەیان گەنیوەو بۆگەنی کردووە؟ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوێندم بەو کەسە کەگیانی منی بەدەسە، کە دیارە خودای گەورەو سەروەرە، ئەوانیش وەك ئێوە ئاوا گوێیان لەم قسانەی منە، بەڵام ئەوەندە هەیە کەئەوان ناتوانن وەڵام بدەنەوە!). ئەوجا لاشەکانیان بەکێش کردو فڕەیان دانە ناو بیرێ لە بیرە کۆنەکانی بەدرەوە. {تاج/٤، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ٤٥٨٠}.

## (١٨) باب إثبات الحساب

## لێپرسینەوە لە ڕۆژی دوایی لە پاش زیندوبوونەوە کارێ سەلمێنراوە

١٨٢٧- عن عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قالت: قال رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « مَنْ حُوسِبَ يومَ القيامة عُذِّبَ » . فَقُلْتُ أَلَيْسَ قَدْ قالَ اللَّهُ تَعالَى: ( فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا )؟ فَقَالَ: (ليس ذلك الحساب، إنما ذاك العَرْضُ، مَنْ نُوقِشَ الحِسابَ يوم القيامةِ عُذِّب). (الحديث ٧١٥٤ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧١٨١ حسب ترقيم فتح اللهم بشرح صحيح الإمام مسلم. تجريد البخاري = مختصر

صحيح البخاري = الترجمة الكردية/١. الرقم: ٨٧ = ١٠٣، ٤٩٣٩، ٦٥٣٦، ٦٥٣٧ فتح الباري).[١٨٣٧]

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەرکەسێ لەقیامەت دا موحاسەبە بکرێ سزا دەدرێ، منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمەری خودا! خودا بمکات بەقوربانت! ئەی ئەوە نییە، کە خودای گەورە دەفەرموێ: {فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ، فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا} (سورة الإنشقاق-٨٤/٧-٨).

واتە: هەرکەسێ بەدەستی ڕاستی نامەی کرداری خۆی لەقیامەت دا وەربگرێ، بەئاسانی حیسابو لێپرسینەوەی لەگەڵ دا دەکرێ.

کەواتە: تۆ مەبەستت چییە کە دەفەرمووی: هەرکەسێ لەقیامەت دا موحاسەبە بکرێ سزادەدرێ؟

خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ لابردنی ئەم پرسە فەرمووی: ئەوەی کە لێرەدا، وادەفەرموێ، مەبەست دەورکردنەوەو ڕانواندنێکی سەرەتاییە، کە خودا لەگەڵ بەندەکەدا، دوو بەدوو چاوێ بەنامەی کرداریدا دەخشێنێو پێی دەفەرموێ: ئایا پێ دەنێیت لەم گوناحە، ئەویش عەرزی دەکا: بەڵێ، خودایش دەفەرموێ پێی: مەترسێ، من لەجیهان دا ئەم گوناهانەم بۆ پۆشیویت، ئەوا ئەمرۆکەیش خۆش دەبم لێت، لەو گوناهانە، ئەمەیش بەس بەدیمەن حیسابو لێپرسینەوەیە، دەنا هەرکەسێ لەحیسابو لێکۆڵینەوەدا، لە گەڵی دا بکۆڵنەوە بەرباد دەبێو بەفاتارەت دەچێ. (تاج/٤ ژ/٦٧ ژ/٤٤٠٧ – سوورەتی ئینشیقاق).

---

[١٨٣٧] تجريد البخاری = مختصر صحيح البخاری = الترجمه الكرديه/ المجلد الأول = تجريد/١، ژمارە: ٨٧ = ١٠٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٧٥ = ٧١٥٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣ رقم الباب/٣٥).

١٨٢٨- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ عَذَابًا، أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ، ثُمَّ بُعِثُوا عَلَى أَعْمَالِهِمْ». {الحديث: ٧١٦٣ = ٧١٩٠ فم}:[١٨٢٨]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەری خۆشەویستو نازدارم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (کاتێ خودای گەورەو مەزن سزایەکی نارده سەر هۆزێو ویستی سزایان بدا، ئیتر ئەو سزایە پاكو پیسیان وەك یەك دەگرێتەوە، بەڵام لەپاشا کەخودا زیندوویان دەکاتەوە، هەرکەسەیان بەپێی کردەوەی خۆی، تۆڵەی لێ دەستێنێ، یا پاداشی باشی دەداتەوە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٥٤٨٤، ٥٤٨٦}.

---

[١٨٢٨] تجرید البخاری - مختصر صحیح البخاری - الترجمه الكردیه - تجرید/١، ژمارە: ٨٧ - ١٠٣ بخاری. پوختەی موسلیم - مختصر صحیح مسلم = الترجمه الكردیه = المجلد الخامس = پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٧٥ - ٧١٥٤ شیحا - ترقیم وتخریج الشیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٩٢ رقم الباب/١٩).

## ٥٢- كِتَابُ الفِتَنِ وَأَشْرَاطُ السَّاعَةِ
## نامەی فەرتەنەگەل‌و نیشانەکانی هاتنی دوارِۆژ

{بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، لاپەڕە: ٥٢٢ لە ژمارە: (٥٤٨١)ەوە هەتا ژمارە: ٥٦٣٣ لە زنجیرە: ١١٦ هەروا بڕوانە: تەجریدی بوخاری بە کوردی، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٩٤ لە ژمارە: (٢٠٩٢)ەوە هەتا ژمارە: ٢١٠٣} + {تەجریدی بوخاری = پوختەی صەحیحی بوخاری کە ناسراوە بە (مختصر صحيح البخاری) دانراوی: ئەبولعباس زين الدين الزبيدی}.

### (١) باب إقْتِرَاب الفِتَنِ وَفَتح رَدْم يأجوج و مأجوجَ
### باسی نزیکبوونەوەی ئاژاوەکان‌و هاکا سەددەکەی کە زولقەرنەین، بۆ پێشگیری لە یەئجوج‌و مەئجوج دروستی کرد هاکا ئەو سەددە کونی تێ بوو

١٨٢٩- عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَيْقَظَ مِنْ نَوْمِهِ وَهُوَ يَقُولُ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ، مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ». (وَعَقَدَ سُفْيَانُ بِيَدِهِ عَشَرَةً). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: «نَعَمْ إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ». {الحديث: ٧١٦٤ = ٧١٩١ فم: فم = فتح الملهم شرح صحيح الإمام مسلم رحمة الله تعالى. تجريد البخاری = مختصر صحيح البخاری بالكوردی/٤، رقم: ١٣٤١ = ٣٣٤٦، ٣٥٩٨، ٧٠٥٩، ٧١٣٥ فتح الباری. ترمذی. فتن: ٢١٨٧. ابن ماجة. فتن: ٣٩٥٣. تحفة الأشراف: ١٥٨٨٠}:[١٨٢٩]

---

[١٨٢٩] تجريد البخاری/٤، ژمارە: ١٣٤١ = ٣٣٤٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٨٧ = ٧١٦٤ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٧).

زەینــەبی کــچی جــەحش، هاوســەری پێغەمبــەر (دروودی خــودا لەســەر پێغەمبــەرو ڕەزای خــودا لەهــەموو هــاوەڵو هاوســەرانی بــێ) فــەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەو ڕاپەڕیو هات بۆلام، ڕووی سوور هەڵگەڕابوو، شەڵەژابوو، دەیفەرموو: {لا إلهَ إلاَّ الله، (بەڕاستی سەیرە!) هاوار لە خۆم بۆ عەرەب، بۆ ئەم شەڕەی کەوا بەرەو پیریان دێ، وای لەم ڕۆژە ڕەشەی کە یەخەی عەرەب دەگرێ، ئەمڕۆکە لەبەربەست (سەدد)ی یەئجووجو مەئجووج، بەقەد ئەمە کون بوو!}.

سوفیان کە مامۆستای عەمری ناقیدی مامۆستای ئیمامی موسلیمە (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) هێمای ژمارەی دەی کێشا بەم شێوەیە: سەری پەنجەی شایەتمانی خۆی نوساند بە گرێی پەنجە کەڵەیەوەو کردی بە ئەڵقەیەکی بچکۆلەو، نیشانیدا، کە مەبەستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئامازەکەی، شتێکی زۆر کەم بووە، وەك ئەم ئەڵقە بچکۆلەیە، کە بریتییە لە کونێکی بچکۆلە.

زەینەب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر پیاو چاکانیشمان تیادابێ هەر دەفەوتێینو لەناو دەچین؟ فەرمووی: (بەڵێ، کە پیسیو گەندەڵی پەرەی سەند!). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٥٤٨١ – نامەی فەرتەنەو گەلو ئاژاوەکان} .

**ڕوونکردنەوە:**

زەینەبی کچی جەحش، پورزای پێغەمبەر بوو، لە پێشا ناوی بەررە بوو، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) مارەیکرد، ناوەکەی گۆڕی بە زەینەب، یەکێکە لە دایکانی بڕواداران، ژنێکی زۆر خوا پەرست بوو، شەو نوێژی زۆری

دەکــرد، ڕۆژووی زۆری دەگــرت، کــاری دەکــردو دەیکــرد بــه خێــر، عائیــشه دەفەرموێ: زەینەب ژنێکی دەست ڕەنگین بوو، کەوڵی خۆش دەکرد، درووماني دەکرد، کوندەو مەشکەی پینـه دەکـرد، کرێکەی وەردەگرتو دەیکـرد بـه خێـر. کاتێ پێغەمبەر گواستیەوە لە تەمەنی (٣٥) سیو پێنج ساڵیدا بوو، ساڵی بیستی کۆچی لـه تەمـەنی پـەنجا ساڵیدا وەفـاتی کـرد، کـه لـەو سـاڵەدا، لەسـەردەمی جێنشینی ئیمامی عومەردا، ولاّتی میصر ئازاد کرا، یەکەم هاوسەری پێغەمبەر بوو، کە لەپاش مەرگی پێغەمبـەر بمرێت، (ڕەزاو ڕەحمـەتی خـودای گـەورەی لێ بێ). {بروانـه: ژمـارە: ١٦٧٥ لـه زنجیره: ١٢٨٠ لـه پوختـەی موسلیم} + {تـاج/٣، زنجیرە: ٤٠، لـه ژمـارە: ٣٤٤٣ هـەتا ٣٤٤٤} + {تەجریـدی بوخـاری/٣، رقـم: ١١٠٧ = ٢٩٩٣ + رقم: ١١٢١ = ٢٦٦١ فتح الباری} + {مختصر صحیح مسلم رقم: ٢١٥٣ = ٦٩٥١ صحیح مسلم}.

١٨٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَـنِ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) قَالَ: «فُتِحَ الْيَـوْمَ مِـنْ رَدْمِ يَـأْجُوجَ وَمَـأْجُوجَ مِثْـلُ هَـذِهِ». وَعَقَـدَ وُهَيْـبٌ بِيَـدِهِ تِـسْعِينَ. {الحدیث: ٧١٦٨ = ٧١٩٥ فم = فـم = فتح الملهم شرح صحیح مسلم}:[١٨٣٠]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لــێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمڕۆ لەبەربەستی یەئجووجو مەئجووج بەقـەی ئەمە کونی تێبوو).

وهـەیب کـه لـه گێڕانـەوەی ئـەم فەرموودەیـەدا، مامۆسـتای مامۆسـتای مامۆستاکەی شێخی موسلیمە (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) هێمای ژمارەی نەوەدی کێشا، بەم شێوەیە: سـەری پەنجـەی شایەتمانی خـۆیی نووسـاند بـه بنـی پەنجـه

---

[١٨٣٠] بخـاری. أحادیـث الأنبیـاء/٣٣٤٧. پوختـەی موسـلیم/٥، ژمـارە: ١٩٨٨ = ٧١٦٨ شـیحا (بخـاری رقم الکتاب/٦٠ رقم الباب/٧).

کەڵەیەوە لە دیوی ناوەوە، پیشانیدا کە مەبەستی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لە ئاماژەکەی، کونێکی زۆر بچکۆلە بووە، وەك ئەم ئەڵقەیەی کەمن بەم دوو پەنجەیەی دەستی راستم کێشامو پیشانی ئێوەم دا.

## (٢) باب الخَسف بالجَيْشِ الَّذى يَؤُمُّ البَيْتَ

## لەشکرێ پەلاماری خانەی خودا دەدات، ڕۆدەچن بە ناخی زەویدا

١٨٣١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) : (يَغْزُو جَيْشٌ الْكَعْبَةَ فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنْ الارْضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِـرِهِمْ) قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: كَيْفَ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ وَفِيهِمْ أَسْوَاقُهُمْ وَمَنْ لَـيْسَ مِنْهُمْ؟ قَالَ: (يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ ثُمَّ يُبْعَثُونَ عَلَى نِيَّاتِهِمْ) (الحديث ٢١١٨):[١٨٣١]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەشکرێ دێن بدەن بەسەر کابەداو غەزوی بکەن، دێن هەتا دەگەنە بەیدا، کەناوی جێگەیەکی تایبەتییە، وا لەناوەندی مەککەو مەدینەدا، لەوێ هەموویان ڕۆدەچن بەناخی زەویدا) ، منیش گووتم: ئەی ڕەوانەکراوی خودا! چۆن وبۆچی هەموویان وەك یەك ڕۆدەچن، خۆ هەیانە بۆ شەڕ نەهاتووە تەنها بازاڕیان بۆ ساز دەکا، وەهەشیانە لەوان نییەو بەزۆر هێناویانە ؟ فەرمووی(درووودی خوای لەسەر بێ) : (هەموویان چون یەك ڕۆدەچن بەناخی زەویدا، بەڵام لەرۆژی قیامەتا هەر کەسەیان لەسەر نیازی خۆی زیدوو دەکرێتەوە، چاکیان بەچاك پاداشتی دەدرێتەوەو خراپیان بەخراپ).(تاج/٢/٢٧٥ف- از-١٣٧ —ش/د/ت/ن).

---

[١٨٣١] تجرید/٢، ژمارە: ٩٥٨ - ٢١١٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٣٠ = ٧١٦٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/٤٩).

ئەمــەیش گێڕانەوەیــەکی تــری ئــەم فەرموودەیــە، لــە ژمــارە: (٢٠٣٠)ی پوختەی موسلیمدا:

عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ ابْنِ الْقِبْطِيَّةِ قَالَ دَخَلَ الْحَارِثُ بْنُ أَبِى رَبِيعَةَ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ صَفْوَانَ وَأَنَا مَعَهُمَا عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ فَسَأَلاَهَا عَنِ الْجَيْشِ الَّذِى يُخْسَفُ بِهِ وَكَانَ ذَلِكَ فِى أَيَّامِ ابْنِ الزُّبَيْرِ فَقَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « يَعُوذُ عَائِذٌ بِالْبَيْتِ فَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ ». فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَكَيْفَ بِمَنْ كَانَ كَارِهًا قَالَ « يُخْسَفُ بِهِ مَعَهُمْ وَلَكِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى نِيَّتِهِ ». وَقَالَ أَبُو جَعْفَرٍ هِىَ بَيْدَاءُ الْمَدِينَةِ. {الحديث: ٧١٦٩ = ٧١٩٦ فم}:

عوبەیدوڵڵای کوڕی ئـەل‌قیبطییـە فـەرمووی: لەخزمـەتی حاریثی کـوڕی ئەبو رەبیعەو عەبدوڵڵای کوڕی صەفواندا چووین بۆ خزمـەتی ئـوم سـەلەمەی دایکـی بـاوەڕدارانی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودا لـە پێغەمبـەرو رەزای خودا لە هاوەڵان و هاوسەرانی بێ) پرسیاری ئەو لەشکرەیان لێ کرد کـە رۆدەچـن بـەناخی زەویـدا؟ ئـەم سـەردان و پرسـیارو وەڵامـەیش لـەو سـەردەمەدا بـوو، کـە عەبـدوڵڵای کـوڕی زوبـەیر فـەرمانڕەوا بـوو لـە مەدینـە، ئـوم سـەلەمەیش فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (پـەنا بـەرێ پـەنا دەباتـە بـەر بـەیت و هانـا دەباتـە بـەر خانـەی خـودا، هـەتا زۆردار نـەیکوژێ، جـا لەشکرێ دەنێرن بۆ گیـانی، کاتـێ لەشـکرەکە دەگەنـە بیابـانی بەیـداء، کـە نـاوی شـوێنێکی تایبەتـە لـەنێوانی مەککەو مەدینـەدا، دەشـتێکی لـووس و پووسـە، وا لـەنزیکی ذولحولەیفـەوە، کـە لەشـکرەکە دەگەنـە ئـەوێ هـەموویان رۆدەچـن بەناخی زەویدا).

منـیش عـەرزیمکرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەو لەشـکرە کەدەچـن بـۆ گیانی ئەو پەنا هێنەرە، کە پەنا دەباتە بەر خانەی خودا، هـەموویان وەك یـەك

نین، هەیانە بە زۆر هێنراوەو پێی ناخۆشە کە هاتووە بۆ ئەم ئەرکە ناڕەوایە، ئەی ئەوە چۆن ڕۆدەچن لەگەڵ ئەو ناهەقیکارانەدا؟ فەرمووی: (ئەویش لەگەڵ ئەوانا ڕۆدەچێ بەناخی زەویدا، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا، لەسەر نیازی خۆی زیندوو دەکرێتەوەو بەپێی نیازی دڵی پاداش دەدرێتەوە، بەچاك یا بەخراپ).

ئەبو جەعفەری ئەل‌باقیر، فەرمووی: ئەو شوێنە کە ئەو لەشکرەی تیادا ڕۆدەچن بیابانەکەی مەدینەیە، کەوا لە نزیکی ذولحولەیفەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٧، ژمارە: ١٧٢٤ + تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٥٤٨٣} + {تاج/٥، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩ – لە هۆزی سەقیف هەلاتبازو ... هەڵ دەکەوێ} + {ریاض الصالحین/٤، زنجیرە، ٣٧٠، ژمارە: ١٨٣٠}.

### (٣) باب نُزُولِ الفِتَنِ كَمَوَاقِعِ القطر
### دابارینی ئاژاوەو ئاشووب وەك لێزمەی باران

١٨٣٢- عَنْ أُسَامَةَ بْن زيد (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَشْرَفَ عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِ الْمَدِينَةِ، ثُمَّ قَالَ: «هَلْ تَرَوْنَ مَا أَرَى؟ إِنِّي لأَرَى مَوَاقِعَ الْفِتَنِ، خِلاَلَ بُيُوتِكُمْ كَمَوَاقِعِ الْقَطْرِ». {الحديث: ٧١٧٤ = ٧٢٠٢ فم}:[١٨٣٢]

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ لەسەر قەڵایێ لە قەڵاکانی مەدینە سەرنجی دەوروبەری داو فەرمووی: (ئەرێ ئەوەی کە من دەیبینمو چاوم لێیەتی، ئێوەیش دەیبینن‌و چاوتان لێیەتی یانا؟).

[١٨٣٢] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٩٧ = ٧٠٨٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٨٩ = ٧١٧٤ شیحا = ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم. (بخاری رقم الکتاب/٢٩ رقم الباب/٨).

یاران عەرزیان کرد: نەء، هیچ نابینین. فەرمووی: (دەسا من دەبینم کە کوشتن‌و ئاشوب‌و بگرەو بەردەو کوشت‌و بڕ، وەك دڵۆپی لێزمەی باران، لەناو کووچەو کۆڵان‌و ماڵەکانتانا بە خوڕەم دادەبارێن!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٣١٩٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەوەبوو وابوو لە پاش مەرگی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاشووب‌و فەرتەنە بەرپابوو، وەك کەری دەروێش سەری دەکرد بە هەموو ماڵێکا، بە کوشتنی ئیمامی عوثمان دەستی پێکرد، شەڕی جەمەل قەوما، هەروا صفین، هەروا هەرای ئەلحەڕە بەرپابوو، حوسەین شەهید بوو وەتا ئێستا بەردەوامە، وە.... تاد

١٨٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سَتَكُونُ فِتَنٌ، الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ، وَالْقَائِمُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي مَنْ تَشَرَّفَ لَهَا تَسْتَشْرِفْهُ فَمَنْ وَجَدَ فِيْهَا مَلْجَأً أَوْ مَعَاذًا فَلْيَعُذْ بِهِ. (الحديث ٧٠٨٢): [١٨٣٣]

دیسان ئەبو هورەیرە -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاشووب‌و ئاژاوەو فەرتەنە گەلێ دەقەومێن، هەتا لێیان دووربی‌و دووریان لێ بگری کەمە، ئەوەی بچێ بەپیریانەوە دێن بەپیریەوەو بەرۆکی پێ دەگرن! دانیشتوو تیایانا لەڕاوەستاو تیایانا باشترە، ڕاوەستاو تیایانا لەڕۆیشتوو باشترە، ڕۆیشتوو تیایانا لەڕاکردوو باشترە. واتە:

---

[١٨٣٣] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٩٧ = ٧٠٨٢ بخاری. مسلم: ٧١٧٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/٢٥).

هەتا کەمتر بەشداری لەو ئاژاوانەدا بکەی باشترە. دەی هەرکەسێ لەو دەمەدا پەناو پاسارێکی دەست کەوت، باپەنای بۆ بەرێو خۆی لەوێ قایم بکاو خۆی قوتار بکا). (تاج/١٠ ل/٢٠٨ ز/٨٧ ژ/٦ - ش/د/ت- باسی ترساندن لەئاژاوەکان).

## (٤) باب إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا

## کاتێ دوو موسوڵمان بە شمشێرەوە ڕووبەڕووی یەکتری وەستان، بکوژو کوژراو لەناو ئاگری دۆزەخدا دەبن

١٨٣٤- عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ خَرَجْتُ وَأَنَا أُرِيدُ هَذَا الرَّجُلَ فَلَقِيَنِى أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ أَيْنَ تُرِيدُ يَا أَحْنَفُ قَالَ قُلْتُ أُرِيدُ نَصْرَ ابْنِ عَمِّ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- - يَعْنِى عَلِيًّا - قَالَ فَقَالَ لِى يَا أَحْنَفُ ارْجِعْ فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِى النَّارِ ». قَالَ فَقُلْتُ أَوْ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ قَالَ « إِنَّهُ قَدْ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ ». {الحديث: ٧١٨١ ترقيم شيحا = ٧٢٠٩ ترقيم فم = فم = فتح الملهم تجريد/١، رقم: ٢٩ = ٣١، ٦٨٧٥، ٧٠٨٣ فتح الباري شرح صحيح البخاري. أبو داود. فتن: ٤٢٦٨. نسائي. تحريم الدم. تحفة الاشراف: ١١٦٥٥} :[١٨٣٤]

ئەحنەفی کوڕی قەیس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: دەرچووم بچم یاریدەی عەلی کوڕی ئەبو طالیب بدەم، لە دژی کۆمەڵەی ئەلجەمەل، گەیشتم بە ئەبوبەکرە، فەرمووی: ئەوە بۆ کوێ دەچیت؟ گوتم: دەمەوێ هۆزەکەم ببەم بۆ هاوبەشی لە جەنگی ئەلجەمەلدا، وە یاریدەی عەلی کوڕی ئەبو طالیب بدەم کە ئامۆزای پێغەمبەری خودایە: ئەحنەف فەرمووی: ئەبوبەکرە

---

[١٨٣٤] تجرید/١، ژمارە: ٢٩ = ٣١ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٠٥ = ٧١٨١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٢ رقم الباب/٢٢).

فەرمووی پێم: ئەی ئەحنەف! بگەڕێرەوەو مەچۆ بۆ ئەم شەڕی برا کوژییە، چونکە من بە گوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیستووە کە دەیفەرموو: (هەرکاتێ دوو موسڵمان بە شمشێرەوە روو بە ڕووی یەکتری وەستانو دەستەو شمشێر بەرامبەر بە یەکتری راوەستانو یەکێکیان یەکێکیانی کوشت، ئەوا بکوژو کوژراو هەردووکیان جێگەیان ناو ئاگری دۆزەخە!).

ئەحنەف فەرمووی: ئەبوبەکرە فەرمووی: منیش گوتم، یا کەسێ تر گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باشە وا بکوژ دۆزەخییە، چونکە بکوژە، ئەی کوژراوەکە بۆچی؟ خۆ ئەو کەسی نەکوشتووە؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (چونکە ئەویش لە دڵەوە بە خواستی دڵ ویستوویەتی برا موسڵمانەکەی بکوژێ!).

## روونکردنەوە:

ئەحنەفی کوڕی قەیس، ئەبو بەحری بەصری تەمیمی، ناوی ضەحاکی کوڕی قەیسە، پیاوێکی تەمەن درێژ بوو، بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتووە بەڵام دانانرێ بە صەحابە، چونکە ئەو کاتە ئیسلام نەبووە، لەپاش مەرگی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ ) ئیسلام بووە، پیاوێکی سەلارو هێمنو لەسەر خۆ بوو، پیاوێکی باوەڕ پێکراو بوو، بەڵام فەرموودەی کەم دەگێڕایەوە.

١٨٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قال: قال رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَذَكَرَ أَحَادِيثَ مِنْهَا وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ وَتَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ وَدَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ».

{الحديث: ٧١٨٥ = ٧٢١٣ فم. تجريد البخاري/٥ن رقم: ٢١٠٣ = ٧١٢١ فتح الباري. تحفة/ ١٤٧٠٦}:[١٨٣٥]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (درودو سڵاو پیتو فەڕو میهرەبانی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ، سەرو ماڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێو گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی نازداری بێ) فەرمووی: (قیامەت هەڵناسێ، هەتا دوو بەرەی زۆر گەورە دەچن بەگژ یەکا، کوشتارێکی فرە گەورەو سامناك لە نێوانیاندا روودەدا، داوای هەر دوو لاشیان هەریەك داوایە). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٦٨ — نیشانەی داهاتنی قیامەت}.

**ڕوونکردنەوە:**

زۆرینەی ڕاڤەکاران دەڵێن: مەبەست لەم دوو بەرە گەورەیە، کۆمەڵەی عەلیو کۆمەڵەی موعاوییە بووە. بەڵام مرۆڤ کە کۆی نیشانەکانی نزیکبوونەوەی قیامەت ڕەچاو دەکا، لەگەڵ ئەو هەموو جەنگە گەورانەدا، کە لەنێوانی لایەنە جیا جیاکاندا بووە، دەبینێ شەڕی عەلیو موعاوییە، لە چاو ئەو شەڕە گەورەو زەبەلاحانەدا، وەك گەمەی منالان وایە، لەهەموو ڕویەکەوە، لەڕووی گەورەیی ڕووبەری مەیدانی جەنگەکانەوە، لەڕووی ژمارەی هاوبەشکەرانو جەنگاوەرانو کوژراوانو زامارانو وڵات وێرانکردنو کاریگەری لەسەر ڕەوشتی گشتی جیهانی، تەنانەت لە جەنگی خاچ پەرستان، یا لە جەنگی جولەکەو عەرەب، یا لە جەنگی

---

[١٨٣٥] تجرید البخاری/٥، ژمارە: ٢١٠٣ = ٧١٢١ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٠٧ - ٧٢١٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/٢٥).

یەکەمو دووەم، یا لە جەنگی عێراقو ئێرانو سەدان جەنگی گەورە گەورەدا، هەر کامیٚ لەم جەنگانە بگری، لە هەموو رویەکەوە لە جەنگی عەلیو موعاویە گەورەتر بوون، بە زەینم ئەم جەنگە ماوە، وەلە ناکاوا هەلٚ دەگیرسیٚو دەتەقێتەوەو کۆتایی بەم گەشە ژیانییە دەهێنیٚو دەمانباتەوە سەر سەدەی یەکەمی زاینیی، بەزەینم کاتی ئەو هەرەشەیە هاتووە، کە لەم ئایەتەدا ئماژەی بۆ کراوە، کە دەفەرمویٚ: ﴿وَلَكِنْ قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمْ الشَّيْطَانُ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٤٣) فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ – الأنعام/٤٣-٤٤﴾. چونکە بەڕاستی ئێستا لەسەراسەری جیهاندا، وەك ئەمڕۆ ئاوا خەلٚکی لەدین دوورنەکەوتۆتەوەو کوفرو بێباوەڕیو تاوانو بیٚ رەوشتی وا باوی نەبووە. تەنانەت مرۆڤ ناوێریٚ لەناو بەناو رۆشنبیراندا، ناوی خودا بهێنیٚ، کوشتنو زیناو بادە نۆشیو تاوان ئەوەندە زۆر بوون لەڕادە دەرچوون، تەنیا لەناو وڵاتە ئیسلامییەکاندا، ئەویش زۆر کەم دینداری ماوە!! خودا پەنامان بدا لێی.

## (٦) باب إخبارِ النَّبيِّ ﴿ﷺ﴾ فيمَا يكُونُ إلى قِيَامِ السَّاعَةِ

## کۆمەلٚیٚ هەوالٚ لە بارەی کۆمەلٚیٚ ڕوداوەوە، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) ڕوونی کردوونەتەوە، هەتا ڕۆژی دوا ڕۆژ

١٨٣٦- عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمًا فَمَا تَرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلَّا حَدَّثَهُ حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ قَدْ عَلِمَهُ أَصْحَابُهُ هَؤُلَاءِ وَإِنَّهُ لَيَكُونُ مِنْهُ الشَّيْءُ فَأَذْكُرُهُ كَمَا يَذْكُرُ الرَّجُلُ وَجْهَ الرَّجُلِ إِذَا غَابَ عَنْهُ ثُمَّ إِذَا رَآهُ عَرَفَهُ. (الحديث ٦٦٠٤): [١٨٣٦]

[١٨٣٦] تجريد/٥، ژمارە: ٢٠٤٤ = ٦٦٠٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٩٢ - ٧١٩١ شیحا - ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم. (بخاری رقم الكتاب/٨٢ رقم الباب/٤).

حوزەیفـە (رەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ خۆشەویـست -دروودی خوای لەسەر بێ- وتـارێکی گرنگـی دوورو درێـژی دا، هـیچ نـەما کـەرووی دا بـێ، یاهەتا ڕۆژی قیامەت ڕوویدا، کەباسی نەکا بۆمان، ئیتر ئەوی لـەیادی مابـێ ئـەوا لـەیادی مـاوە (و گەنجینـەی رازو نهێنـی یـەکان بـوو بـەمالّی) ئەوییـشی لـەیادی چووبێتەوە ئەوا لەیادی چۆتەوەو گەنجی نـاو ئـەو گەنجینەیـەی بـەفیڕۆ دانـاوە) من بەش بەحالّی خۆم جاری وادەبێ شتێ لەو بابەتانە ڕوودەدا، کەپێغەمەر لەو وتارەدا باسی کردبوون، وەمـن ئـەو شـتەم لـەیاد نـەما بـوو، بـەلاّم کـەروو دەدات وشتەکە دەبینم، ئەوجا یادم دەکەوێتەوەو لەدلّی خۆما دەلّێم: ئای ئەمە ئەوەیە کەپێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەو وتارەدا باسـی کـرد بۆمـان، ڕێـك وەك چۆن گەلێ جار وارێ دەکـەوێ مـرۆڤ پیـاوێ دەناسـێ، بـەلاّم لـەپاش مـاوەیی ئـەو پیـاوەی لـەبیر دەچـێ، هـەتا کاتـێ دێتـەوە بـەر چـاوی‌و دەیبینـێ، دیـسانەوە دەیناسـێتەوەو دەزانـێ کەئەمـە پیاوەکـەی پێـشووە نـاوا) (تـاج/١٠ ز/٨٨ ل/٢١٦ ژ/١= خەبەردان لەفیتنە گەل...).

بۆ ڕاڤـەو شـەرح‌و ڕوونکردنـەوەی ئـەم سەرباسـە، لـە پوختـەی موسـلیم، ژمارە: (١٩٩٢)و (١٩٩٣)و (١٩٩٤)و (١٩٩٥) ڕاگوێز دەکەین:

عَنِ ابْنِ إِدْرِيسَ الْخَوْلاَنِىَّ كَانَ يَقُولُ قَـالَ حُذَيْفَـةُ بْـنُ الْيَمَـانِ وَاللَّـهِ إِنِّـى لأَعْلَـمُ النَّاسِ بِكُلِّ فِتْنَةٍ هِىَ كَائِنَةٌ فِيمَا بَيْنِى وَبَيْنَ السَّاعَةِ وَمَا بِى إِلاَّ أَنْ يَكُونَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَسَرَّ إِلَىَّ فِى ذَلِكَ شَيْئًا لَمْ يُحَدِّثْـهُ غَيْـرِى وَلَكِـنْ رَسُـولُ اللَّـهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ وَهُوَ يُحَدِّثُ مَجْلِسًا أَنَا فِيهِ عَنِ الْفِتَنِ فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ -صلى الله عليه وسلم- وَهُوَ يَعُدُّ الْفِتَنَ « مِنْهُنَّ ثَلاَثٌ لاَ يَكَدْنَ يَذَرْنَ شَيْئًا وَمِنْهُنَّ فِـتَنٌ كَرِيَاحِ الصَّيْفِ مِنْهَا صِغَارٌ وَمِنْهَـا كِبَـارٌ ». قَـالَ حُذَيْفَـةُ فَـذَهَبَ أُولَئِـكَ الـرَّهْطُ كُلُّهُـمْ غَيْرِى.{الحديث: ٧١٩١ = ٧٢١٩ فم} :

ئـەبو ئیدریـسی خـەولانی فـەرمووی: حوزەیفـەی کـوڕی یـەمان (ڕەزای خودای لـێ بێ) فەرمووی: بەزاتێ کە زاتی خودایە لەم ڕۆوە هەتا ڕۆژی قیامەت هەرچی فیتنـەو فەرتەنـەیێ روو دەدات، مـن لەهـەموو کەسێکی تـر باشـتری لێ دەزانم، ئەمەیش لەبەرئەوە نییە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیـەوە قسەی بـۆ کەسـی تـر نـەکردبێ، نـەء لەبـەر ئەمـە نییـە، بـەڵام جـارێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەناو کـۆڕێکی دانیـشتندا، کـەمن خـۆم لەوێ دانیشتبووم باسی گەلێ فیتنـەو ئاشووبو فەرتەنـەی بۆمـان کـرد، دەسـتی کرد بە ژماردنیانو فەرمووی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ): (سـێ ئاشـووب لـەو ئاشووبانە کەم شت لێیان رزگار دەبێ، هەندێکیـشیان وەك بـای هـاوین وان، پـڕن لە زەرەرو زیانو ئێشو ئازار بۆ هەمووان، وردو درشتیان هەیە).

حوزەیفە (ڕەزای خودای لـێ بێ) فەرمووی: ئەو دەستەیە، کە لـەو کـۆڕەدا بوون، من نەبێ کەسیان نـەماون، هـەر لەبـەر ئەوەیـە کـە دەڵـێم: مـن لەهـەموو کەسێ باشتری لێ دەزانم. {تاج/٥، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٥٤٩٩ — خەبەردان لە فیتنە گەلو جۆرەکانی}.

عَنْ حُذَيْفَةَ -رضي الله عنه- قَالَ: قَامَ فِينَـا رَسُـولُ اللَّـهِ -صـلى الله عليـه وسلم- مَقَامًا مَا تَرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلاَّ حَدَّثَ بِهِ حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ قَدْ عَلِمَهُ أَصْحَابِي هَؤُلاَءِ وَإِنَّهُ لَيَكُونُ مِنْهُ الشَّيْءُ قَدْ نَسِيتُهُ فَأَرَاهُ فَأَذْكُرُهُ كَمَا يَذْكُرُ الرَّجُلُ وَجْهَ الرَّجُلِ إِذَا غَـابَ عَنْـهُ ثُـمَّ إِذَا رَآهُ عَرَفَـهُ. {الحديث: ٧١٩٢ = ٧٢٢٠ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٤٤ تجريد = ٦٦٠٤. أبو داود. فتن: ٤٢٤٠. تحفة الأشراف: ٣٣٤٠}:

حوزەیفە (ڕەزای خودای لـێ بێ) فـەرمووی: جـارێ خۆشەویـست (درووودی خودای لەسەر بێ) هەڵسایەوە لەسـەر دوانگە (مینبـەر) وتـارێکی گرنگـی دوورو

درێژی بۆماندا، لەناو ئەو وتارەدا، هەرچی روویدا بوو، لەوەو پێش‌و هەرچی روودەدا لەوەو پاش هەتا رۆژی قیامەت، هەمووی باسکرد بۆمان، ئیتر ئەوەی لە یادی مابێ ئەوا لە یادی ماوەو گەنجینەی رازو نهێنییەکان بوو بەماڵی، ئەوەیشی لە یادی چووبێتەوە، ئەوا لە یادی چووەتەوەو گەنجی ناو ئەو گەنجینەیەی بەفیڕۆ داناوە!

ئەم برادەرانەی من ئەم باسە زۆر باش دەزانن، چونکە ئەوانیش وەك من ئامادەی بیستنی ئەو وتارە بوون، من بەش بە حاڵی خۆم جاری وادەبێ شتێ لەو بابەتانە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو وتارەدا باسیانی کرد، روودەدا، من لەبیرم نەماوە، بەڵام کە روودەدات‌و دەیبینم، ئەوجا یادم دەکەوێتەوەو لە دڵی خۆمدا دەڵێم ئەمە ئەوەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وتارەکەیدا باسی کرد بۆمان، وەکوو چۆن پیاوێ لەپاش ماوەیێ چاوی بە چارەی پیاوێکی ناسیاوی خۆی بکەوێتەوە، کە لەیادی نەمابێ، بەڵام کە دەیبینێ دیسانەوە دەیناسێتەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٥٤٩٨}.

عَنْ حُذَيْفَةَ -رضي الله عنه- أَنَّهُ قَالَ أَخْبَرَنِى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى أَنْ تَقُومَ السَّاعَةُ فَمَا مِنْهُ شَىْءٌ إِلاَّ قَدْ سَأَلْتُهُ إِلاَّ أَنِّى لَمْ أَسْأَلْهُ مَا يُخْرِجُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ مِنَ الْمَدِينَةِ. {الحديث: ٧١٩٤ = ٧٢٢٢ فم}:

حوزەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەتا رۆژی هەستانەوە (قیامەت) دێت، هەرچی کارەساتێ روو دەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمنی فەرمووە، شتێ نییە کە نەیم پرسیبێ لێی، بەڵام ئەوەم لێی نەپرسی کەچی خەڵکی مەدینە لە مەدینە دەردەکات). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٥٥٠٠ — خەبەردان لە فیتنە گەل‌و ...}.

عَنْ أَبِي زَيْدٍ - يَعْنِي عَمْرَو بْنَ أَخْطَبَ - قَالَ صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- الْفَجْرَ وَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الظُّهْرُ فَنَزَلَ فَصَلَّى ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الْعَصْرُ ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ فَأَخْبَرَنَا بِمَا كَانَ وَبِمَا هُوَ كَائِنٌ فَأَعْلَمُنَا أَحْفَظُنَا.{الحديث: ٧١٩٦ = ٧٢٢٤ فم}:

ئـەبو زەیـد (واتـە: عـەمری كـوڕی ئـەخطـەب (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەر نوێـژیی نوێـژی بەیانی بۆ كردین، ئـەوجا سـەركەوتە سـەر دوانگەكـەو دەسـتی كـرد بـە وتـاردان بۆمانو دوانی بۆدابن هەتا نوێژی نیوەڕۆ داهات، ئەوسا لـە دوانگەكـە دابـەزیو نوێژی نیوەڕۆی بۆ كردینو، دیسان سەركەوتەوە سەر دوانگەكەو دەستی كردەوە بە خوتبەدانو وتاردان هەتا نوێژی عەصر بوو، ئەنجا هاتەوە خـوارەوەو نوێـژی عەصری بۆمـان كـردو دیـسانەوە چووەوە سـەر دوانگەكـەو دەسـتی كـردەوە بـە وتـاردان بۆمـان هـەتا خـۆر ئـاوابوو، ئـەوەی لـەوەو پـێش رووی داوەو ئـەوەی لەمـەودوا روودەدا، هـەواڵی گـشتی پێمـان فـەرموو، جـا لەسـەر ئـەم بنیاتـە زانـاترینی ئێمـە ئەوەمانـە، كـە زۆرتـری لـەو فەرمایـشتانەی حـەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) لەبەر ماوەو ڕەوانـی كـردووە). {تـاج/٥، زنجیرە: ٨٨، ژمـارە: ٥٥٠١ – خەبەردان لە فیتنە گەلو جۆرەكانی} + {ریاض/٤، ژمارە: ١٨٦١}.

**ڕوونكردنەوە:**

ئـەبو زەیـد نـاوی عـەمری كوڕی ئـەخطـەبی كـوڕی ریفاعـەی ئەنـصاری خەزرەجییـە، بـە ئـەبو زەیـد زیـاتر ناسـراوە، سیازدە غـەزای لەگـەڵ پێغەمبـەر خۆیـدا كـردووە، نیـشتەجێی بەصـرە بـوو، تەمـەنی لـە سـەد سـاڵ زیـاتر بـوو،

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای لاوی‌و گەنج بوونەوەی کرد بۆی، هەتا مرد تەڵێ لە سەرو ریشی سپی نەبوو بوو.

## (٧) باب في الفِتْنَةِ الَتِي تَمُوجُ كَمَوْجِ البَحْرِ
## باسی ئەو ئاژاوەی کە وەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدا

١٨٣٧- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ أَيُّكُمْ يَحْفَظ قَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْفِتْنَةِ قُلْتُ أَنَا كَمَا قَالَهُ قَالَ إِنَّكَ عَلَيْهِ أَوْ عَلَيْهَا لَجَرِيءٌ قُلْتُ فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ تُكَفِّرُهَا الصَّلَاةُ وَالصَّوْمُ وَالصَّدَقَةُ وَالْأَمْرُ وَالنَّهْيُ قَالَ لَيْسَ هَذا أُرِيدُ وَلَكِنْ الْفِتْنَةُ الَّتِي تَمُوجُ كَمَا يَمُوجُ الْبَحْرُ قَالَ لَيْسَ عَلَيْكَ مِنْهَا بَأْسٌ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا قَالَ أَيُكْسَرُ أَمْ يُفْتَحُ قَالَ يُكْسَرُ قَالَ إِذا لَا يُغْلَقَ أَبَدًا قُلْنَا أَكَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ الْبَابَ قَالَ نَعَمْ كَمَا أَنَّ دُونَ الْغَدِ اللَّيْلَةَ إِنِّي حَدَّثْتُهُ بِحَدِيث لَيْسَ بِالْأَغَالِيط فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَ حُذَيْفَةَ فَأَمَرْنَا مَسْرُوقًا فَسَأَلَهُ فَقَالَ الْبَابُ عُمَرُ). (الحديث ٥٢٥- أطرافه: ١٤٣٥، ١٨٩٥، ٣٥٨٦، ٧٠٩٦): [١٨٣٧]

حوذەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی عومەردا دانیشتبووین، فەرمووی: کێتان فەرمایشتەکەی پێغەمبەری (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی ئاژاوەو فەرتەنەکانەوە لەبەرە؟ منیش گوتم: من لەبەرمە دەق وەك خۆی فەرموویەتی، عومەر فەرمووی: بەراستی تۆ کۆی لێ ناکەیتەوەو چاونەترسی دوورنییە لەخۆتەوە سەبارەت بەفەرتەنەکان شتێ بڵێی! منیش عەرزیم کرد: حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: ئەو ئاشووب‌و

---

[١٨٣٧] تجرید/١، ژمارە: ٣١٠ - ٥٢٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٩٠ - ٣٦٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٩ رقم الباب/٤).

ئاژاوەیـەی کەتووشـی پیـاو دەبـێ، بـەهۆی کـەس و کـارو مـاڵ و منـاڵ و هاوسـێ و دراوسێوە، نوێژو ڕۆژوو خێرکردن و فەرمانکردن بەچاکەو نەیی کردن لەخراپە، دەبن بەکەفارەتی و پاکی دەکەنەوە.

عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەبەستم ئەمەنییە، بەڵکوو لەو فیتنـەو ئاژاوەیـە دەپرسـم کـەوەك شـەپۆلی دەریـا شـەپۆل دەدا، گـوتم: قوربـان! ئەوەیان زیانی بۆتۆنابێ، ئەوە والەپـشتی دەرگایـەکی داخـراوەوە، ئەودەرگایـە وا لەنێوانی تۆو ئەودا، تائەودەرگایە داخرابێ ئەو ئاژاوەیە ڕوونادا.

فەرمووی: جائایا ئەو دەرگایە دەشکێنرێ یادەکرێتەوە؟ گوتم: دەشکێنرێ. فـەرمووی: کەواتـە هـەتا هەتایـە داناخرێتـەوە. بێـژرا: ئایـا عومـەر دەیزانـی مەبەست لەو دەرگایە چییە؟ حوژەیفە فەرمووی: بەڵێ زۆرباش ئەوەی دەزانـی، وەك سـوور دەیزانـی کـەڕۆژ ڕۆیـشت شـەو دادێ، ئـاوایش دەیزانـی کەمەبەسـت لەودەرگایە چییە، چوونکە من فەرموودەیەکی دروسـتو قسەیەکی دۆغـری وام بۆیگێڕایەوە کەهەڵەشەو پەڵەشەوتێکەڵ و پێکەڵ نەبێ! جا لەحوذەیفە پرسـیار کـرا: ئەودەرگایـە کـێ بـوو؟ فـەرمووی: عومـەر خـۆی بـوو، واتـە: هـەتا عومـەر لەژیاندابێ ئاژاوە سەرهەڵ نادا. (ت/١/٧٢/ ٥).

ئەمـەیش گێڕانـەوەی (١٩٩٠)ی پوختـەی موسـلیمە بـۆ ئـەم فـەرموودە، بەهرەی پتری زۆری واتیادا، ڕاگوێزکردنی سوودمەندە:

عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ فَقَالَ: أَيُّكُمْ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَذْكُرُ الْفِتَنَ؟ فَقَالَ قَوْمٌ: نَحْنُ سَمِعْنَاهُ. فَقَالَ: لَعَلَّكُمْ تَعْنُونَ فِتْنَةَ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَجَارِهِ؟ قَالُوا: أَجَلْ. قَالَ: تِلْكَ تُكَفِّرُهَا الصَّلاَةُ وَالصِّيَامُ وَالصَّدَقَةُ، وَلَكِنْ أَيُّكُمْ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَذْكُرُ الْفِتَنَ الَّتِي تَمُوجُ مَوْجَ الْبَحْرِ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: فَأَسْكَتَ الْقَوْمُ، فَقُلْتُ: أَنَا. قَالَ: أَنْتَ لِلَّهِ أَبُوكَ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ

لەناو خۆیاندا دەڵێن: شتی وانابێ، چونکە خوداکەمان ڕێگەی نەداوین کە کەسێ بەبێ فەرمانی خۆی بکوژین. فەرمووی: ئەوجا دەیبەن بۆلای جەجاڵ کە موسڵمانەکە چاوی پێی دەکەوێ، دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە ئەمە ئەو جەجاڵەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی ئەوی بۆ کردووین. فەرمووی: ئەنجا جەجاڵ دەستور دەدا پیاوە موسڵمانەکە لەسەردەم رادەخەن و چوار مێخەی دەکێشن و ئەنجا دەڵێ: ئادەی دارکارییەکی باشی بکەن. ئیتر دارکارییەکی زۆر باشی بەرو پشتی دەکەن!

جەجاڵ دەڵێ: ئایا هێشتا باوەڕم پێ ناهێنی؟ فەرمووی: ئەویش دەفەرموێ: تۆ جەجاڵە کۆری هەلاتبازی گەڕۆکی. فەرمووی: ئیتر جەجاڵ دەستور دەدا لە تەوقە سەریەوە، بەشەقە مشار وەك تەختەدار دایدەهێنن، هەتا نافەکی، جا جەجاڵ خۆی بەنێوانی هەردوو کەرتەکەیدا دەڕوا، لەپاشا پێی دەڵێ: هەڵسە! ئەویش راست دەبێتەوە سەرپێ، جا پێی دەڵێ: ها باوەڕم پێ دەهێنی؟ ئەویش دەڵێ: ئەوەندەی تر بۆم روون بۆوە کە تۆ چیت و چی نیت. ئەوجا دەڵێ: ئەی خەڵکینە! ئیتر لە پاش من ناتوانێ کەسی تر وا لێ بکا، فەرمووی: ئەوجا جەجاڵ دەیگرێ تا سەری ببڕێ بەڵام به فەرمانی خودا بەربینی لە غەوغەومیەوە هەتا چەڵەمەی سینگی دەبێ بەیەك پارچە مس! ئیتر ڕێگەی ئەوەی نابێ! فەرمووی: ئەوسا هەر چوار پەلی دەگرێ و فڕەی دەدا، لە خەڵك وایە کە ئەوە فڕەی داوەتە ناو دۆزەخەوە بەڵام لەراستیدا دەبرێ بۆ ناو بەهەشت).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەلای خودای پەروەردگاری هەردوو جیهان گەورەترین شەهید ئەم پیاوەیە!). {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨١٥}.

**ڕوونكردنەوە:**

**لە (٢٠٠٨/٥/٢٨)دا، ئەم تێبینیەم لێرەدا نووسیوە، لە تاجول ئوصلدا، لە بەرگی پێنجەمدا، زنجیرە/١١١٣دا، لەدوا وەرگێڕانی فەرموودەی ژمارە (٥٦٢٥). وا ئێستا لێرەشدا دووبارەی دەكەمەوە: (سُبحَانَ الله! سەرنج بدەن تەنانەت جەجاڵ، بە جەجاڵی خۆی، قایل نییە، كە كەسێ لە دەستو پێوەندەكەی خۆی، كەسێكی تر لە نەیارەكانی بكوژێ! كەچی ئێستا لە هەندێ وڵات، كوشتنو بڕین ئەوەندە ئاسان بووە، وای لێ هاتووە هەموو كوێخای گوندێ، یا كاربەدەستێ، بەبێ پرسو ڕاكردن بەكەسێ، مافی ئەوەی پێ دراوە كە خەڵكی بێ تاوان، بەبڕو بیانووی پڕو پووچ لە سێدارە بدا.**

**سُبحَان الله! لە ئێمە وابوو كە هەر صەددامو ڕژێمەكەی ئەو وایە، بەڵام ئێستا دەركەوت كە ڕژیم هەر ڕژێمە، هەمیشە دەستدار دەیباو بی دەست تەماشا دەكا.**

**{وەرگێڕ – ٢٠١٠/١١/٢٠ز} + {نعوذ باللهِ مِنَ المِيلِيشِيَات – ٢٠١٤/١٠/١٠}.**

## (٢٢) باب في الدَّجَّالِ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ
## باسی جەجاڵ، كە زۆر بێ ڕێزو سووكو تڕۆیە لەلای خودا

**١٨٥٩- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ مَا سَأَلَ أَحَدٌ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- عَنِ الدَّجَّالِ أَكْثَرَ مِمَّا سَأَلْتُ قَالَ « وَمَا يُنْصِبُكَ مِنْهُ إِنَّهُ لاَ يَضُرُّكَ ». قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّ مَعَهُ الطَّعَامَ وَالأَنْهَارَ قَالَ « هُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ ذَلِكَ ». {الحديث: ٧٣٠٤ = ٧٣٣٨ فم. البخاري. فتن: ٧١٢٢}:[١٨٥٩]**

---

[١٨٥٩] البخاري. الفتن: ٧١٢٢. پوختەی موسلیم - مختصر صحيح مسلم - ترقيم شيحا لصحيح مسلم (بخاري رقم الكتاب/٩٢ رقم الباب/٢٦).

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کەسی تر ئەوەندەی من بە زۆری، لەبابەت جەجاڵەوە پرسیاری زۆری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەکردووە، جارێکیان فەرمووی: ڕۆڵەکەم! چییە وا لێی خەجڵیو وا خەمو پەژارەی دایگرتووی؟ مەترسە زیانی بۆ تۆ نابێ. عەرزیمکرد: بۆیە ئەوەندە دەترسم چونکە دەڵێن: چەند کێوێ نانو خۆراكو گۆشتو چەند چەمێ ئاوی لەگەڵە! فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) : (با ئەوانەیشی لەگەڵدا بێ، ئەو لەلای خودا سووكو ترۆیەو رادەی ئەوەی ناکەوێ کە بەهۆی ئەم جۆرە چەواشەکاریو چاو بەستو چاوو راوەوە، بتوانێ کە سەر لە موسڵمانانی پاك بشێوێنێ، بەڵکوو ئەوە دەبێ بەهۆی بەهێزبوونی باوەڕی باوەڕدارو، دەبێ بەهۆی راستکردنەوەی بەڵگەی راستو رۆشن لەسەر ناموسڵمانانو ناپاکان!). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٥٦١٥}.

## (٢٣) باب في خُرُوجِ الدَّجَّالِ وَمَكْثِهِ في الأَرضِ
## هەڵسانی جەجاڵو ماوەی مانەوەی لە زەویدا

١٨٦٠- عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلاَّ سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ، إِلاَّ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، لَيْسَ لَهُ مِنْ نِقَابِهَا نَقْبٌ إِلاَّ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ صَافِّينَ، يَحْرُسُونَهَا، ثُمَّ تَرْجُفُ الْمَدِينَةُ بِأَهْلِهَا ثَلاَثَ رَجَفَاتٍ، فَيُخْرِجُ اللَّهُ كُلَّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ ». (الحديث ١٨٨١، أطرافه ٧١٢٤، ٧١٣٤، ٧٤٧٣): [١٨٦٠]

[١٨٦٠] تجرید پاشکۆی بەرگی دووە/٢، ژمارە: ٨٦٦ = ١٨٨١ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٥٥ - ٧٣١٦ شیحا = ترقیم وتخریج الشیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم (بخاری رقم الکتاب/٢٩ رقم الباب/٩).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جەجاڵ دەچێتە ناو هەموو وڵاتێ، مەککەو مەدینەی لێ دەرچێ هەموو ڕێو بانەکانی مەدینە سێ جار دەهەژێو دانیشتووەکانی ڕادەوەشێنێو سێ لەرزە دەکا، جا لەسەری لەرزەی سێیەما ئیتر هەرچی کافرو مونافیقە کەوان لەناو شاری مەدینەدا، بەهۆی ئەو سێ بوومەلەرزەیەوە خودا لەمەدینە دەریان دەچێنێو دەچن بۆلای جەجاڵ، ناو مەدینە تەنیا موسوڵمانی پاکی تیادا دەمێنێ، ئەوانیش جەجاڵ زیانیان پێ ناگەیەنێ. (تاج/٢/٢٨٢ ز/١٤١ ف/٢-ش).

ئەمەیش گێڕانەوەی پوختەی موسلیمە لە ژمارە: (٢٠٥٥)دا:

عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلاَّ سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ إِلاَّ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ وَلَيْسَ نَقْبٌ مِنْ أَنْقَابِهَا إِلاَّ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ صَافِّينَ تَحْرُسُهَا فَيَنْزِلُ بِالسَّبَخَةِ فَتَرْجُفُ الْمَدِينَةُ ثَلاَثَ رَجَفَاتٍ يَخْرُجُ إِلَيْهِ مِنْهَا كُلُّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ ». {الحديث: ٧٣١٦ = ٧٣٥٠ فم. تجريد البخاري بالكوردي = الترجمة الكردية، الرقم: ٨٦٦ = ١٨٨١، ٧١٢٤، ٧١٣٤، ٧٤٣٤. تحفة الأشراف: ١٧٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جەجاڵ دەچێتە ناو هەموو وڵاتێ، مەککەو مەدینەی لێ دەرچێ، هەموو ڕێو بانەکانی شاری مەدینە، فریشتە لەسەریان ڕیز بوون ئێشکیان دەگرن، جەجاڵ خۆیو کۆمەڵەکەی دێن کە بچن بۆ مەدینە، لەبەر فریشتە ڕێگەیان نابێ، لەبەرئەوە لە شۆرەکاتەکەی نزیکی مەدینە بارو بنەیان لێ دەخەن، کە ئەو شۆرەکاتە پێی دەگوترێ سەبەخەتولجورف، وا لەرووی شامەوە. ئەوجا شاری مەدینە، سێجار دەهەژێو دانیشتووەکانی ڕادەوەشێنێو سێ لەرزە دەکا، جا لەسەری جاری سێیەما ئیتر هەرچی کافرو مونافیقە کەوان لەناو شاری مەدینەدا، بەهۆی ئەو سێ

بوومەلەرزەیەوە، خودا لە مەدینە دەریان دەچێنێ‌و، دەچن بۆلای جەجاڵ، ناو شاری مەدینە تەنیا هەر موسوڵمانی پاکی تیادا دەمێنێ، ئەوانیش جەجاڵ زیانیان پێ ناگەیەنێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤١، ژمارە: ١٧٣٨} + {تاج/٥، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٥٦٢٣، ٥١٢٤ – جەجاڵ دەچێتە ناو هەموو شارێ} + {تاج/٢، زنجیرە: ١٤١، ژمارە: ١٧٣٨} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨١١}.

## (٢٦) باب قُرْب السَّاعَة
## باسی نزیکبوونەوەی هاتنی دوا ڕۆژ

١٨٦١- حديث ابْنُ مَسْعُودٍ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: «مِنْ شِرَارِ النَّاسِ مَنْ تُدْرِكُهُمُ السَّاعَةُ وَهُمْ أَحْيَاءٌ»[١٨٦١]

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لە بەدترینانی مەردوم ئەو کەسانەن، کە قیامەت هەڵ ئەسێ ئەوان زیندوون!).

لە ژمارە: (٢٠٢٢)ی پوختەی موسلیما ئاوایە:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ عَلَى شِرَارِ النَّاسِ». {الحديث: ٧٣٢٨ = ٧٣٦٢ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەتا مەردوم هەموو خراپ‌و گەندو بەد نەبن‌و بێ باوەڕ نەبن قیامەت هەڵناسێ). {تاج/٥، زنجیرە:١٠٥، ژمارە: ٥٥٧٩ – نیشانەی داهاتنی قیامەت}.

---

[١٨٦١] بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٢٢ - ٧٣٢٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٩٢ رقم الباب/٥).

١٨٦٢- عنْ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ رَايْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ باصْبَعَيْهِ هَكَذا بالْوُسْطى وَالَّتِي تَلِي الابْهَامَ بُعِثتُ انا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ). (الحديث ٤٩٣٦ – طرفاه في: ٥٣٠١، ٦٥٠٣): [١٨٦٢]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بە چاوی خۆم چاوم لێ بوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پەنجەی ناوەڕاستی وپەنجەی شایەتمانی، ئاوا جووت کرد و ئاڕاستەی یارانی کردن وفەرمووی: ( من وقیامەت وەك ئەم دوو پەنجەیە، ئاوا دوا بە دوای یەك هاتووین، من دوا هەمینی پێغەمبەرانم و لە دوای من قیامەت هەڵ دەستێ، پێغەمبەری تر نایە). کورت وپوخت : هاکا قیامەت هات.(تاج/٧ ز/٦٢ ل/٢٣٥ سوورەتی —نازیعات).

١٨٦٣- حديث أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ»[١٨٦٣]

بڕوانە ژمارە: (١٨٦٢).

---

[١٨٦٢] تجريد/٤، ژمارە: ١٧١٢ = ٤٩٣٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٦٢ = ٧٣٢٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٧٩).

[١٨٦٣] بڕوانە ژمارە: (١٨٦٢) (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/٣٩).

## (٢٧) باب مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْن
## نێوانی دوو فووەکە

١٨٦٤- عن ابَي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) عَنْ النَّبيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ ارْبَعُونَ قَالُوا: يَا ابا هُرَيْرَةَ ارْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: ابَيْتُ قَالَ: ارْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: ابَيْتُ قَالَ: ارْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: ابَيْتُ وَيَبْلَى كُلُّ شَيْءٍ مِنْ الانْسَانِ الا عَجْبَ ذَنَبِهِ فِيهِ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ. (الحديث: ٤٨١٤- اطرافه في :٤٩٣٥): [١٨٦٤]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( ئەم فوو تا ئەو فوو چلە، - لەم نەفخە تا ئەو نەفخە چلە، = لەنەفخەی یەکەم تانەفخەی دووەم چلە، ) یارانی پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) گوتیان : ئەی ئەبو هورەیرە ؛ مەبەست لەماوەی بەینی دوو فووە کە، کەناسراون بەنەفخەتەین چل ڕۆژە؟ گوتی: نازانم. گوتیان : ئەی مەبەست چل ساڵە؟ گوتی نازانم. گوتیان : ئەی مەبەست چل مانگە ؟ گوتی نازانم و من چونکە ژمێردراوەکەم لە پێغەمبەر(درووودی خودای لێ بێ) نەبیستووە کەچییە لەخۆمەوە ناتوانم بڕیار بدەم کە ساڵە یارۆژە یا مانگە یاحەفتەیە، یاچییە ئەبو هورەیرە فەرمووشی (لەش و ئەندام وهەموو شتێکی ئادەمیزادیش دەرزێ، نووکی بێخی جوجکەی سمتی نەبێ، کەبەقەد دەنکە خەرتەلەیەك دەبێ، لەوێوە فریشتەکان بەفەرمانی خودا سەرلەنوێ هەموو کەسێ وەك حاڵی ژیانی دروستی دەکەنەوە ). (تاج/٧ ل/١٢٥ ز/٢٢ ژ/٨- سوورەتی زومەر —ش ).

---

[١٨٦٤] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٩١ = ٤٨١٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٦٦ = ٧٣٤٠ شیحا = مختصر صحیح مسلم - ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٧٨).

**ڕوونكردنەوە:**

ئەگەر كەسێ بڵێ : ئێمە بەئاشكرا دەبینین كەسێ دەسووتێ، یادەخرێتە ناو تێزابەوە، ئەسەری نامێنێ؟ لە وەلامدا دەڵێین : دەقی فەرموودەی صەحیح، بەفەرضییەی ڕووت ڕەت ناكرێتەوە. ئەم فەرموودەیە هەواڵدانە لەغەیب، غەیبیش خودا نەبێ كەس نازانێ چۆنە، وەكی تریش واتای فەرمووده كە ئەوە ناگەیەنێ كە ئەو عەجبوزەنەبە لە قەبرەكەدا دەمێنێ، وەهەر كەسێ بیەوێ دەتوانێت ببینێ، یادەستی لێ بدات، كەسێ بەوردی سەرنجی قورئان وسووننەتی پێغەمبەر بدات، كۆمەڵێ شتی لەم بابەتە دەبینێ، كە بەدیمەن ورواڵەت، لەگەڵ تێگەیشتنی سەرەتایی ئێمەدا ناگونجێ، یا بڵێین: ئێمە بەتەواوی لە مەبەستەكەی خوداو پێغەمبەر وەك خۆی بەتەواوی وبەباشی تێ ناگەین، مەگەر بەتەئویل وشتی وا، وە ئەهلی تەئویلیش هەر یەكەی بەجۆرێك دەفەرموون.

جا لەم شوێنەدا هەر وەكو ئێمە موشاهەدەی ئەحواڵی سەرە مەرگی مردوو، وەهەروەها ئەحواڵی ناو قەبری و پرسیاری فریشتە لێیو گۆڕەوشارو گوشاد بوونی گۆڕو بوونی بەباخێ لەباخەكانی بەهەشت، یا بەچاڵێ لە چاڵەكانی دۆزەخ، موشاهەدە ناكەین وبەچاو نابینین و بەگوێ نابیستین، مەگەر بۆ پێغەمبەران وپیاوچاكان، ئاوەهاش مانەوەو نەفەوتانی ئەو دەنكە خەرتەلەیە لە عەجبو زەنب بەچاو نابینین و هەستی پێ ناكەین، مەگەر بۆ كەسی خۆی، وە دوور نییە هەروەكووچۆن فریشتە بە فەرمانی خودا بەبەر چاومانە وە گیانی مردوو دەكێشێ ودەیبا بۆ شوێنی تایبەتی، وە ئێمە ئەوچۆنیەتانەو ئەوشوێنانەو ئەوفریشتانە نابینین و سەرو وفەهم وتێگەیشتنی ئێمەن، ئاوەهاش فریشتە ئەو پارچە یە لەمرۆڤ لەكاتی مردندا ببەن و

لەشوێنی تایبەتی خۆیدا هەڵی بگرن ولەکاتی زیندووکردنەوە دا، بەفەرمانی خودا بیکەن بەهەوێنی دروست بوونەوەی جەستەی مردووەکە، وەمەرج نییە کە ئێمە هەست بەوە بکەین، هەروەك هەست بەزۆر روداوی تری کاتی سەرەمەرگ و کاتی بردن بۆ سەرگۆرستان و کاتی دێنی گۆڕ ناکەین، گەرچی ئەمانە لە قورئان وسوونەتدا زۆر بەئاسایی باس کراون.

**کورت و پوخت: بەکوردی پەتی:** (مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوە نییە کە ئەودەنکە خەرتەلەیێ ئێمە بەئەزموون وتاقیکردنەوە،دەتوانین بیچەسپێنین کە نافەوتێ، بەڵکو ئەوە شتێکی نهێنییە، ئیشی خودایە، بەلام مەبەست ئەوەیە: کە لەقیامەتدا فریشتەکان جەستەی مرۆڤەکان لەودەنکە خەرتەلەیەوە دروست دەکەنەوە، هەروەکوو لەسەرەتاوە لەوە دروست کراوە).

لە ژمارە: (٢٠٦٦)ی پوختەی موسلیما ئاوایە:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ ». قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَرْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالُوا أَرْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالُوا أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْتُ « ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ ». قَالَ: « وَلَيْسَ مِنَ الإِنْسَانِ شَىْءٌ إِلاَّ يَبْلَى إِلاَّ عَظْمًا وَاحِدًا وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ». {الحديث: ٧٣٤٠ = ٧٣٧٤ فـم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٦٩١ = ٤٨١٤، ٤٩٣٥. تحفة الأشراف: ١٢٥٠٨}:

ئەبو هورەیرە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەم فوو هەتا ئەو فوو چلە!). یاران گوتیان: ئەی ئەبو هورەیرە! مەبەست لەماوەی نێوانی دوو فووەکە، کە ناسراون بە نەفخەتەین، نەفخەی یەکەمو نەفخەی دووەم، مەبەست لەبەینی ئەم دووانە، کە ئەم فەرموودەیە ئاماژەی بۆ دەکا چل رۆژە؟ گوتی: نازانم. گوتیان: ئەی

مەبەست چل مانگە؟ گوتی: نازانم. گوتیان: ئەی مەبەست چل ساڵە؟ گوتی: نازانم، چونکە من ژمێردراوەکەم لە حەزرەت نەبیستووە کە چییە، لەخۆمەوە ناتوانم بڕیاربدەم کە ڕۆژە، مانگە، ساڵە، چییە، یا هەفتەیە، یا چی ترە. فەرمووی: (جا خودای گەورە کاتێ دەیەوێ مردووەکان زیندوو بکاتەوە لە ئاسمانەوە بارانێ دەبارێنێ، ئیتر بەو بارانە جەستەی مردووەکان سەرلەنوێ هەموو دەڕوێنەوە، هەروەك چۆن دانەوێڵە بە باران دەڕوێ ئاوا). {ژمارە: ٢٠٥٢ لەپێشەوە رابورد}.

هەروەها حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەش و ئەندام و هەموو پارچەو شتەکانی جەستەی مرۆڤ دەڕزێ، نووکی بێخی جووجکەی سمتی نەبێ، کە بەقەد دەنکە خەرتەلەیێ دەبێ، ئەو نارزێ، لە ڕۆژی قیامەتا لەوێوە فریشتەکان بە فەرمانی خودا سەرلەنوێ هەموو کەسێ، وەك حاڵی ژیانی لەو ئێسکەوە دروست دەکەنەوە). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٤٠٧٦}.

## ٥٣- كِتَابُ الزُّهْدِ وَالرَّقَائِقِ
## نامەی جیهان نەویستیو گوێ نەدان بە جیهانو کردارە دڵ لاوێنو دڵ هەژێنەکان

{بڕوانـە: تـاجول ئوصـول، وەرگـەڕاوە کوردییەکـەی، بـەرگی پێنجـەم، زنجیرە: ٩٤، لە ژمـارە: ٥١٥٧ م = مُکـرَّر، هـەتا ژمـارە: ٥٢٥٧ + پوختـەی صـەحیحی بوخاری = تەجریدی بوخاری، زنجیرە: ٨٤، لاپەڕە: ٢٥٩ چاپی یەکەم، ژمـارە: ١٩٩٧ هەتا ژمارە: ٢٠٤١} + {پوختەی موسـلیم/٥، لاپـەڕە/٣٩٣ چـاپی یەکـەم لـە ژمـارە ٢٠٦٦ هەتا ژمارە (٢٠٩٣)}.

١٨٦٥- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رضي الله عنـه) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ -صـلى الله عليه وسلم-: « يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلاَثَةٌ فَيَرْجِعُ اثْنَانِ وَيَبْقَى وَاحِدٌ يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُـهُ وَعَمَلُـهُ فَيَرْجِـعُ أَهْلُـهُ وَمَالُـهُ وَيَبْقَـى عَمَلُـهُ ». {الحـديث: ٧٣٥٠ = ٧٣٨٤ فـم. بخـاري. رقـاق: ٦٥١٤. ترمذي. زهد: ٢٣٧٩. نسائي. جنائز: ١٩٣٦. تحفة: ٩٤٠}:[١٨٦٥]

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سێ شت شوێن مردوو دەکـەونو تاسـەر لێواری گۆڕ لەگەڵی دەچن، بەڵام لەوێ دوانیـان دەگەڕێنـەوەو یـەکێکیان لەگـەڵی دەمێنێتەوە: کەسوکارەکەیو مـاڵو کـردەوەی لەگـەڵیا دەچـن، بـەڵام کەسـوکارو ماڵەکەی دەگەڕێنەوە، تەنیا کردەوەکەی لەگەڵی دەمێنێ!). {تاج/١، زنجیـرە: ٢١٩، ژمارە: ١١٢٥} + {ڕیاض/٢، زنجیرە: ٥٥، ژمـارە: ٤٦١ + ریـاض/١، زنجیـرە: ١١، ژمـارە: ١٠٤}.

---

[١٨٦٥] بخـاری. رقـاق: ٦٥١٤. پوختــەی موسـلیم/٥، ژمـارە: ٢٠٨٦ - ٧٣٥٠ شـیحا (بخـاری رقـم الکتاب/٨١ رقم الباب/٤٢).

١٨٦٦- عَنْ عَمْرِو بْنَ عَوْفٍ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- بَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ (رضي الله عنه) إِلَى الْبَحْرَيْنِ يَأْتِي بِجِزْيَتِهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- هُوَ صَالَحَ أَهْلَ الْبَحْرَيْنِ وَأَمَّرَ عَلَيْهِمُ الْعَلاَءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ، فَقَدِمَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِمَالٍ مِنَ الْبَحْرَيْنِ. فَسَمِعَتِ الأَنْصَارُ بِقُدُومِ أَبِي عُبَيْدَةَ فَوَافَوْا صَلاَةَ الْفَجْرِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- انْصَرَفَ، فَتَعَرَّضُوا لَهُ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- حِينَ رَآهُمْ، ثُمَّ قَالَ: « أَظُنُّكُمْ سَمِعْتُمْ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدِمَ بِشَيْءٍ مِنَ الْبَحْرَيْنِ؟». فَقَالُوا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: « « فَأَبْشِرُوا وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ، فَوَاللَّهِ مَا الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ. وَلَكِنِّي أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ الدُّنْيَا عَلَيْكُمْ، كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا، وَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ ». {الحديث: ٧٣٥١ = ٧٣٨٥ فـم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٢٧٧ = ٣١٥٨، ٤٠١٥، ٦٤٢٥ فتح البخاري}:[١٨٦٦]

عەمری کوڕی عەوف (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبو عوبادەی کوڕی جەراحی نارد بۆ بەحرەین، کە سەرانەی وڵاتی بەحرەین بهێنێ، چونکە لەوەبەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ خەڵکی وڵاتی بەحرەیندا ڕێکەوتبوو، عەلای کوڕی حەزرەمی کردبوو بە سەرداریان، کە ئەبو عوبەیدە هاتەوە ماڵێکی زۆری لە بەحرەینەوە لەگەڵ خۆی هێنابوو، یاریدەدەران (ئەنصار)یش بیستیانەوە کە ئەبو عوبەیدە هاتۆتەوە، سامانێکی باشی هێناوە بۆ موسوڵمانان، ئیتر بۆ نوێژی بەیانی هاتن

---

[١٨٦٦] تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = پوختەی بوخاری بە کوردی/٣، ژمارە: ١٢٧٧ = ٣١٥٨ بخاری. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢٠٨٠ = ٧٣٥١ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٥٨ رقم الباب/١).

بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆیان کردو گەڕایەوە، جا یاریدەدەران لەوکاتەدا داوای بەشیان لێکرد.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەم حاڵە بینینی بزەیەك گرتیو فەرمووی: (وادەزانم کە زنەوتووتانە کە ئەبو عوبەیدە لە بەحرەینەوە شتێکی هێناوە؟). عەرزیانکرد: بەڵێ وایە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دە موژدەبێ لە ئێوەو خۆشیتان لێ بێو هەمیشە ئومێدی خێرو هیوای خۆش، باڵ بکێشێ بەسەرتانا، دەسا بەزاتی خودا، من لەهەژاری لێتان ناترسم، بەڵام بەپێچەوانەوە مەترسی ئەوەم هەیە کە ئێوەش وەك نەتەوەکانی پێش ئێوە خۆشی جیهان رووتان تێبکا، دنیا بێت بە پیرتانەوەو ئێوەیش وەك ئەوان بەدەستو بەدەم پەلاماری دنیا بدەنو باوەشی پیابکەنو تێی ورووکێنو هەرکەسەتان بیەوێ کە هەر بۆخۆی بیماشێتەوە، جا ئەوکاتە وەك چۆن ئەوانی لەناوبرد، ئاوا ئێوەش لەناو ببات). {تاج/٤، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٤٥٢٣ + تاج/٥، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥١٥٩} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٤٥٧}.

**روونکردنەوە:**

عەمری کوڕی عەوفی ئەنصاری ئامادەی غەزای بەدر بووە، لە مەدینە نیشتەجێ بوو، وەچەی نەبوو، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا مرد، کە مرد عومەر نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد.

١٨٦٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِذَا نَظَرَ أَحَدُكُمْ إِلَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ فِي الْمَالِ وَالْخَلْقِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ. (الحديث ٦٤٩٠):[١٨٦٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ئەگەر تەماشای کەسێکتان کرد، کەلەماڵو سامانو شێوە جوانیدا، باوی هەبوو بەسەر ئێوەوە، باتەماشای خوار خۆشتانەوە بکەن، نەبادا بەهۆی ئەوەوە خۆتان بەمەغدوور بزانن‌و، ئەونازو بەهرەو نیعمەتەی کە خواپێی بەخشیون بەکەمی بزانن‌و سەبارەت بەوە تووشی هەڵەو ناسوپاسی ببن!. (تاج/٩ ز/٩٦ ل/٢٩٩ ژ/٢+ل-٣٠٠ ژ/٣).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە: (٢٠٨٧)ی پوختەی موسلیمە:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « انْظُرُوا إِلَى مَنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَلاَ تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لاَ تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ ». قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ « عَلَيْكُمْ ». {الحديث: ٧٣٥٦ = ٧٣٩٠ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (تەماشای حاڵی لە خۆتان خوارتر بکەن، تەماشای لەخۆتان بەرەو ژورتر مەکەن، چونکە ئەگەر وانەکەن لەوانەیە ئەو نازو بەهرانەی کە بەپێی حاڵ، خودا داویانی پێتان، لەبەر چاوتان بکەون‌و بەکەمیان بزانن!).

گێڕانەوەی بوخاری ئاوایە: (ئەگەر کەسێ لە ئێوە تەماشای حاڵو ماڵی کەسێکی تری کرد، کە بە ماڵو مناڵو حاڵو ڕەنگو روو لەخۆی باشتر بوو، با

---

[١٨٦٧] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠١٨ = ٦٤٩٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٨٧ = ٧٣٥٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/٣٠).

**تەماشای حاڵی خوار خۆشیەوە بکا، نەبادا دڵ لەدڵ بداو نا سوپاس دەرچیٚ و سوپاسی بەهرەی خودا نەکاو خۆی بەهەرە خواروو بزانیٚ).**

**١٨٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ: « إِنَّ ثَلاَثَةً فِى بَنِى إِسْرَائِيلَ أَبْرَصَ وَأَقْرَعَ وَأَعْمَى فَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مَلَكًا فَأَتَى الأَبْرَصَ فَقَالَ أَىُّ شَىْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ لَوْنٌ حَسَنٌ وَجِلْدٌ حَسَنٌ وَيَذْهَبُ عَنِّى الَّذِى قَدْ قَذِرَنِى النَّاسُ. قَالَ فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ قَذَرُهُ وَأُعْطِىَ لَوْنًا حَسَنًا وَجِلْدًا حَسَنًا قَالَ فَأَىُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ الإِبِلُ - أَوْ قَالَ الْبَقَرُ شَكَّ إِسْحَاقُ - إِلاَّ أَنَّ الأَبْرَصَ أَوِ الأَقْرَعَ قَالَ أَحَدُهُمَا الإِبِلُ وَقَالَ الآخَرُ الْبَقَرُ - قَالَ فَأُعْطِىَ نَاقَةً عُشَرَاءَ فَقَالَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا - قَالَ - فَأَتَى الأَقْرَعَ فَقَالَ أَىُّ شَىْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ شَعَرٌ حَسَنٌ وَيَذْهَبُ عَنِّى هَذَا الَّذِى قَذِرَنِى النَّاسُ. قَالَ فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ وَأُعْطِىَ شَعَرًا حَسَنًا - قَالَ - فَأَىُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ الْبَقَرُ. فَأُعْطِىَ بَقَرَةً حَامِلاً فَقَالَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا - قَالَ - فَأَتَى الأَعْمَى فَقَالَ أَىُّ شَىْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ أَنْ يَرُدَّ اللَّهُ إِلَىَّ بَصَرِى فَأُبْصِرَ بِهِ النَّاسَ - قَالَ - فَمَسَحَهُ فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيْهِ بَصَرَهُ. قَالَ فَأَىُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ الْغَنَمُ. فَأُعْطِىَ شَاةً وَالِدًا فَأُنْتِجَ هَذَانِ وَوَلَّدَ هَذَا - قَالَ - فَكَانَ لِهَذَا وَادٍ مِنَ الإِبِلِ وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الْبَقَرِ وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الْغَنَمِ. قَالَ ثُمَّ إِنَّهُ أَتَى الأَبْرَصَ فِى صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ فَقَالَ رَجُلٌ مِسْكِينٌ قَدِ انْقَطَعَتْ بِىَ الْحِبَالُ فِى سَفَرِى فَلاَ بَلاَغَ لِىَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ أَسْأَلُكَ بِالَّذِى أَعْطَاكَ اللَّوْنَ الْحَسَنَ وَالْجِلْدَ الْحَسَنَ وَالْمَالَ بَعِيرًا أَتَبَلَّغُ عَلَيْهِ فِى سَفَرِى. فَقَالَ الْحُقُوقُ كَثِيرَةٌ. فَقَالَ لَهُ كَأَنِّى أَعْرِفُكَ أَلَمْ تَكُنْ أَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ فَقِيرًا فَأَعْطَاكَ اللَّهُ فَقَالَ إِنَّمَا وَرِثْتُ هَذَا الْمَالَ كَابِرًا عَنْ كَابِرٍ. فَقَالَ إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ. قَالَ وَأَتَى الأَقْرَعَ فِى صُورَتِهِ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لِهَذَا وَرَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَ مَا رَدَّ عَلَى هَذَا فَقَالَ إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ. قَالَ وَأَتَى الأَعْمَى فِى صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ فَقَالَ رَجُلٌ مِسْكِينٌ وَابْنُ سَبِيلٍ انْقَطَعَتْ بِىَ الْحِبَالُ فِى سَفَرِى فَلاَ بَلاَغَ لِىَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ**

أَسْأَلُكَ بِالَّذِي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شَاةً أَتَبَلَّغُ بِهَا فِي سَفَرِي فَقَالَ قَدْ كُنْتُ أَعْمَى فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيَّ بَصَرِي فَخُذْ مَا شِئْتَ وَدَعْ مَا شِئْتَ فَوَاللَّهِ لاَ أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ شَيْئًا أَخَذْتَهُ لِلَّهِ فَقَالَ أَمْسِكْ مَالَكَ فَإِنَّمَا ابْتُلِيتُمْ فَقَدْ رُضِيَ عَنْكَ وَسُخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ. {الحديث: ٧٣٥٧ = ٧٣٩١ فم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية = المجلد الرابع. الرقم: ١٣٨٢ = ٣٤٦٤، ٦٦٥٣ فتح الباري. رياض/١، زنجيره: ٥، ژماره: ٦٥. تحفة الأشراف: ٦٦٥٣} :[١٨٦٨]

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودیو رەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: بە گوێچکەی خۆم ئەم داستانەم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیست دەیفەرموو: سێ کەس لەنەوەی ئیسرائیل، واتە: لەبەنی ئیسرائیل، کە ناسراون بە گەلی جوولەکە: بەڵەکێكو کەچەڵێكو کوێرێك، خودای گەورە دەیەوێ تاقییان بکاتەوە، جا فریشتەیێ لەسەر شێوەی پیاوێ دەنێرێ بۆلایان، فریشتەکە دەچێتە لای بەڵەکەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لەچییە؟ دەڵێ: حەزم لە رەنگو بۆیەکی جوانو پێستێکی جوانەو ئەم بەڵەکییەشم نەمێنێ، کە بووە بەهۆی ئەوە کە خەڵك قێزو بێزم لێ دەکەنەوە، فریشتەکە دەستێ دەهێنێ بەسەر جەستەیدا ئیتر یەك تۆز چەپەڵییەکەی نامێنێو، رەنگو بۆیەکی جوانو پێستێکی جوانیشی پێ دەدرێ، ئەوجا فریشتەکە پێی دەڵێ: حەزت لەچی جۆرە ماڵێکە؟ پیاوەکە دەڵێ: حەزم لە وشترە، یاخود دەڵێ: حەزم لە رەشە وڵاخە، ئیسحاق – کە یەکێکە لە بگێڕەوە (راوی)یەکانی ئەم فەرموودەیە – گومانی لەوەدا بۆ پەیدا بوو کە بەڵەكو کەچەڵەکە کامیان داوای وشترو کامیان داوای رەشە وڵاخی کردبوو، فەرمووی: جا وشترە

---

[١٨٦٨] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٨٢ = ٣٤٦٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٨٣ = ٧٣٥٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٠ رقم الباب/٥١).

مێچکەیەکی هەراش ئاوسی لەسەر گووانی دەداتێو پێی دەڵێ: خودا پیتو فەڕی تێ بخا بۆت).

فەرمووی: ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆلای کەچەڵەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لەچییە؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لە قژێکی جوانەو ئەم کەچەڵییەیشم نەمێنێ، کەبووە بەهۆی ئەوەی خەڵك قێزو بێزم لێ بکەنەوە).

فەرمووی: (جا فریشتەکە دەستێ دەهێنێ بەسەریدا، ئیتر کەچەڵییەکەی دەڕواو قژێکی جوانیشی پێ دەدرێ، ئینجا پێی دەڵێ: حەز لەچی جۆرە سامانێ دەکەی؟ دەڵێ: لە ڕەشە وڵاخ، جا مانگایەکی ئاوسی دەداتێو پێی دەڵێ: خودا پیتو فەڕو بەرەکەتی تێ بخات بۆت).

فەرمووی: (ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆلای کوێرەکەو پێی دەفەرموێ: زیاتر حەزت لەچییە؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لەدوو چاوی ساغو گەشە، کە خودا بیاندات پێم، هەتا ئەم خەڵکەیان پێ ببینم!). فەرمووی: (جا دەستێ دەهێنێ بە چاوەکانیداو خودا چاوەکانی پێ دەداتەوە، جا پێی دەفەرموێ: ئەی حەز لەچی جۆرە سامانێ دەکەی؟ دەڵێ: لە مەڕ، جا مەڕێکی زاوی بەرخ بەبەری پێ دەدا، ئیتر بەرە بەرە ئاژەڵەکان زاوزێ دەکەنو ئەوانیش بەرهەمیان دەهێنن، تا وازۆر دەبن، ئەمیان بوو بەخاوەنی پڕ شیوێ وشترو ئەویان بوو بەخاوەنی پڕ دۆڵێ ڕەشە وڵاخو ئەوی تریشیان بوو بەخاوەنی پڕ شیوێ گەلە ڕان). فەرمووی: لەپاشدا فریشتەکە خۆی لێ گۆڕینو لەسەر شێوەو شکڵی ئەوسای بەڵەکەکە خۆی هاتەوە بۆلایو پێی فەرموو: پیاوێکی هەژاری داماوی ڕێبواری لێقەوماوم، سەر بەهیچ لایەکا دەرناکەم، سا مەگەر یەکەم بە پشتیوانی خوداو دووەم بەهۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە جێگەو ڕێگەی خۆم، جا توبیتو ئەوکەسەی کە ئەم شێوە شیرینەو ئەم لەشو لارە جوانەو ئەمماڵە زۆرەی پێ بەخشیوی،

وشترێکم پێ بدە تا لەم سەفەرەمدا خۆمی پێ بگەیەنمەماڵەوە، کەچی کابرا گوتی: خاوەن بەش زۆرن بەرتۆ ناکەوێ!

فریشتەکەیش پێی فەرموو: وەك من تۆ بناسمەوە وایە، ئەرێ تۆ ئەو پیاوە بەڵەکە نیت کە خەڵك بێزی لێ دەکردیتەوە، وە ئەو هەژارە نیت کە خودا دەوڵەمەندی کردیت! گوتی: نەخێر من ئەو نیم، من ئەم ماڵو سامانەم لە باوكو باپیرمەوە بۆ بەجێ ماوە، ئەوانیش هەر بووە بوونو پشتاو پشت بە بەگزادەیی هاتوونەتە خوارەوە!

فریشتەکەیش دەفەرموێ: ئەگەر درۆ دەکەی، خودا وەك جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە).

فەرمووی: (جا لەسەر شێوەی شەکڵی پێشووی کەچەڵەکەدا، چوو بۆلای ئەویش، چی بە بەڵەکەکە گوت دیسان بەمیشی گوت، وە بەڵەکەکە چی بە فریشتەکە گوت، دیسان کەچەڵەکەیش ئەوەی پێی گوت، فریشتەکەیش فەرمووی: ئەگەر درۆ دەکەی خودا وەك جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە!).

فەرمووی: (جا لە شێوەو شەکڵی پێشووی کوێرەکەیشدا هاتەوە بۆلایو پێی فەرموو: پیاوێکی هەژاری داماوی رێبواری لێقەوماوم سەر بەهیچ لایەکا دەرناکەم، سا مەگەر یەکەم بە پشتیوانی خوداو دووەم بەهۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شوێنو جێگەی خۆم، جا توبیتو ئەو خودایەی کە چاوەکانی چاك کردیتەوە مەڕێکم پێ بدە بەشکوو لەم سەفەرەمدا پێی بگەمەوە ماڵەوە. پیاوە کوێرەکە دەڵێ: ئای منیش وەك ئێستای تۆ کوێر بوومو دەزانم کە کوێر چەندە کۆڵەوارە، وە خودا چاوی چاك کردمەوە، سەرەڕای ئەوەیشە هەژاریش بوومو دەزانم کە هەژاری چەندە ناخۆشە، جا کەواتە بەئارەزووی خۆت چی دەبەیت لەم سامانەی من بۆ خۆت ببە، دەست ناهێنمە رێگەت، وەچی دەهێڵیتەوە

بۆمن ئارەزووی خۆتە، بەو خودایە هەرچی تۆ ئەمڕۆ لەم ماڵەی من، بیبەیت بۆ خۆت، لە ڕێگەی خودادا دەست ناهێنمە ڕێگەت!

فریشتەکە فەرمووی: ماڵی خۆت بۆ خۆت، من فریشتەم هەوەجێم بە ماڵ نییە، لەڕاستیدا ڕووداو و داستانەکە ئاوایە: ئێوە – واتە: تۆو بەڵەکو کەچەڵەکە – لەلایەنی خودای گەورەوە تاقی کرانەوە، خودا لەتۆ ڕازییە، چونکە خۆت لێ نەگۆڕاوە، بەلام لەهەردوو هاوڕێکەت ناڕازییە). {تاج/٥، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٥٢٤٠ + ریاض/١، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٦٥ - المراقبة}.

١٨٦٩- عَنْ سَعْدَ بْنَ أَبِى وَقَّاصٍ (رضي الله عنه) قال: وَاللَّهِ إِنِّى لأَوَّلُ رَجُلٍ مِنَ الْعَرَبِ رَمَى بِسَهْمٍ فِى سَبِيلِ اللَّهِ، وَلَقَدْ كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- مَا لَنَا طَعَامٌ نَأْكُلُهُ إِلاَّ وَرَقُ الْحُبْلَةِ، وَهَذَا السَّمُرُ حَتَّى إِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ كَمَا تَضَعُ الشَّاةُ، ثُمَّ أَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ تُعَزِّرُنِى عَلَى الدِّينِ، لَقَدْ خِبْتُ إِذًا وَضَلَّ عَمَلِى. {الحديث: ٧٣٥٩ = ٧٣٩٣ فم. بخاري. مناقب سعد بن أبي وقاص: ٣٧٢٨، ٥٤١٢، ٦٤٥٣. ترمذي. زهد: ٢٣٦٥. ابن ماجة. فضائل أصحاب رسول الله: ١٣١. تحفة الأشراف: ٣٩١٣}:[١٨٦٩]

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سوێندم بە خودای گەورە من یەکەم پیاو بووم لە عەرەب کە یەکەم تیرم هاویشت بەرەو دوژمن، لەڕێگەی خودادا، ئەوسا حاڵمان گەلێ پەڕپووت بوو، گەلێ جار لە خزمەتی حەزرەتدا کە دەچووین بۆ غەزا، خۆراکمان تەنیا بەرو گەڵای دارو درەختی ئەو بیابانە بوو، کە لەناچاریدا نەبێ ناخورێ، تەنانەت وامان لێ هاتبوو کە سەراومان دەکرد، وەك پشقلی مەڕو بزن وابوو، یەکی دەگرت، کلۆ

---

[١٨٦٩] بخاری. مناقب: ٣٧٢٨. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٨٤ = ٧٣٥٤ (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/١٧).

کلۆ دەوەستا من ئاوا لەگەڵ گەشەکردنی ئیسلامدا هێناومەو پەروەردە بووم، کەچی ئێستا خێڵی بەنی ئەسەد لەسەر ئاینداری سەر زەنشتی من دەکەن، تەنانەت نەفامەکانیان دەڵێن سەعد نوێژیش بەجوانی نازانێ!

بەڕاستی ئەگەر قسەی ئەوان ڕاست بێ‌و سەر زەنشتەکەیان لەسەر هەق بێ، ئەوا واتای وایە کەمن نائومێد دەرچووم‌و رەنجم با بردوویەتی!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٢٢٣م – گوزەرانی پێغەمبەر} + {ریاض/٢، زنجیرە:٥٦، ژمارە: ٥٠٠ – باسی خێرو بەهرەی برسێتی‌و سادەی...} + {ریاض/٣، زنجیرە:٢٥٣، ژمارە: ١٥٠٥ – باسی بەهرە(کەرامەت)ی پیاو چاکان} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٦ – خێرو بەهرەی برسێتی‌و سادەی گوزەران...} .

١٨٧٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ -صلى الله عليه وسلم-: « اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتًا ». {الحديث: ٧٣٦٧ = ٧٤٠١ فم. تجريد البخاري/٥، رقم: ٢٠٠٩ = ٦٤٦٠ فتح الباري}:[١٨٧٠]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خودایە! رزق‌و رۆژیی کەسوکاری موحەممەد ئەوەندە بدە کە سەروبەر پێی بژین‌و بەس!). {تاج/٢، زنجیرە:٢٠، ژمارە: ١٢٦١ + ریاض/٢، لاپەڕە: ٧٣، زنجیرە:٥٦، ژمارە: ٥٠١} .

١٨٧١- حديث عَائِشَةَ – رضى الله عنها – قَالَتْ مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ – صلى الله عليه وسلم – مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ مِنْ طَعَامِ الْبُرِّ ثَلاَثَ لَيَالٍ تِبَاعًا ، حَتَّى قُبِضَ.[١٨٧١]

---

[١٨٧٠] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٠٩ = ٦٤٦٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٦٩ = ٧٣٦٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/١٧).

[١٨٧١] تجرید/٥، ژمارە: ١٨١١ = ٥٤١١ بخاری. مسلم: ٧٣٧٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٠ رقم الباب/٢٣).

حەزرەتی عائیشە، هاوسەری پێغەمبەری خودا، لە هەردوو جیهانا، دەفەرموێ: (لەو ڕۆژەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، هەتا گیانی پاکی سپارد، خێزانەکانی موحەممەد لەو ماوەیەدا، سێ ڕۆژ لەسەر یەك تێریان لە نانی گەنم نەخواردووە!).

١٨٧٢- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ -صلى الله عليه وسلم- يَوْمَيْنِ مِنْ خُبْزِ بُرّ إِلاَّ وَأَحَدُهُمَا تَمْرٌ. {الحديث: ٧٣٧٤ = ٧٤٠٨ فم، بخاری. رقاق: ٦٤٥٥. تحفة الأشراف: ١٧٣٣٥}.[١٨٧٢]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خێزانی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، دوو ڕۆژ لەسەر یەك، تێرسکی خۆیان لەنانی گەنم نەخواردووە، مەگەر ڕۆژێ نانی گەنمیان خواردبێ‌و ڕۆژەکەی تر خورمایان خواردبێ). {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٤٩١، ٤٩٣} + {تجريد البخاری/٥، ژمارە: ١٨١١ = ٥٤١١، ٦٤٥٤ فتح الباری}.

١٨٧٣- عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: وَاللَّهِ يَا ابْنَ أُخْتِي إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الْهِلاَلِ ثُمَّ الْهِلاَلِ ثُمَّ الْهِلاَلِ، ثَلاَثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ، وَمَا أُوقِدَ فِي أَبْيَاتِ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- نَارٌ – قَالَ: - قُلْتُ: يَا خَالَةُ فَمَا كَانَ يُعَيِّشُكُمْ؟ قَالَتِ: الأَسْوَدَانِ، التَّمْرُ وَالْمَاءُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَدْ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- جِيرَانٌ مِنَ الأَنْصَارِ، وَكَانَتْ لَهُمْ مَنَائِحُ، فَكَانُوا يُرْسِلُونَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- مِنْ أَلْبَانِهَا فَيَسْقِينَاهُ. {الحديث: ٧٣٧٨ = ٧٤١٢ فم. پوختەی

---

[١٨٧٢] تجريد البخاری/٥، ژمارە: ١٨١١ = ٥٤١١ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٧٢ = ٧٣٧٤ (بخاری رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/١٧).

صـــەحیحی بوخـــاری = تەجریـــدی بوخـــاری /٣، ڕەقـــم: ١٠٩٦ = ٢٥٦٧، ٦٤٥٨، ٦٤٥٩}: [١٨٧٣]

عـــورووەی خوشـــکەزای حـــەزرەتی عائیـــشە (ڕەزای خـــودا لـــە حـــەزرەتی عائیشەو ڕەحمـەتی خـودا لـەو) فـەرمووی: پوورم پێـی گـوتم: ئـەی خوشـکەزای شیرینم! جاری وابووە سێ مانگی یەك شەوەمان دەبینی، یەك لە دوای یـەك، کـە دەق دەکاتـە دوو مـانگی ڕێـك، لـە مـاوەی ئـەو دوو مانگـەدا، ئـاگر لـە ماڵـەکانی خێزانەکانی پێغەمبەردا نەدەکرایەوە بۆ نانو چێشت کردن!!

عـوروە فـەرمووی: منـیش گـوتم: ئـەی باشـە پـووری! بەچـی دەژیـانو گوزەرانتان بەچی بـوو؟ فـەرمووی: بـەس بـەخورماو ئـاو! بـەڵام چـەند مـاڵێکی ئەنـساری هاوسـێی پێغەمبـەر بـوون، ئـاژەڵی بەشـیریان هـەبوو، لەشـیری ئـەو ئاژەڵانـە، بـە دیـاری بەشـی پێغەمبـەریان دەدا، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەو شـیرەی دەرخـواردی ئێمـە دەدا). {تـاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمـارە: ٥٢٢٠م – باسی گوزەرانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) }.

١٨٧٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها: تُوفِّيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حين شَبِعْنَا مِنْ الأَسْوَدَيْنِ: التمرِ وَ المَاءِ. (الحديث ٥٣٨٣ طرفه في: ٥٤٤٢): [١٨٧٤]

عائیـشە (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: هـەر لەگـەڵ تێرسـکی خۆمـان لـەخورماو ئـاو خـوارد، ئـیتر ئەوەنـدەی پـێ نەچـوو، پێغەمـەر -دروودی خـوای

---

[١٨٧٣] تجریـد = پوختـەی صـەحیحی بوخـاری/٢، ژمـارە: ١٠٩٦ = ٢٥٦٧ بخـاری. پوختـەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٧٠ = ٧٣٧٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥١ رقم الباب/١).

[١٨٧٤] تجریـد البخـاری بـالکردی/٥، ژمـارە: ١٨٠٢ = ٥٣٨٥ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٥، ژمـارە: ٢٠٧٢ = ٧٣٨٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٠ رقم الباب/٦).

لەسەر بێ- وەفاتی کرد. (تاج/٩ ل/٣١٦ ژ/٥ + ٦ ) + (ریاض صالحین/٢ ل/٦٤ ز/٦٥ ژ/٤٩٢).

١٨٧٥- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ مِنْ طَعَامِ بُرٍّ ثَلَاثَ لَيَالٍ تِبَاعًا حَتَّى قُبِضَ.(الحديث/٥٤١١ طرفه في: ٦٤٥٤): [١٨٧٥]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەوکاتەوە کە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کۆچی کرد بۆ مەدینە، تا ئەو رۆژەی کەخودا بەرەحمەت بردیەوە بۆلای خۆی، خۆی‌و خێزانەکەی سێ شەو لەسەر یەك تێر سکی خۆیانیان لەنانی گەنم نەخواردووە!. (تاج/٩ ل/٣١٥ ز/٩٦ ژ/١ ش/ت).

عَنْ أَبِي حَاتِمٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ (وَقَالَ ابْنُ عَبَّادٍ وَالَّذِي نَفْسُ أَبِي هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ) مَا أَشْبَعَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَهْلَهُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ تِبَاعًا مِنْ خُبْزِ حِنْطَةٍ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا. {الحديث: ٧٣٨٣ = ٧٤١٧ فم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكرديَّة/٥، رقم: ١٨١١ = ٥٤١١ فتح الباري. ترمذي. زهد: ٢٣٥٨. تحفة الأشراف: ١٣٤٤٠}:

ئەبو حاتەم (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، ئەمە لەفظی ئیبنو ئەبی عومەیرە، کە شێخی موسلیمەو موسلیم ئەم فەرموودەیەی لێوە دەگێڕێتەوە، بەڵام موسلیم لە مامۆستایەکی تریەوە کە موحەممەدی کوڕی عەببادە، سوێندەکەی ئەبو هورەیرە ئاوا دەگێڕێتەوە:

---

[١٨٧٥] تجرید/٥، ژمارە: ١٨١١ = ٥٤١١ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢٠٧٣ = ٧٣٨٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٠ رقم الباب/١).

بەوكەسە كە گیانی ئەبو هورەیرەی بەدەسە، لەوكاتەوە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كۆچی كردووە بۆ مەدینە، هەتا ئەو رۆژەی كە خودا بەرەحمەت بردیەوە بۆلای خۆی، خۆیو خێزانەكەی، سێ رۆژ لەسەر یەك، تێر سكی خۆیانیان لەنانی گەنم نەخواردووە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٥١٨٥ م + تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٢٦١} + {تاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٢١٥ م} .

## (١) باب لا تَدْخُلُو مَسَاكِنَ الَّذِين ظَلَمُوا أنفسهم إلا أن تكونوا باكين مەڕۆنە ناو وڵاتو نیشتەمەنو شوێنو جێگەی زۆردارەكانو ستەمكارەكانەوە، مەگەر بە گریانەوە

١٨٧٦- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، وَهُوَ يَذْكُرُ الْحِجْرَ مَسَاكِنَ ثَمُودَ، قَالَ سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: مَرَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) عَلَى الْحِجْرِ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «لاَ تَدْخُلُوا مَسَاكِنَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ إِلاَّ أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ حَذَرًا أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ». ثُمَّ زَجَرَ فَأَسْرَعَ حَتَّى خَلَّفَهَا. {الحديث: ٧٣٩٠ = ٧٤٢٥ فم. تجريد البخاري بالكوردي/ ٤، رقم: ١٣٥٧ = ٣٣٨٠ فتح الباري}:[١٨٧٦]

ئیبنو شەهاب، كە ناسراوە بە زوهری، باسی وڵاتی حیجری دەكرد، كە حیجر وڵاتی هۆزی ثەموودە، فەرمووی: سالمی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عومەری كوڕی خەطاب (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوكم فەرمووی: لە غەزای تەبووكا، كاتێ لەخزمەت پێغەمبەردا، گەیشتینە خاكی حیجر، بە ئێمەی

[١٨٧٦] تجريد البخاري بالكردی/٤، زمارە: ١٣٥٧ = ٣٣٨٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، زمارە: ١٨٣٤ = ٧٣٩٠ شيحا = مختصر صحيح مسلم بالكردی، ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا (بخاری رقم الكتاب/٨ رقم الباب/٥٣).

فەرموو: (مەڕۆنە ناو شوێنەوارو شوێنو هەواری ئەم گەلە دوابڕاوەوە، کە زۆرو ستەمیان لەخودی خۆیان کردووە، مەگەر بەگریانەوە، مەبادا ئەوەی کە تووشی ئەوان بووە، تووشی ئێوەیش ببێو بەسەرهاتە ناخۆشو پڕ ناسۆرەکەی ئەوان لەئێوەیش رووبدات).

ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیی لە وشترەکەی ژێری کردو تێی خوڕیو بەپەلە تێپەڕی هەتا خاکی حیجری بەجێ هێشت. {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٣٩٤١ ج/٤}.

١٨٧٧- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّاسَ نَزَلُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) عَلَى الْحِجْرِ أَرْضِ ثَمُودَ، فَاسْتَقَوْا مِنْ آبَارِهَا، وَعَجَنُوا بِهِ الْعَجِينَ، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَنْ يُهَرِيقُوا مَا اسْتَقَوْا وَيَعْلِفُوا الإِبِلَ الْعَجِينَ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَسْتَقُوا مِنَ الْبِئْرِ الَّتِى كَانَتْ تَرِدُهَا النَّاقَةُ. {الحديث: ٧٣٩١ = ٧٤٢٦ فم}:[١٨٧٧]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویی: لەغەزای تەبووکدا، کاتێ پێغەمبەرو هاوەڵانی، گەیشتنە خاکی حیجر، کە وڵاتی هۆزی ئەموودە، لەوێ دابەزینو لایاندا، لەوێ هاوەڵان ئاویان لەبیرەکانی هەڵگۆزیو هەویریان پێکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نە لەئاوی بیرەکانی بخۆنەوەو نە ئاویان لێ بگرن).

عەرزیانکرد: ساخۆ هەویریشمان پێ شێلاوەو ئاویشمان لێیان هەڵگرتووە! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردن: کە ئاوەکە بڕێژنو هەویرەکەیش لەباتی ئالیك فڕێدەنە بەروشترەکان).

---

[١٨٧٧] بخاری. أحادیث الأنبیاء: ٣٣٧٩. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٣٥ = ٧٣٩١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٠ رقم الباب/١٧).

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێیانکرد: کە لەو بیرە ئاو بگرن، کە وشترەکە دەچووە سەری ئاوی لێ دەخواردەوە!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٣٩٤٢ ج/٤} . سوورەتی حیجر.

## (٢) باب الإحسَانِ إلَى الأرْمَلَةِ والمسكين وَاليتيم
## باسی چاکەکردن لەگەڵ بێوەژن و مسکێن و هەتیو

١٨٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ الْقَائِمِ اللَّيْلَ الصَّائِمِ النَّهَارَ.( الحديث ٥٣٥٣، طرفاه في: ٦٠٠٦، ٦٠٠٧): [١٨٧٨]

ئەبو هورەیرە –ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: خۆشەویست –دروودی خوای لەسەر- فەرمووی: (کەسێ تێبکۆشێ لەپێناوی ژنی بێ مێردو مرۆڤی هەژارداو، ساغ بۆ ڕەزای خودای گەورە بەخێویان بکاو خزمەتیان بکا، ژێوار و گوزەرانی ئاسوودەیان بۆ فەراهەم بهێنێ، ئەوە بەقەد ئەو کەسە خێرو پاداشی بۆ هەیە: کەساغ لەبەر ڕەزای خودا خەبات دەگێڕێ و غەزادەکاو ناودەردەکات بەغەزاکار لەڕێگەی خوادا، یا بەقەد ئەو کەسە خێرو پاداشی باشی بۆهەیە کەبەشەو هەرشەو نوێژبکا و لێی سارد نەبێتەوەو، بە ڕۆژیش هەمیشە بەرۆژو بێو ساڵ دوانزە مانگە بەرۆژوو بێ یەك ڕۆژی لێ نەشکێنێ). (ریاض/١ ل/٢٣٢ = ژمارە/٦/٢٦٥-١).

ئەمەیش ژمارە: (١٧٦٧)ی پوختەی موسلیمە:

---

[١٨٧٨] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٩٨ = ٥٣٥٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٧٦٧ = ٧٣٩٣ شیحا - ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم (بخاری رقم الکتاب/٦٩ رقم الباب/١).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ رسول الله (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ» وَأَحْسِبُهُ قَالَ: «وَكَالْقَائِمِ لاَ يَفْتُرُ، وَكَالصَّائِمِ لاَ يُفْطِرُ». {الحديث: ٧٣٩٣ = ٧٤٢٨ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٧٩٨ = ٥٣٥٣، ٦٠٠٦، ٦٠٠٧. ترمذي. بروصلة: ١٩٦٩. نسائي. زكاة: ٢٥٧٦}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ تێبکۆشێ لەپێناوی ژنی بێ مێردو مرۆڤی هەژارداو، ساخ بۆ رەزای خودای گەورە بەخێویان بکاو، خزمەتیان بکاو، مەسرەفیان بکێشێ، ئەوە بەقەد ئەو خەباتگێڕە کە لەڕێگەی خودادا خەبات دەگێڕێو غەزا دەکا، خێرو پاداشی بۆ هەیە).

گێڕەرەوە (راوی) کە عەبدوڵلای کوڕی موسلیمە دەفەرموێ: وادەزانم کە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (وە هەروەها بەقەد ئەو کەسەیش خێرو پاداشی باشی بۆ هەیە، کە بەشەو هەر شەونوێژ بکاو سەرگەرمی شەونوێژ بێو لێی سارد نەبێتەوەو، بەرۆژیش هەمیشە بەرۆژووبێو ساڵ دوانزە مانگە بەڕۆژووبێو یەك رۆژی لێ نەشکێنێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٤٧٠١. ج/٤}.

## (٣) باب فضل بِنَاء المَسَاجِد
## باسى خێرى دروستكردنى مزگەوت

١٨٧٩- عَنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: (عِنْدَ قَوْلِ النَّـاسِ فِيـهِ حِيـنَ بَنَى مَسْجِدَ الرَّسُولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّكُمْ أَكْثَرْتُمْ وَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ مَنْ بَنَى مَسْجِدًا يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللَّهِ بَنَـى اللَّـهُ لَـهُ مِثْلَـهُ فِـي الْجَنَّـةِ). (الحديث: ٤٥٠): [١٨٧٩]

پێشەوا عوثمـان (ڕەزاى خـواى لـێ بـێ) لـەكاتى جێنـشينى خۆيـدا ويـستى مزگەوتەكەى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) گـەورە بكـا، خەڵكەكـەيش پێيان ناخۆش بوو، بێزارى يان دەربڕى، ئيمامى عوثمان فەرمووى: ئەمە كردنتان بەچى ئەوەندە لەسەرى دەڕۆن، من خۆم لەم لايەنەوە لەمنێوە باشـترى لێ دەزانم، چـونكە بـەگوێ ى خـۆم لـەزارى پـيرۆزى پێغەمبـەرم ژنـەوت دەيفـەرموو: (هەركەسێ مزگەوتێ دروست بكا، ساخ لەبەر ڕەزاى خـودا، خـودايش لەقيامـەتا، لەپاداشى ئەوەدا، لەبەهەشتا تەلارێكى بۆ دروست دەكا، لەوێنەى ئەو مزگەوتە)

### ڕاڤەو شيكردنەوە:

واتە: مزگەوتـە دروسـتكراوەكە تاگـەورەترو باشـتربێ، تەلارەكـەيش باشـتر دەبێ لەبەهەشتا.

---

[١٨٧٩] تجريـد/١، ژمـارە: ٣٧٤ = ٤٥٠ بخـارى. مـسلم: ٧٣٩٥ شـيحا = تـرقيم الـشيخ خليـل مـأمون شيحا لصحيح مسلم (بخارى رقم الكتاب/٨ رقم الباب/٦٥).

## (٥) باب تحريم الرِّبا
## سووخۆری نادروسته

١٨٨٠- عَنْ جُنْدَبٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: مَنْ يُرَاءِ يُرَاءِ اللَّهُ بِهِ وَمَنْ سَمِّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ.(الحديث ): [١٨٨٠]

جونـدوب (رەزای خـوای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست -دروودی خـوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ( هەرکەسێ بـۆ ناوبـانگ‌و شـۆرەت چاکەوخودا پەرستی بکا، خودا لەجیهانا دەیکا بەپەندو، لەقیامەتیشا بێ پاداشتی دەکا، وەهەرکەسێ بۆ ڕواڵەت‌و ریابازیی هەرکارێ بکا، خودا لەڕۆژی قیامەتدا پـەردەی لـەروو هـەڵ دەماڵێ‌و ریابازییەکەی ئاشکرا دەکا). ( تـاج/١ ل/٧٣ ز/١٣ ژ/١ ش/ت هەڕەشـە کردن لەریا کاری وریابازی).

## (٦) بابُ حِفظ اللِّسَان
## پاراستـنی زمان له قسەی خراپ

١٨٨١- حديث أَبِي هُرَيْرَةَ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – يَقُـولُ « إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مَا يَتَبَيَّنُ فِيهَا ، يَزِلُّ بِهَا فِي النَّارِ أَبْعَدَ مِمَّا بَيْنَ الْمَشْرِقِ»[١٨٨١]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بیـستم لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەیفـەرموو: (ڕێ دەکـەوێ بەنـدە قـسەیێ دەکـا، خۆشی نازانێ قسەکەی کوێ دەگرێتەوە، بەهۆی ئەو قسەیەوە کە بـە باشـی لێـی ورد نەبۆتەوە، بەقەد نێوانی خۆرهەلات‌و خۆرئاوا دەخرێتە ناو دۆزەخەوە).

---

[١٨٨٠] تجرید/٥، ژمـارە: ٢٠٢٢ = ٦٤٩٩ بخـاری. مـسلم: ٧٤٠٢ شـیحا (بخـاری رقـم الکتـاب/٨١ رقـم الباب/٣٦).

[١٨٨١] تجریـد/٥، ژمـارە: ٢٠١٤ = ٦٤٧٨ بخـاری. مـسلم: ٧٤٠٦ شـیحا (بخـاری رقـم الکتـاب/٨١ رقـم الباب/٢٣).

ئەمــەیش گێڕانەوەیــەکی تــری ئــەم فەرموودەیــە لــە ژمــارە: (٢٠١٤)ی تەجریدی بوخاریدا.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لَهَا بَالًا يَرْفَعُهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَاتٍ وَإِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لَهَا بَالًا يَهْوِي بِهَا فِي جَهَنَّمَ. (الحديث ٦٤٧٨ طرفه في: ٦٤٧٧):

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ -دروودی خوای لەسەر بێ- وارێ دەکەوێ کەبەندەێی قەسەیێ دەکا، لەو جۆرە قسانەی کەدەبن بەمایەی ڕەزای خودا، ئەوەنــدەیش دڵــی ناداتــێ، بــەهۆی گــوتنی ئەوقسەیەوە، خودا ئەوبەنــدەێ چەندین پایە بــەرز دەکاتــەوە، وەهــەروەها ڕێ دەکەوێ کەبەندەێ قسەیێدەکا، لەوجۆرە قسانەی کەدەبن بەهۆی تووڕەیی و ڕەنجاندنی خودا، ناچێتە بنج و بنــاوانی و بەباشی لێی ورد نابێتەوە، تابزانێ قسەکەی کوێدەگرێتەوە، کەچی بــەهۆی ئەوقسەیەوە دەخزێتــە ناوئــاگری دۆزەخــەوە!. (تــاج/١٠ ز/٢ ل/٧ ژ/١-پاراستنی زمــان + ریــاض/٣ ز/٢٥٤ ل/١١٠٥ ژمارە/٦/١٥١٥).

### (٧) باب عقوبة مَنْ يأمر بالمعروف ولاَ يفعله، وَيَنْهَى عَنِ المنكر وَيَفعله سزاى سەختى ئەوانەى كە فەرمان دەكەن بە چاكەو خۆيان نايكەن، هەروا سزاى سەختى ئەوانەى نەهى دەكەن لە خراپەو خۆيان خراپە دەكەن

١٨٨٢- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قِيلَ لَهُ: أَلاَ تَدْخُلُ عَلَى عُثْمَانَ فَتُكَلِّمَهُ؟ فَقَالَ: أَتُرَوْنَ أَنِّى لاَ أُكَلِّمُهُ إِلاَّ أُسْمِعُكُمْ؟ وَاللَّهِ لَقَدْ كَلَّمْتُهُ فِيمَا بَيْنِى وَبَيْنَهُ مَا دُونَ أَنْ أَفْتَتِحَ أَمْرًا لاَ أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ فَتَحَهُ وَلاَ أَقُولُ لأَحَدٍ يَكُونُ عَلَىَّ أَمِيرًا، إِنَّهُ خَيْرُ النَّاسِ، بَعْدَ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُلْقَى فِى النَّارِ، فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُ بَطْنِهِ فَيَدُورُ بِهَا كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِالرَّحَى، فَيَجْتَمِعُ إِلَيْهِ أَهْلُ النَّارِ، فَيَقُولُونَ: يَا فُلاَنُ مَا لَكَ؟ أَلَمْ تَكُنْ تَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ؟ فَيَقُولُ: بَلَى، كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَلاَ آتِيهِ، وَأَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ». {الحديث: ٧٤٠٨ = تجريد/٣، لاپەڕە: ٤٤٨، رقم: ١٣٢٠ = ٣٢٦٧، ٧٠٩٨. تحفة الأشراف: ٩١} :[١٨٨٢]

بە ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثە (ڕەزای خودایان لێ بێ) یان گوت: ئەوە بۆ ناچیت بۆلای عوسمانو قسەی لەگەڵدا بکەیت، سابەڵکوو خودا ئاوێ بکا بەم ئاگرەدا، فەرمووی: بۆچی لەئێوە وایە کەدەبێ هەر لەبەرچاوی ئێوە ئەم باسەی لەگەڵدا بکەم، بەخودا لەم بارەیەوە دوو بەدوو گەلێ قسەم لەگەڵیدا کردووە، بەڵام خۆم نادەم لەو ئاقارە کەمن یەکەم کەس بم ئاڵای ناڕەزایی هەڵکەمو ببم بەمایەی ئاژاوە بەرپاکردن!

---

[١٨٨٢] تجريد = تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى - الترجمە الكرديە - المجلد الثالث/٣، ژمارە: ١٣٢٠ = ٣٢٦٧ بخارى. پوختەی موسلیم - مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٣٨ = ٧٤٠٨ شيحا - ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم (بخارى رقم الكتاب/٥٩ رقم الباب/١٠).

لەهەمان كاتدا من بەهيچ فەرمانڕەوايەكی خۆشم نالێم: كە باشترين كەسە، لەسەر ئەم فەرمايشتەدا كە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆيم بيستووە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەيفەرموو: (لەڕۆژی دوارۆژدا، بازێ پياو دێنن‌و تووڕی دەدەنە ناو ئاگرەوە، كابرا وەك گێرە بەدەوری خۆيدا دەخولێتەوەو ريخۆڵەكانی خۆی گێرە دەكا، دۆزەخيەكان لەدەوری كۆمەڵە دەكەن‌و پێی دەڵێن: ئای! فلانە كەس! ئەمە خۆتی؟! ئەوە تۆ بۆ؟! تۆ چييتە؟ تۆ چی دەكەی لێرە؟ خۆ تۆ لای خۆی ئامۆژگاری باشی ئێمەت دەكرد! ئەمەت لەچی‌و ئەوەت لەچی؟ ئەويش دەڵێ: بەڵێ وابووم بەڵام داخەكەم بۆ خۆم وانەبووم، بە پێچەوانەوە بە ئێوەم دەگوت چاكە بكەن‌و خۆم نەيم دەكرد، بە ئێوەم دەگوت خراپە مەكەن، كەچی بۆ خۆم خراپەم دەكرد، ئەمەی دەيبينن سزای ئەو كەسانەيە، كە ئەمە رەفتارو كرداريان بووە!). {تاج/٥، زنجيرە: ٢٠، ژمارە: ٥٢٣١ + رياض/١، زنجيرە: ٢٤، ژمارە: ١٩٨، لاپەڕە: ١٨١}.

## (٨) باب النَّهْيِ عَنْ هَتْكِ الإنسانِ سِتْرَ نَفْسِه
## پێشگيريی لە هەڵماڵينی پەردەی خودا لەسەر بەندە خۆی

١٨٨٣- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: كُلُّ أُمَّتِي مُعَافًى إِلَّا الْمُجَاهِرِينَ وَإِنَّ مِنَ الْمُجَاهَرَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلًا ثُمَّ يُصْبِحُ وَقَدْ سَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ فَيَقُولُ يَا فُلَانُ عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا وَقَدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللَّهِ عَنْهُ.(الحديث ٦٠٦٩): [١٨٨٣]

---

[١٨٨٣] تجريد/٥، ژمارە: ١٩٤٤ - ٦٠٦٩ بخاری. مسلم: ٧٤١٠ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٦٠).

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: ژنـەوتم لـە پێغەمـەر - دروودی خـوای لەسـەر بـێ- دەیفـەرموو: ئۆمـەتی مـن هـەموویان بەرعـەفوو لێبوردنی خوا دەکەون، مەگەر ئەوانـەیان کە سڕی خۆیـان هـەڵ دەماڵن، وەك ئەوە کابرایەك لەشـەودا کارێکی ناشـیرین دەکـا، وە خـودا بـۆی دەپۆشـێ، کەچـی کابرا بۆ بەیانی دەچێ تاوانی خۆی ئاشکرا دەکاو، دەیگێڕێتەوە بۆ ئـەم و ئـەو و دەڵێ: ئەی فیسار! من دوێ شەو، ئیشێکی وا وام کرد! لەگەڵ فلان‌و ئـەو فلانـا، ئارەقمان خواردەوە، یا قومارمان کرد مەسەلا!!

تەماشـاکەن ئـەو کابرایـە خـودا بەشـەو پـەردەی بۆدەکـاو بـە پـەردەی رەحمـەتی خـۆی گونـاهو نـەنگی دەپۆشـێ، کەچـی ئـەو ئەوەنـدە بـێ بـاك‌و بـێ ئاگایـە، دەچـێ بـەرۆژ پـەردەی خـودا لەسـەر نـەنگ و شـوورەیی خـۆی هـەڵ دەداتەوە!. (ریاض/١ ل/٢١٥ ز/٢٨ ژ/٢٤١/٢/ -ش-متفق علیە).

## ڕوونکردنەوە:

کردنـی گونـاەو تـاوان بەئاشـکرا، خـۆی تـاوانێکی دووهەمـە، وە تۆڵـەی گوناهەکـە قورسـتر دەکـا. هەنـدێ شـت هەیـە لـەزاتی خۆیـدا دروسـتە، کردنـی حەڵاڵە، بـەڵام گێڕانـەوە و گوتنی ئـەوکارە حەڵاڵـە نهێنـی‌یـە لـەلای ئـەم‌و ئـەو، بەبێ مەهانەی ڕەوا، حەرامەو تاوانەو، دەبێ بـەهۆی سـزای سـەختی لای خـودا. (بڕ: تـاج/٣ ز/٤٣ ل/١٠٢ ژ/١٣) ئـەوەیش وەك کەسـێ لەگـەڵ هاوسـەرو حـەڵاڵی خۆی دا دروست ببێ‌و قسەی ژن‌و مێردی خۆیان بکەن، کەچی بـچێ ئـەم بـاس‌و خواسە بۆئەم و ئەو بگێڕێتەوە.

## (٩) باب تَشْمِيت العَاطِسِ وَكَرَاهَةِ التَثَاوُبِ
## نزای باش بۆ پژمیو سوننەتە، باوێشکدان نا پەسەندە

١٨٨٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: عَطَسَ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَشَمَّتَ أَحَدَهُمَا وَلَمْ يُشَمِّتِ الْآخَرَ فَقِيلَ لَهُ، فَقال: هَذَا حَمِدَ اللَّهَ وَ هَذَا لَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ. (الحديث ٦٢٢١ طرفه في: ٦٢٢٥)[١٨٨٤]:

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەت پێغەمەردا -دروودی خوای لەسەر بێ- دوو پیاو پژمین، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نزای خێری بۆ یەکێکیان کردو، نزای بۆ ئەوی تریان نەکرد، واباوە کەیەکێ دەپژمێ پێی دەگوترێ: یرحمك الله: رەحمەتی خودات لێ بێ. ئەوەیان کە پێغەمەر نزای بۆی نەکرد، گوتی بە پێغەمەر: بۆچی کە ئەو پژمی نزات بۆیکرد، کەچی بۆمن، کەپژمیم نزات بۆم نەکرد؟ فەرمووی: چونکە ئەو لەپاش پژمینەکەی سوپاسی خودای کردو حەمدوسەنای خوای کرد، بەڵام تۆ سوپاس و حەمدو سەنات نەکرد. (ریاض/٢ ل/٣٣١ ز/١٤٢ ژ/٨٨١/٤).

له ژمارە: (١٩١٤)ی پوختەی موسلیم (مختصر صحیح مسلم)دا ئاوایە:

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: عَطَسَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلَانِ، فَشَمَّتَ أَحَدَهُمَا، وَلَمْ يُشَمِّتِ الآخَرَ، فَقَالَ الَّذِى لَمْ يُشَمِّتْهُ: عَطَسَ فُلاَنٌ فَشَمَّتَّهُ، وَعَطَسْتُ أَنَا فَلَمْ تُشَمِّتْنِى، قَالَ: «إِنَّ هَذَا حَمِدَ اللَّهَ، وَإِنَّكَ لَمْ تَحْمَدِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ». {الحديث: ٧٤١١ = ٧٤٤٦ فم. تجريد البخارى = الترجمة الكردية/٥، رقم: ١٩٦٢ = ٦٢٢١، ٦٢٢٥ فتح البارى. أبو داود. أدب: ٥٠٣٩. ترمذى. أدب: ٢٧٤٢. تحفة: ٨٧٢} :

---

[١٨٨٤] تجرید/٥ن ژمارە: ١٩٦٢ = ٦٢٢١ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩١٤ = ٧٤١١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/١٢٣).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو پیاو پژمین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای خێری بۆ یەکێکیان کردو نزای خێری بۆ ئەوی تریان نەکرد، جا ئەومیان کە نزای بۆ نەکرد، گوتی: بۆ کە ئەو پژمی نزات بۆیکرد، کەچی کەمن پژمیم نزات بۆم نەکرد؟

فەرمووی: (چونکە ئەو لەپاش پژمینەکەی سوپاسی خودای کرد، بەڵام تۆ کە پژمیت سوپاسی خودات نەکرد). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٤٢، ژمارە: ٨٨١ — سوننەتە ئەگەر پژمیو ستایشی...} + {تاج/٥، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٣٧٧ — پژمینو نزای باش بۆ پژمیو}.

**ڕوونکردنەوە:**

واباوە کە یەکێ دەپژمێ پێی دەگوترێ: (يَرْحَمُكَ اللّٰه: ڕەحمەتی خودات لێ بێ) بەم نزایە لەزاراوی یاسا نامە (شەرع)دا دەگوترێ: (تشمیت).

١٨٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (التَّثَاؤُبُ مِنْ الشَّيْطَانِ فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَالَ هَا ضَحِكَ الشَّيْطَانُ) (الحديث ٣٢٨٩، طرفاهُ في: ٦٢٢٣، ٦٢٢٦):[١٨٨٥]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (باوێشك لەشەیتانەوەیە، جا ئەگەر یەکێکتان باوێشکی هات، با هەتا دەتوانێ بەری بگرێو بیداتە دواوە، چونکە کاتێ ئێوە باوێشك دەدەنو لەکاتی باوێشکدانەکەدا دەم دادەچەقێننو دەڵێن: هاها، شەیتان

---

[١٨٨٥] تجرید/٢، ژمارە: ١٣٢٦ = ٣٢٨٩ بخاری. مسلم: ٧٤١٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٩ رقم الباب/١١).

لەخۆشــييانا بــەوە پێدەكــەنێ!) (ريــاض/٢ل- ٣٢٩ف- ٨٧٨ ز- ١٤٢ — باســـی: دەستوورەكانی نزای پژمینو باوێشك).

## (١١) باب في الفَأرِ وَأنَّهُ مُسِخَ
## باسی مشكو كەسانێ كە خودا كردوونی بە مشك

١٨٨٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ): «فُقِدَتْ أُمَّةٌ مِـنْ بَنِـى إِسْـرَائِيلَ لاَ يُـدْرَى مَـا فَعَلَـتْ، وَلاَ أُرَاهَـا إِلاَّ الْفَـأْرَ، أَلاَ تَرَوْنَهَا إِذَا وُضِعَ لَهَا أَلْبَانُ الإِبِلِ لَمْ تَشْرَبْهُ، وَإِذَا وُضِعَ لَهَا أَلْبَانُ الـشَّاءِ شَرِبَتْهُ؟»، قَـالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَحَدَّثْتُ هَذَا الْحَدِيثَ كَعْبًا، فَقَالَ: آنْتَ سَمِعْتَهُ مِـنْ رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ ذَلِكَ مِرَارًا؟ قُلْـتُ أَأَقْـرَأُ التَّـوْرَاةَ؟! وَفِـى رِوَايَـةٍ: أفأنزلـت عليَّ التَـوراة؟ {الحـديث: ٧٤٢١ = ٧٤٥٧ فـم. تجريـد البخـارى/٣، رقـم: ١٣٣٣ = ٣٣٠٥}:[١٨٨٦]

ئـەبو هـورەيرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەســەر بـێ) فـەرمووی: (بـەرەیێ لەنــەوەی ئیـسرائیل، واتــە: لەملـەتی جوولەكــە، بزربــوونو بــێ ســەرو شــوێن رۆیــشتوون، كــەس نازانــێ چــییان بەسـەرهاتووە، وەمـن وادەزانم كـە خـودا كردوونـی بـە مـشك، وە ئـەم مـشكانەی ئێستا هەن لەو بەرە بابەن، چونكە مشكیش وەك جوولەكە ئەگەر شیری وشـتری بۆ دابنرێ نایخواتەوە، بەڵام ئەگەر شیری مەڕی بۆدابنرێ دەیخواتەوە).

جا كاتێ ئەم فەرموودەیەم بۆ كەعبولئـەحبار گێڕایـەوە، گـوتی: تـۆ خـۆت ئەم فەرموودەیەت بیست لەدەمی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بـێ)؟

---

[١٨٨٦] تجريد البخارى/٣، ژمارە: ١٣٣٣ = ٣٣٠٥ بخارى. پوختـەی موسـليم/٤، ژمـارە: ١٥٠٤ = ٧٤٢١ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٥٩ رقم الباب/١٥).

کە پێغەمبەر وابفەرموێ؟ گوتم: بەڵێ، چەند جارێ ئەمەی لێم دووبارە کردەوە، منیش لەوە بێزار بووم‌و پێم گوت: خۆ من تەوراتت بۆ ناخوێنمەوە؟ هەتا تۆ مەودای رەخنەگرتنت هەبێ. لە گێڕانەوەیەکدا گوتم: لەتۆ وایە تەوراتم بۆهاتووە؟

**روونکردنەوە:**

لەکۆتایی ئەم فەرموودەیەدا، لە کوردییەکەی تاجول ئوصولدا دەفەرموێ: بەڵام وەکوو لەعەینی (عومدەتولقاریٔ)دا دەفەرموێ: (لەپاش ئەم فەرمایشتە روونکرایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەشتی مەسخ کراو، واتە: ئەو مرۆڤانەی کە کراون بە بەرازو مەیموون‌و ئاژەڵ‌و دەعبا، زاوزێ ناکەن‌و وەچەیان لێ ناکەوێتەوە). کەواتە: ئەم مشکانەی ئێستا هەن لەوەچەی ئەو بەرە بابە نین!

## (١٢) باب لا يُلدَغُ المُؤمِنُ مِنْ جُحْرٍ مَرَّتَيْنِ

## موسوڵمان دەبێ زرنگ‌و وریا بێ، لە یەك کونەوە دووجار شت پێوەی نەدات

١٨٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ». (م-٨/ ٢٧٧ - ). {الحديث/ ٧٤٢٣. إيمان. بخاري: ٦١٣٣. ابو داود: أَدَبَ: ٤٨٦٢. ابن ماجة: فتن: ٣٩٨٢. تحفة الأَشْرَافِ: ١٣٢٠٥}. [١٨٨٧]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (موسوڵمان دەبێ زرنگ‌و هۆشیارو وریاو

---

[١٨٨٧] تجريد البخاری/٥، ژمارە: ١٩٥٣ - ٦١٣٣ بخاری. پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ٤٤ - ٧٤٢٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٨٣).

دووربین بێ، ئەگەر دنیا بوو، کەسێ خەڵەتانی، نابێ جارێ تر باوەڕی پێ بکاو دووبارە بیخەڵەتێنێتەوە! چونکە مرۆڤی ژیر دووجار لەسەر یەک، لەیەك کونەوە شت پێوەی نادات!). واتە: (یەك دەنك جیاوازیی لەنێوانی گێڕانەوەی بوخاریو موسلیمدا نییە). (ریاض/٤، لاپەڕە: ١٢٢٨، ژمارە: ١٨٢٤/٢٧، زنجیرە: ٢٧) + (تەجرید/٥/٢٢٢، ژمارە: ١٩٥٣).

لە ژمارە: (١٩٥٣)ی مختصر صحیح البخاری، کە ناسراوە بە تەجریدی بوخاری ئاوایە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ. (الحديث ٦١٣٣):

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: موسوڵمان دەبێ زرنگو هۆشیارو وریاو دووربینبێ، ئەگەر دنیابوو، کەسێ خەڵەتانی، نابێ جارێ تر باوەڕی پێبکاو دووبارە بیخەڵەتێنێتەوە! چونکە مرۆڤی ژیر دووجار لەسەریەك لەیەك کونەوە شت پێوەی نادات!. (ریاض/٤ ل/١٣٢٨ ژ/١٨٣٤/٢٧ ز/٣٧).

**ڕوونکردنەوە:**

جێگەی داخە گەلی کورد لەم لایەنەوە خۆش باوەڕە، ڕۆژ نییە دەرو دراوسێکانی وەك مارەکەی شێخ هۆمەر پێوەی نەدەن، کەچی ئەو وەك نەبای دیبێ و نەبۆران، جار لەگەڵ جارا باشتر دەستی دەکاتەوە بەکونی هەژدیهاکەدا.

## (١٤) باب النَّهي عَنِ المَدْحِ إذا كَانَ فِيهِ إفراط وَخِيفَ مِنهُ فِتْنَةُ الممدوحِ
## پێشگیری له وەسپو مەدح، ئەگەر پێی لێ هەڵبرێو مەترسی لێ بکرێ که مەدحکراوەکه پێی بایی ببێو کەیفی پێی بێ

١٨٨٨- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رضيَ اللهُ عنهُ قَالَ أَثْنَى رَجُلٌ عَلَى رَجُلٍ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ وَيْلَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ مِرَارًا ثُمَّ قَالَ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَادِحًا أَخَاهُ لا مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ أَحْسِبُ فُلانًا وَاللَّهُ حَسِيبُهُ وَلا أُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا أَحْسِبُهُ كَذَا وَكَذَا إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهُ) (الحديث ٢٦٦٢، طرفاهُ في: ٦٠٦١، ٦١٦٢): [١٨٨٨]

ئەبوبەکرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەلای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) باسی پیاوێ کرا، پیاوێکی تریش وەسپی چاکیو باشیی ئەوی کرد، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (هاوار بۆ تۆ ئەستۆی هاوڕێکەتت شکاند!) وەچەند جارێ لەسەریەك ئەو ڕستەیەی دووبارە کردەوە.

ئەوجار فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان هەر چاری نەبوو کەویستی وەسپی کەسێ بکا، با جەزمی پیادا نەنێو بیخاتە خانەی بۆچوونەوە بلێ: وادەزانم ئەو پیاوە وەها وەها باشە، ئەمەیش بەمەرجی ئەوە ئەو کابرایە ڕێی تێ بچێ کەوەك ئەو دەڵێ وابێ، نەوەك مەتحەکەی درۆی رووت بێ، ئیتر خودا بۆ خۆی ئاگای لەدڵیەتیو بەپێی نیازی دڵی پاداشی دەداتەوە، بەڵام بەهیچ جۆر نابێ بڕیار بداو بلێ فیسارە کەس لەلای خودا پاکە، چونکە شتیوا بەس خودا بۆ خۆی دەیزانێ). ( تاج/٩/٥٨-٢ز-١٩-ش/د-باسی زمانلووسیو دەمتەڕیو...).

له ژمارە: (١٥١٠)ی پوختەی موسلیم (مختصر صحیح مسلم)دا ئاوایە:

---

[١٨٨٨] تجرید/٢، ژمارە: ١١٢٢ = ٢٦٦٢ بخاری. پوختەی موسلیم = مختصر صحیح مسلم/٤، ژمارە: ١٥١٠ = ٧٤٢٧ شیحا = ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم (بخاری رقم الکتاب/٥٢ رقم الباب/١٦).

عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنَّهُ ذُكِرَ عِنْدَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَا مِنْ رَجُلٍ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفْضَلُ مِنْهُ فِي كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَيْحَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ»، مِرَارًا يَقُولُ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحًا أَخَاهُ لاَ مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ: أَحْسِبُ فُلاَنًا - إِنْ كَانَ يُرَى أَنَّهُ كَذَلِكَ - وَلاَ أُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا». {الحديث: ٧٤٢٧ = ٧٤٦٢ فتح المُلْهِم. تجريد/٣، رقم: ١١٢٢ = ٢٦٦٢، ٦٠٦١، ٦١٦٢. أبو داود. أدب: ٤٨٠٥. ابن ماجة. أدب: ٣٧٤٤. تحفة الأشراف: ١١٦٧٨}:

ئەبو بەكرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی پیاوێ كرا، پیاوێكی تریش وەسپی چاكیو باشیی ئەوی كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هاوار بۆ تۆ ئەستۆی هاوڕێكەتت شكاند!). وە چەندجار لەسەر یەك ئەم وشەیەی دووبارە كردەوە، ئەوجا فەرمووی:

(ئەگەر كەسێكتان هەر چاری نەبوو، كە ویستی وەسپی كەسێ بكا، با جەزمی پیادا نەنێو بیخاتە خانەی بۆچوونەوەو بڵێ: من وادەزانم كە واوایە، ئەمەیش بەمەرجی ئەوە كە ئەو كابرایە، بەزەینی خۆی وابێ كە وەك خۆی دەڵێ، وەبڵێ: بەڵام شایەتی ئەوەی بۆنادەم كە لەلای خودایش وەك من دەیڵێم وا پاكو باشە، چونكە شتی واو بڕیاری وا بەس خودا بۆ خۆی دەیزانێ!).

١٨٨٩- حديث أَبِي مُوسَى - رضى الله عنه - قَالَ سَمِعَ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - رَجُلاً يُثْنِي عَلَى رَجُلٍ ، وَيُطْرِيهِ فِي مَدْحِهِ فَقَالَ «أَهْلَكْتُمْ - أَوْ قَطَعْتُمْ - ظَهْرَ الرَّجُلِ»[١٨٨٩]

---

[١٨٨٩] بڕوانە ژمارە: (١٨٨٧ و ١٨٨٨) (بخاری رقم الكتاب/٥٢ رقم الباب/١٧).

واتاو مەبەست لە ژمارەکانی پێشەوە لەم باسەدا ڕۆیشت.

## (١٥) باب مُنَاوَلَةُ الأكبر
## شت لە پێشدا دەدرێتە دەست کەسی بە تەمەنتر

١٨٩٠- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَرَانِي أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ فَجَاءَنِي رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ الْآخَرِ فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الْأَصْغَرَ مِنْهُمَا فَقِيلَ لِي كَبِّرْ فَدَفَعْتُهُ إِلَى الْأَكْبَرِ مِنْهُمَا. (الحديث ٢٤٦)؛ [١٨٩٠]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سەروەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەخەوما دیتم کەوا بەدارسیواکێ سیواك دەکەم، دوو پیاو هاتن بۆلام، یەکێکیان لەویتریان گەورەتر بوو، منیش ویستم دارسیواکەکە بدەم بەبچکۆلەکەیان کەچی پێم گوترا: گەورەکەیان وەپێشخە، منیش دام بەگەورەکەیان). (ت/٦/١٨/٨ تاج-٤ ز-٥ ژ-٤٢٥٩).

### شیکردنەوە:

یەکێ لەپیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە عەفانی کوڕی موسلیمە، لەسەردەمی مەینەتەکەدا، کەبەفیتی موعتەزیلەکان گەڕیان دەکرد بەزانا گەورەکان، لەبارەی قورئانەوە کەدروست کراوە یا دێرین و قەدیمە لەویش پرسیارکرا، رازی نەبوو کەبڵێ: (قورئان مەخلووقەو دروستکراوی خودایە). یەکێ بوو لەحوککامی جەرح و تەعدیل، دەهەزار لیرەی زێڕیان پێ دا، لەباتی ی ئەوەکە لەبارەی پیاوێکەوە راماوی و بێ ئاگایی لەحاڵی دەربڕی، واتە: نەبڵێ

---

[١٨٩٠] تجرید/١، ژمارە: ١٧٧ - ٢٤٦ بخاری. پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ١٨٣ = ٧٤٣٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤ رقم الباب/٧٤).

عادڵە، نەبڵێ ناعادڵە، بەڵام قایل نەبوو، فەرمووی: (قەت قەت حەق ناکەم بەناحەق)، یەکێ تر لەپیاوانی ئەم رشتەیە نوعەیمی کوڕی حمادە، پیاوێکی فەرائیز زان بوو، لەسەردەمی مەینەتەکەدا، لەبارەی خەلقی قورئانەوە، ئەویشیان پێچا، لەسەرئەوە لەسامەڕا بەند کرا هەتا لەساڵی (٢٢٠) ی کۆچیدا لەزیندانا مرد! رەزای خودای لێ بێ.

له ژماره: (١٨٣)ی پوختەی موسلیم (مختصر صحیح مسلم)دا ئاوایه:

عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «أَرَانِي فِي الْمَنَامِ أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ، فَجَذَبَنِي رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الآخَرِ، فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الأَصْغَرَ مِنْهُمَا فَقِيلَ لِي: كَبِّرْ، فَدَفَعْتُهُ إِلَى الأَكْبَرِ». {الحديث/ ٧٤٣٣، ٥٨٩٢. تجريد البخاري/١/١٩٤، رقم: ١٧٧ = ٢٤٦ فتح الباري} :

ئیبنو عومەر (ڕەزاو رەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: سەروەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەخەوما دیتم کەوا بەدار سیواکێ سیواك دەکەم، دوو پیاو هاتن بۆلام، یەکێکیان لەویتریان، بە تەمەن (گەورە) تر بوو، هەریەکەیان بۆلای خۆی رامی دەکێشا، منیش ویستم دار سیواکەکە بدەم بە بچکۆلەکەیان، کەچی پێم گوترا: گەورەکەیان وەپێشخە، منیش وامکردو سیواکەکەم دا بە گەورەکەیان). {تاج/١٨/٨، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٤٢٥٩ ج-٤} .

**روونکردنەوە:**

بەپێی ئەدەبی ئایینی، هەرچی لە بابەتی رێزو پیرۆزی بێ، دەبێ گەورە لە بچووك پێش بخرێ، لای راست پێش لای چەپ بخرێ، وەك سڵاوو رۆژباشیو تەوقە کردنو خواردنەوەو بۆنی خۆشو سواریو چوونە ناو مزگەوتو شتی تری لەم بابەتانە، وەك چوونە ژوورەوەو دەرچوونو کاتی رۆیشتن.

## (١٦) باب التثبت في الحديث وحكم كتابة العلم
## چوونە بنج و بنەوانی قسەو باسوخواس و بڕیاری نووسینی زانین

١٨٩١- عَنْ عروة بن الزبير قَالَ: كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُ وَيَقُولُ: اسْمَعِي يَا رَبَّةَ الْحُجْرَةِ، اسْمَعِي يَا رَبَّةَ الْحُجْرَةِ، وَعَائِشَةُ (رضوان الله عليها) تُصَلِّي، فَلَمَّا قَضَتْ صَلاَتَهَا قَالَتْ لِعُرْوَةَ: أَلاَ تَسْمَعُ إِلَى هَذَا وَمَقَالَتِهِ آنِفًا؟ إِنَّمَا كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحَدِّثُ حَدِيثًا لَوْ عَدَّهُ الْعَادُّ لأَحْصَاهُ. {الحديث: ٧٤٣٤ = ٧٤٦٩ فم}:[١٨٩١]

عورووەی کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموودەی پێغەمبەری بۆ مەردومەکە دەگێڕایەوە، عائیشە لەوکاتەدا نوێژی دەکرد، لەناو هۆدەکەی خۆیدا، ئەبو هورەیرە ئاگای لەوە نەبوو کە لەوکاتەدا عائیشە نوێژ دەکا، بۆ پشتیوانی گێڕانەوەکەی خۆی، بەدەنگی بەرز، دەیفەرموو: ئەی عائیشە! ئەی خاوەنی ئەم هۆدەیەی تەنیشتمان تۆش گوێت لێ بێ، ئەگەر هەڵەیەکم کرد بۆمی ڕاست بکەرەوە، جا کاتێ عائیشەی پوورم نوێژەکەی تەواوکرد، بەمنی وت، کە عورووەی خوشکەزای عائیشەم: سەیری ئەم کابرا ناکەی کردوویەتی بەچی گاڵە گاڵێ لەم کاتەدا؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وا لەسەر خۆو بەشێنەیی و بەروونی فەرمایشتی دەفەرموو، ئەگەر کەسێ قسەکانی ئەوی بژماردایە وشە بەوشە دەیژمارد، نەك وەك ئەم یەك لەدوایەك هەڵیڕێژێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٣١٠٢ ج/٤ - چاپی چوارەم}.

---

[١٨٩١] بخاری: پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٨٣ - ٧٤٣٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٣).

## (١٩) باب حديث الهجرة
## باسى داستانى كۆچكردن

١٨٩٢- عَنْ أَبِى إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) يَقُولُ: جَاءَ أَبو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ إِلَى أَبِى فِى مَنْزِلِه، فَاشْتَرَى مِنْهُ رَحْلاً، فَقَالَ لِعَازِبٍ: ابْعَثْ مَعِىَ ابْنَكَ يَحْمِلْهُ مَعِى إِلَى مَنْزِلِى، فَقَالَ لِى أَبِى: احْمِلْهُ، فَحَمَلْتُهُ وَخَرَجَ أَبِى مَعَهُ يَنْتَقِدُ ثَمَنَهُ، فَقَالَ لَهُ أَبِى: يَا أَبَا بَكْرٍ حَدِّثْنِى كَيْفَ صَنَعْتُمَا لَيْلَةَ سَرَيْتَ مَعَ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟ قَالَ: نَعَمْ، أَسْرَيْنَا لَيْلَتَنَا كُلَّهَا حَتَّى قَامَ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ، وَخَلاَ الطَّرِيقُ، فَلاَ يَمُرُّ فِيهِ أَحَدٌ حَتَّى رُفِعَتْ لَنَا صَخْرَةٌ طَوِيلَةٌ لَهَا ظِلٌّ لَمْ تَأْتِ عَلَيْهِ الشَّمْسُ بَعْدُ، فَنَزَلْنَا عِنْدَهَا، فَأَتَيْتُ الصَّخْرَةَ فَسَوَّيْتُ بِيَدِى مَكَانًا يَنَامُ فِيهِ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى ظِلِّهَا، ثُمَّ بَسَطْتُ عَلَيْهِ فَرْوَةً، ثُمَّ قُلْتُ: نَمْ يَا رَسُولَ اللّهِ، وَأَنَا أَنْفُضُ لَكَ مَا حَوْلَكَ، فَنَامَ، وَخَرَجْتُ أَنْفُضُ مَا حَوْلَهُ، فَإِذَا أَنَا بِرَاعِى غَنَمٍ مُقْبِلٍ بِغَنَمِهِ إِلَى الصَّخْرَةِ، يُرِيدُ مِنْهَا الَّذِى أَرَدْنَا، فَلَقِيتُهُ، فَقُلْتُ: لِمَنْ أَنْتَ يَا غُلاَمُ؟ فَقَالَ: لِرَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، قُلْتُ: أَفِى غَنَمِكَ لَبَنٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: أَفَتَحْلُبُ لِى؟ قَالَ: نَعَمْ، فَأَخَذَ شَاةً، فَقُلْتُ لَهُ: انْفُضِ الضَّرْعَ مِنَ الشَّعَرِ وَالتُّرَابِ وَالْقَذَى، قَالَ: فَرَأَيْتُ الْبَرَاءَ يَضْرِبُ بِيَدِهِ عَلَى الأُخْرَى يَنْفُضُ، فَحَلَبَ لِى فِى قَعْبٍ مَعَهُ كُثْبَةً مِنْ لَبَنٍ، قَالَ: وَمَعِى إِدَاوَةٌ أَرْتَوِى فِيهَا لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِيَشْرَبَ مِنْهَا وَيَتَوَضَّأَ، قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَهُ مِنْ نَوْمِهِ، فَوَافَقْتُهُ اسْتَيْقَظَ، فَصَبَبْتُ عَلَى اللَّبَنِ مِنَ الْمَاءِ حَتَّى بَرَدَ أَسْفَلُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّهِ اشْرَبْ مِنْ هَذَا اللَّبَنِ، قَالَ: فَشَرِبَ حَتَّى رَضِيتُ ثُمَّ قَالَ: « أَلَمْ يَأْنِ لِلرَّحِيلِ »؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فَارْتَحَلْنَا بَعْدَ مَا زَالَتِ الشَّمْسُ، وَاتَّبَعَنَا سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكٍ، قَالَ: وَنَحْنُ فِى جَلَدٍ مِنَ الأَرْضِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّهِ أُتِينَا، فَقَالَ: « لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا ». فَدَعَا عَلَيْهِ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَارْتَطَمَتْ فَرَسُهُ إِلَى بَطْنِهَا أُرَى، فَقَالَ: إِنِّى قَدْ عَلِمْتُ أَنَّكُمَا قَدْ دَعَوْتُمَا عَلَيَّ،

فَادْعُوَا لِی، فَاللّٰهُ لَكُمَا أَنْ أَرُدَّ عَنْكُمَا الطَّلَبَ، فَدَعَا اللّٰهَ، فَنَجَا، فَرَجَعَ لاَ يَلْقَى أَحَدًا إِلاَّ قَالَ: قَدْ كَفَيْتُكُمْ مَا هَا هُنَا، فَلاَ يَلْقَى أَحَدًا إِلاَّ رَدَّهُ، قَالَ: وَوَفَى لَنَا. {الحديث: ٧٤٣٨ = ٧٤٧٣ فم. بخاری. مناقب: ٣٦١٥، ٣٦٥٢، ٣٩٠٨، ٣٩١٧}:[١٨٩٢]

ئەبو ئیسحاق فەرمووی: بیستم لە بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: ئەبوبەکری صەدیق هات بۆلای باوکم بۆماڵەوەی کۆپانە وشترێکی لێ کڕی بە سیازدە درەم، بە عازیبی باوکمی فەرموو: ئەم کوڕەتم لەگەڵ بنێرە، کە هەتا ماڵەوەم ئەم کۆپانەم بۆ هەڵگرێ، باوکیشم فەرمووی بەمن: ئادەی بۆی هەڵگرە، منیش هەڵم گرتو لەگەڵیدا ڕۆیشتین بەرەو ماڵی ئەبوبەکر، باوکیشم لەگەڵی هات هەتا بەهای کورتانەکەی لێ وەربگرێ، باوکم عەرزی کرد: ئەی ئەبوبەکر! باسی ئەو شەوەم بۆ بکە کە لەشەوی کۆچا، لەگەڵ پێغەمبەردا شەو ڕەویتان کرد؟ فەرمووی: بەڵێ باشە، ئەو شەوە سەراسەر هەمووی بەڕێوە بووین، هەتا سبەینێ نیوەڕۆ، ڕێگەکە چۆڵ بوو، کەسی پیادا نەدەڕۆیشت، لەدوورەوە تاوێرێکی گەورەی درێژمان لێوە دەرکەوت، سێبەرێکی باشی هەبوو، هێشتا هەتاوی تاقی بەیانی لێی نەدابوو، لەلای ئەو تاوێرە لاماندا، چووم لەژێر تاشە بەردەکەدا، لە سێبەرەکەیدا، بەدەستم نووستنگایەکم تەخت کرد بۆ خەوتنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەڵپۆسێك (فەروەیەك)م تیا ڕاخست، ئەوجا عەرزی حەزرەتم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرموو تۆ لێرەدا بخەوە، من چاودێری ئەم دەوروبەرەت بۆ دەکەم، نەبادا ناحەزی لێ بێ، ئەویش نووست، منیش دەرچووم چاودێری دەوروبەرەکەم دەکرد، تووشی شوانی ڕانە مەڕێك بووم، ڕانەکەی دەهێنا بۆ بن تاوێرەکە،

---

[١٨٩٢] بخاری. مناقب: ٣٦١٥. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٥٥ - ٧٤٣٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٥).

ئەویش وەك ئێمە منەی سێبەری دەکرد، چووم بۆلای پێیم گوت: کورە! تۆ شوانی کێیت؟ گوتی: شوانی پیاوێکی خەڵکی مەدینەم، پێم گوت: ئەرێ لەڕانەکەتا مەڕی شیردەری واتیادا؟ گوتی: بەڵێ. گوتم: دەتوانی بڕێ شیرم بۆ بدۆشی؟ گوتی: بەڵێ باشە، جا مەڕێکی گرت کە بیدۆشێ، منیش پێیم گوت: گوانەکانی بتەکێنە، باشیرەکە موو وخۆڵو پیسی تێ نەکەوێ، ئەبو ئیسحاق دەفەرموێ: بەرائم بینی لاسکایی تەکاندنی گوانی مەڕەکەی دەکردەوە، ئەم دەستی خۆی دەدا بەو دەستیداو دەیتەکاند، لە کاسەیەکی دارینا، بەقەد ژەمی شیری ناژەڵێکی شیرداری دۆشی. ئەبوبەکر فەرمووی: خۆشم جەوەندەیەکم پێ بوو، ئاوم لێ دادەکرد بۆ خواردنەوەی پێغەمبەرو بۆ دەستنوێژی، فەرمووی: جا گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر، بۆ بن تاوێرەکە، حەزیشم نەدەکرد کە خەبەری بکەمەوە، بەلام کە گەیشتمە لای روانیم خەبەری بۆتەوە، جا لەجەوەندەکە ئاوم کردە ناو شیرەکە، هەتا بنەکەی سارد بوو، ئەوجا عەرزی حەزرەتم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو لەم شیراوە نۆش بکە، ئەویش بەدڵی من لێی خواردەوە. ئەوجا فەرمووی: (ئایا کاتی رۆیشتن نەهاتووە؟) گوتم: با کاتیەتی. فەرمووی: پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ کەوتینە رێ.

سوراقەی کوڕی مالیك دەبیستێ کە بێباوەڕەکانی قوڕەیش خەلاتێکی گەورە دەدەن بەو کەسە، کە موحەممەدو ئەبوبەکر بە زیندوویی، یا بەمردوویی تەسلیم بەوان بکا، لەبەرئەوە خۆی پڕچەك دەکاو بەسواری شوێنیان دەکەوێ بەو نیازە، ئەبوبەکر فەرمووی: کاتێ گەیشتینە زەوییەکی رەقەنی سەخت، روانیمان وا سوراقە وا بەشوێنمانەوە، عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! وا دوژمن گەیشتە سەرمان؟ فەرمووی: (خەمت نەبێ خوامان لەگەڵە).




پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای شەڕی لە سوراقە کرد، ئیتر هەر چوارپەلی ئەسپەکەی هەتا ژێر سکی رۆچوون بەو زەوییە رەقەنو سەختەدا، وا دەزانم کە شتێکی ئاوا رووی دا، جا سوراقە گوتی: من دەزانم کە ئێوە دووعاتان لێ کردووم، ئێستا دووعام بۆ بکەن، سوێندتان بەخودا بۆ دەخۆم کە پەیمانتان دەدەمێ، ئەگەر لەم کارەساتە رزگارم ببێ، نە شوێنتان بەکەس دەڵێمو نەدەهێڵم کەستان شوێن بکەوێ، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای بۆ کرد لەلای خوداو رزگاری بوو، سوراقەیش بەرەو پاش گەڕایەوەو بەهەر کەسێ دەگەیشت، کەبۆ پێغەمبەرو ئەبوبەکر دەگەڕان، دەیگوت: من ئەم ناوچەیەم پشکنیوە، پێویست بەئێوە ناکا، ئیتر بە هەرکەسێ دەگەیشت بەرەودوا دەیگەڕانەوە. فەرمووی: لەڕاستیدا سوراقە بەڵێنەکەی خۆی کە پێمانی دا بردیە سەر. {تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٣١٦١ + تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٣١٦٣} .

## ٥٤- كِتَابُ التفسير
## نامەی تەفسیری قورئانی پیرۆز

١٨٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « قِيلَ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ ( ادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ يُغْفَرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ) فَبَدَّلُوا، فَدَخَلُوا البابَ يَزْحَفُونَ عَلَى أَسْتَاهِهِمْ ، وَقَالُوا: حَبَّةٌ فِي شَعَرَةٍ » . (الحديث ٧٤٣٩ = ٧٤٧٥ فم. تجريد البخاري بالكوردي = مختصر صحيح البخاري/٤ رقم: ١٦٣٣ = ٣٤٠٣، ٤٤٧٩، ٤٦٤١. تحفة الأشراف: ١٤٦٩٧).[١٨٩٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێ‌و سەرو ماڵ‌و حاڵ‌و منداڵ‌و باوك‌و دایك‌و هەست‌و نەست هەمووی بەقوربانی گەردی بەرپێی سەردانیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: گوترا بەنەوەی ئیسرائیل {وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ يُغْفَرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ} (البقرة/٢-٥٨):

واتە: کاتێ نەوەی ئیسرائیل لەمووسایان داواکرد، کە لەباتی گەزۆو گۆشتی شولاقە، بەروبوومی زەوییان دەرخوارد بدات خودا فەرمانی پێ کردن کە بچنە ناو شارێ، لەکاتی چوونە ژوورەوەدا کوڕنووش بۆ خودا ببەن‌و بڵێن: خودایە لەگوناهەکانمان ببورەو گوناهەکانمان لێ هەڵوەرێنە، ئەگەر وابکەن لەتاوانەکانتان خۆش دەبم.

کەچی ئەوان بەپێچەوانەوە، لەباتی ئەوەی بەملکەچی‌و کوڕنووشەوە بچنە ژوورەوە، بە قنگە خشکێ چوونە ژوورەوەو لە باتی ئەوەی کەبڵێن:

---

[١٨٩٣] تجريد البخاری بالكردی/٤، ژمارە: ١٦٣٣ = ٣٤٠٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٢٣ = ٧٤٣٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٣٨).

(حیططـه: خودایـه! گوناهـەکانمان لــێ هەڵومرێنــه) زمانیــان گــۆڕیو گوتیــان (حیططه، حەببـه فی شـەعەرە، کەلەسـەر فەرمایشتی عەللامـەی عـەینی، ئەمـە قسەیەکی بێ واتایە.

١٨٩٤- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ تَـابَعَ الْـوَحْيَ عَلَـى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلَ وَفَاتِهِ حَتَّى تَوَفِّيَ، وَأَكْثَرَ مَا كَانَ الْوَحْيُ يَوْمَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ). (م/٨/٢٣٨). {الحـديث/ ٧٤٤٠. إيمـان. بخـاري. فضائِلُ القرآن: ٤٩٨٢}.[١٨٩٤]

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خـودای گـەورەو سـەروەر، بـەر لەکۆچـکردنی پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) بـۆ ئـەو دونیا، پەیتا پەیتاو خۆش خۆش، سروشی بۆ دەنـارد، تەنانـەت کاتـێ کـە گیـانی پاکی سپارد، سـرووش (وەحـی) لـەجاران گـەرمتر دەهاتـە خـوارێ. ئـیتر لەپاشـان ئەوەندەی نەخایاند کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) عەمری خودای کرد.

١٨٩٥- عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ إِلَى عُمَرَ فَقَالَ لَهُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ ، آيَةٌ فِى كِتَابِكُمْ تَقْرَءُونَهَا لَوْ عَلَيْنَا نَزَلَتْ مَعْشَرَ الْيَهُودِ لاَتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَـوْمَ عِيدًا . قَالَ: وأَيُّ آيَةٍ؟ قَالَ: ( الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا ) . فَقَالَ عُمَر: إني لأَعْلَمُ اليَومَ الَّذي نَزَلَتْ فيه وَالْمَكَانَ الَّذى نَزَلَـتْ فِيهِ نَزَلَتْ عَلَى رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِعَرَفَات فِـي يَـوْمَ جُمُعَـةٍ. (الحديث

[١٨٩٤] بخاری. فضائل القرآن: ٤٩٨٢. پوختەی موسـلیم/١، ژمـارە: ٧٥ = ٧٤٤٠ شـیحا (بخـاری رقـم الكتاب/٦٦ رقم الباب/١).

٧٤٤٣ شـيحا = ٧٤٧٩ فـم. تجريـد البخـاري/١ رقـم/٤٢ = ٤٥، ٤٤٠٧، ٤٦٠٦، ٧٢٦٨. ترمذي. تفسير القرآن. ٣٠٤٣. نسائي. مناسك: ٣٠٠٢. تحفة/١٠٤٦٨).[١٨٩٥]

طاريقى كورِى شەهاب (ڕەحمەتى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پياوێكى جوولەكە هات بۆلاى پێشەوا عومەر (ڕەزاى خواى لێ بێ) گوتى: ئەى فەرمانڕەواى موسوڵمانان! ئايەتێ لەقورئانەكەتاندا هەيە، دەورى دەكەنەوە، ئەگەر ئەو ئايەتە بۆ ئێمە بهاتبايە كە كۆمەڵى جوولەكەين، ڕۆژى هاتنى ئەو ئايەتەمان هەموو ساڵێ دەكرد بەجەژن ئيمامى عومەر فەرمووى: كام ئايەتەيە؟ گوتى: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا} (سورة المائدة-٥/٣).

واتە: ئەمڕۆ من دەستووری ئايينی ئێوەم تەواو كرد بۆتان‌و نازو بەهرەو نيعمەتی خۆمم ڕژاند بەسەرتانا، وەئايينی پيرۆزی ئيسلامم هەڵبژارد بۆتان‌و كردم بەئاينتان.

عومەريش فەرمووى: دەى ئێمەيش زۆر بەباشى دەزانين كەئەو ڕۆژەو ئەو شوێنەو ئەو حاڵ‌و بارو دۆخەى كەئەم ئايەتەى تيا هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەربێ) كەى بوو، وە چۆن بوو، ڕۆژ ڕۆژى هەينى بوو، كات كاتى جەژنى قوربان بوو، شوێن سەركێوى عەرەفەبوو، پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەربێ) لەوێ ڕاوەستا بوو، سەرگەرمى ئەنجامدانى حەجى ماڵاوايى بوو!. (تاج/١ ژ/٤ ژ/٣٠ – باسى گەورەيى ئايين).

---

[١٨٩٥] تجريد البخارى/١، ژمارە: ٤٢ - ٤٥ بخارى. پوختەى موسليم/٥، ژمارە: ٢١٣٥ - ٧٤٤٣ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٢ رقم الباب/٣٣).

**ڕوونكردنەوە:**

**یەكەم:** واتە: ئێمەیش كە گەلی ئیسلامین، لەچەندین لاوە ئەو ڕۆژەمان كردووە بەجەژن، كەئەم ئایەتەی تیا هاتۆتە خوارەوە:

١- هەموو ڕۆژی هەینییەك جەژنی موسوڵمانانە.

٢- گەورەترین جەژنی موسوڵمانان جەژنی قوربانەو ڕۆژی عەرەفەیە.

٣- گەورەترین ئاهەنگو كۆبوونەوەو بەرزكردنەوەی دروشمی خودا لەچیای عەرەفە ئەنجام دەدرێ لەكاتی حەجا.

**دووەم:** ئەم فەرموودەیە باشترین بەڵگەیە لەسەرئەوە: كە زانایانی ئیسلامو فەرمانڕەوا دادپەروەرەكانی موسوڵمانان بەپێی ئەم فەرموودەیە دەتوانن: كە هەر ڕۆژێ، یا هەر شوێنێ، ڕووداوێكی گرنگی وای تیادا ڕووبدات، كە ببێ بەهۆی بەهرەی گەورەو یادگاری جوانو سەرمەشقی باش، بۆ گەلی ئیسلامو ببێ بەمایەی شانازیی‌و سەربەرزیی موسوڵمانان، دروستە كە ئەو ڕۆژە بكرێ بەجەژنو هەموو ساڵێ یادی بكرێتەوە.

لەڕاستی دا ئەو قسەیەی كە دەڵێ: هەرشتێ پێغەمبەر نەیكردبێ، یاڕای لەسەری نەبوو بێ، بیدعەتەو نادروستو ناڕەوایە.

لەڕاستی دا ئەم قسەیە كۆسپێكی گەورەیە، لەبەردەم گەشەكردنو پێشختنی ڕەوڕەوەی بەرەو پێشچوونی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، چونكە بەم قسەیە بێ دەبێ:

١- دەرگای ئیجتیهاد داخرێ، دیارو ئاشكرایە كە زیاتر لەنیوەی بڕیارەكانی شەرع، بە ئیجتیهادی زاناكان چەسپاونو بوون بەبەشێ لەیاسانامەی خودا، تەنانەت لەبەشی پەرستشو خودا پەرستی دا.

٢- لەم رۆژگارەدا دەبینین، زۆرینەی دروشم و نموونەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام گەشەیان پێ کراوە، گۆڕانکارییان تیا کراوە، ناچاری خۆی سەپاندووەو بەهۆیەوە زاناکان کارەگرانەکانیان ئاسانکردووە، بابەتە بەرتەسکەکانیان پان و پۆڕو بەرین کردووە. تەماشای حەج بکە:

١- ئایا ئێستا تەوافی بەیت و سەعیی بەینی سەفاو مەروەو ڕەجمی شەیتان و وەستان لەکێوی عەرەفە وەك سەردەمی پێغەمبەر خۆی ماوە، یا گەشەیەکی گەورەی پێ کراوە، ئایا مزگەوتی مەسجیدولحەرام و مزگەوتەکەی پێغەمبەر وەك سەردەمی پێغەمبەرماون یان گەورە کراون و لەهەر چوارلاوە، لەخاکێ کەلەسەردەمی پێغەمبەردا، یا بازاڕبوون، یامالٚ بوون، خراوەتە سەریان و ئێستا بوون بەبەشێ لەیەکێ لەدوو مزگەوتەکە.

٢- ئایا نوێژی تەراویح وەك سەردەمی پێغەمبەر دەکرێ، هەموو ڕەمەزانێ دوو سێ شەوی بەجەماعەت لەمزگەوت دەکرێ و بەس؟

بەڕاستی جێگەی داخە، ئەوەی کەپێی دەگوترێ: سەلەفییەت، دەق تورەققی مەعکووسە!! بەلاٚم سوپاس بۆ خودا، کە لەسەرا سەری جیهانی ئیسلامەتیدا زانای گەورە گەورە پەیدابوون، هەرکامێکیان بگری مجددی عەصرە. لەبەرئەوە خوا یاربێ، ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەگەشەکردندایەو تحجُرو تضَیُقه کلریگەر نییە.

١٨٩٦- عن عُرْوَةُ بن الزبير: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ - رضى الله عنها - عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى {وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ}. فَقَالَتْ يَا ابْنَ أُخْتِى هِىَ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِى حَجْرِ وَلِيِّهَا تُشَارِكُهُ فِى مَالِهِ ، فَيُعْجِبُهُ مَالُهَا وَجَمَالُهَا ، فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِى صَدَاقِهَا ، فَيُعْطِيهَا مِثْلَ مَا يُعْطِيهَا غَيْرُهُ ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ وَيَبْلُغُوا

بِهِنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ مِنَ الصَّدَاقِ ، وَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا طَابَ لَهُمْ مِنَ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ . قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ هَذِهِ الآيَةِ بَيْنَهُنَّ فَأَنْزَلَ اللَّهُ ( وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ ) إِلَى قَوْلِهِ ( وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ ) وَالَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ أَنَّهُ يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ الآيَةُ الأُولَى الَّتِي قَالَ اللهُ فِيهَا ( وَإِنْ خِفْتُمْ أَنْ لاَ تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ ) قَالَتْ عَائِشَةُ وَقَوْلُ اللَّهِ فِي الآيَةِ الأُخْرَى ( وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ ) يَعْنِي هِيَ رَغْبَةُ أَحَدِكُمْ لِيَتِيمَتِهِ الَّتِي تَكُونُ فِي حَجْرِهِ ، حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ الْمَالِ وَالْجَمَالِ ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا رَغِبُوا فِي مَالِهَا وَجَمَالِهَا مِنْ يَتَامَى النِّسَاءِ إِلاَّ بِالْقِسْطِ مِنْ أَجْلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ . (الحديث ٧٤٤٤ شييحا = ٧٤٨٠ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ رقم: ١٦٤٩ = ٤٥٧٤، ٢٤٩٤، ٢٧٦٣، ٤٥٧٣، ٤٥٧٤، ٤٦٠٠، ٥٠٦٤، ٥٠٩٢، ٥٠٩٨، ٥١٢٨، ٥١٣١، ٥١٤٠، ٦٩٦٥).[١٨٩٦]

عوروەی کوڕی زوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم لەعائیشەی پوورم کرد: لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە، کە دەفەرموێ: {وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ} (سورة النساء-٤/٣).

واتە: ئەگەر ترستان لەوە هەبوو کە عەدالەتو دادپەروەری نەکەن لەگەڵ ئەوکچە هەتیوانەدا، کەوان لەژێر چاودێری ئێوەدا، ئەگەر بێتو ماریان بکەن بۆخۆتان، ئەگەر ئەم مەترسییەتان هەبوو، ئەوا بچن ژنی تر ماربکەن بۆخۆتان کەبەدڵتان بێو هەتا توشی ناهەقیو نادادی نەبن بەهۆیانەوە، وە واز لەوکچە هەتیوانە بهێنن باتوشی ناهەقیو نادادی نەبن.

---

[١٨٩٦] تجريد البخاری/٤، ژمارە: ١٦٤٩ = ٤٥٧٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٢٩ = ٧٤٤٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤٧ رقم الباب/٧).

وه دهتوانن ژنێ، یان دوو ژن، یان سێ ژن، یان چوار ژن، بەپێی یاسانامەی خودا بۆخۆتان بهێنن، بەمەرجێ (کە بەمەرجی سەرەکی دادەنرێت) کە بتوانن عەدالەتو دادپەروەریی بەجێ بهێنن لەنێوانیان دا.

عوروە فەرمووی: پورم عائیشە فەرمووی: ئەی خوشکەزای خۆم! ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەشانی کچانی بێ باوك دا کەلەلای هەقداریان بن، واتە: لەلای ئامۆزاو کوڕانی ئامۆزایان بن، وە ئەو هەقدارە بچێ لەبەرسامانو ماڵی کچەکە، یالەبەر جوانییەکەی مارەی بکات لەخۆی، بەلام ئەوەندەی کەباوبێ لەناو کۆمەلا، ئەوەندە مارەیی پێ نادا، جا خودا نەهی لێ کردن لەکردنی شتی وا ناهەق، مەگەر بەمەرجێ کەناهەقییان لێنەکەنو وەك ژنانی تر مارەییو مافیان بۆ دابنێن، ئەوە دەبێ، دەنا خودا فەرموویەتی پێیان کە بڕۆن لەژنانی تر بەدڵی خۆتان بهێننو وازبهێنن لەوان.

عوروە فەرمووی: عائیشە فەرمووی: خەڵکەکە لەپاش هاتنی ئەم ئایەتە، داوای فەتوایان لەپێغەمبەر کرد، کەبۆیان روون بکاتەوە، خودا لەوەڵام دا ئەم ئایەتەی تری نارد، {وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاء قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاء الَّلاتِي لاَ تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ} (سورة النساء-٤/١٢٧).

واتە: داوای فەتواو روونکردنەوەی بڕیارەکانت لێ دەکەن، سەبارەت بەژنان، تۆ ئەی پێغەمبەر! لەوەڵامیانا بڵێ: خودا فەتواتان بۆ دەداو، هەروەها ئەو ئایەتانەی کە دەخوێنرێنەوە لەقورئانا فەتواتان بۆدەدەن، کەبەیانی حاڵی ژنە بێ باوکەکان دەکەن، کە ئەو مافەی بڕیار دراوە بۆیانو لەیاسانامەی خوادا نووسراوە بۆیان، پێیان نادەن، وەلەهەمان کاتا بەپێی بەرژەوەندی خۆتان

حەزدەکەن کەمارەیان بکەن لە خۆتان، یاحەزدەکەن کەمارەیان نەکەن لەخۆتانو نەیشهێڵن کە بۆخۆیان شووبکەن!

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەبەست لەم ڕستەیە کەلەم ئایەتەی پێشەوەدا دەفەرموێ: {يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ} تایەتی یەکەمی ئەم پرسیارو وەڵامەی منو تۆ بوو کە خودا تیایدا دەفەرموێ: {وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء}.

هەروا عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەر ڕوونکردنەوەکەی خۆی ڕۆیشتو فەرمووی: ئەوەیش کەخودای گەورە لەئایەتەکەی تردا دەفەرموێ: {وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ} کەبەشێکە لەئایەتی وەڵامی داوای فەتواو پرسیارەکەیان مەبەست لەم ڕستەیە ئەمەیە:

ئەگەر کەسێ لەئێوە، کچێکی هەتیوی خۆی، لەچاودێری ئەودابوو، چونکە ئامۆزای بوو، وەماڵی کەم بوو، وە جوانیش نەبوو، ئەوا حەزناکا کە مارەی بکا بۆخۆی، بەڵام ئەگەر کچە هەتیوەکەیان، کەوا لەژێر چاودێرییان دا ماڵو سامانو جوانی هەبوو، ئەوا لەبەر بەرژەوەندی خۆیان مارەیان دەکەن بۆخۆیانو مافی تەواوی خۆیانیان پێ نادەن، جا خودا ڕێگەی شتی وایان پێ نادا، مەگەر پابەندبن بەیاسای دادپەروەرییەوە). (تاج/٤ ز/٥ ژ/٣٧٩٤ — سوورەتی نیساء).

١٨٩٧- عن عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهـا) فِـي قَوْلِـهِ عَـزَّ وَجَـلَّ ( وَمَـنْ كَـانَ غَنِيًّـا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ ) قَالَتْ: أُنْزِلَـتْ فِـى وَالِـى الْيَتِـيمِ الَّـذِى

يُقُومُ عَلَيْهِ ، وَيُصْلِحُهُ إِذَا كَانَ مُحتاجاً أَنْ يأْكُلَ مِنْـهُ. (الحديث ٧٤٤٩ شيحا = ٧٤٨٥ فم. بخاري. وصايا: ٢٧٦٥. تحفة الأشراف: ١٧٠٨٦) [١٨٩٧]

عائيشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەم ئایەتە: {وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ} (النساء-٤/٦)

واتە: هەرکەسێ لەئێوه دەوڵەمەندبێ، باخۆی دووربگرێ لەماڵی ئەو هەتیوانە، بەڵام ئەگەر کەسێ ئاتاج و نەدارابوو، بالەو ماڵە بخوات بەپێی باوی جوانی ناو کۆمەڵگا).

عائیشە فەرمووی: ئەم ئایەتە سەبارەت بەسەرپەرشتیاری سەرماڵ و سامانی هەتیو دابەزیوە، کە سەرپەرشتی سامانەکەی دەکاو بەخێوی دەکاو بەرهەمی دەهێنێ، ئەگەر ئەم سەرپەرشتیارە ئاتاج بوو ئەوە دروستە کە بەقەی خزمەتی ماڵەکە، بەپێی شەرع لێی بخوات دەنا نا). (تاج/٢ ز/١٤ ژ/٢٠٠٣ + تاج/٤ ز/٥ ژ/٣٧٩٥).

١٨٩٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) في قوله عز وجل: ( وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا ) قَالَتِ: نزلت في المرأة تكون عند الرَّجُلُ فلعله أن لا يستكثر منها وَتَكُونُ له صحبة وولد فتكره أن يفارقها فتقول له: أنت في حل من شأني. (الحديث ٧٤٥٣ شيحا = ٧٤٨٩ فم. بخاري. مظالم. ٢٤٥٠، ٢٦٩٤، ٤٦٠١، ٥٢٠٦. أبوداود. نكاح: ٢١٣٥، نسائي. السنن الكبرى: ٦/٣٢٩. تحفة الأشراف: ١٧٠٥٨، ١٧٠٥٩). [١٨٩٨]

---

[١٨٩٧] بخاری. وصایا: ٢٧٦٩. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٣٠ = ٧٤٤٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٩٥).

[١٨٩٨] بخاری. مظالم: ٢٤٥٠. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٣٤ = ٧٤٥٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤٦ رقم الباب/١١).

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) لەبارەی ئەم ئایەتەوە {وَإِنِ امْـرَأَةٌ خَافَـتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا} (النساء-٤/١٢٨) واتە: یەزدانی مەزن لەقورئانی پیرۆزدا، لەسوورەتی نیساء دا، لە ئایەتی سەدو بیستو هەشت دا دەفەرموێ: ئەگەر ژنێ دەترسا لەوە کەمێردەکەی لێی بێزاربێ‌و بەرە بەرە بەتەواوی دوور بکەوێتەوە لێی، وەیا خود حەزی لەو نەماوەو حەزی لەژنێکی تر کردووە، وەیا خود لەبەر هەر هۆیەکی تر دوورنییە، کە مێردەکەی دەستی لەدەستی ببێتەوە، ئەوە لەم کاتانەدا گوناهیان ناگا ئەگەر لەناو خۆیانا بسازێن‌و ڕێبکەون‌و صولح بکەن، چونکە صولح‌و ڕێکەوتن هەمیشە هەر خێر بووەو هەر خێریش دەبێ.

جا عائیشە لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە وەك ئەوە پیاوێ ژنێکی هەبێ، خۆی تێ نەگەیەنێ‌و بیەوێ تەلاقی بداو، ژنێکی تر بهێنێ، ژنەکەیش تەمەنێ لەگەڵ مێردەکەی دا ژیاوەو منالّی لێی هەیە، لەبەرئەوە حەز ناکا لێی جیابێتەوەو پێی دەڵێ: بمهێڵەو بەرەڵام مەکەو بۆخۆت ژنێکی تر بهێنەو بۆ ئازووقەو خەرجی‌و نۆرەکاری شەویش گەردنت ئازادبێ، مەبەست ئەمەیە کەخودای گەورە لە قورئانا دەفەرموێ: {فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا} (سورة النساء-٤/١٢٨). (تاج/٢ ز/٥٢ ز/٢١٨٠ – دروستە ژن دەست لە مافی خۆی هەڵبگرێ).

١٨٩٩- حديث ابن عباس سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ قَالَ { آيَةٌ } اخْتَلَفَ فِيهَا أَهْلُ الْكُوفَةِ ، فَرَحَلْتُ فِيهَا إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَأَلْتُهُ عَنْهَا فَقَالَ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ( وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ ) هِيَ آخِرُ مَا نَزَلَ وَمَا نَسَخَهَا شَيْءٌ.[١٨٩٩]

---

[١٨٩٩] بخاری. تفسیر: ٤٧٦٢. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٣٣ - ٧٤٦١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٤).

سەعیدی کوڕی جوبەیر فەرمووی: لە بارەی ئایەتی ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ﴾ەوە، لە نێوانی خەڵکی کووفەدا ڕاجیایی هەبوو، منیش سوار بووم، چووم بۆ خزمەتی ئیبنو عەبباس وە لەم بارەیەوە پرسیارم لێی کرد، فەرمووی: ئەم ئایەتە کە دەفەرمویٚ: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ﴾ واتە: ٠هەرکەسیٚ بە ناڕەوا بە ئەنقەست، موسوڵمانیٚ بکوژیٚ، جێگەی ناو ئاگری دۆزەخە) ئیبنو عەبباس فەرمووی: ئەم ئایەتە لە دوا دوادا هاتۆتە خوارەوە، وە هیچیش نەسخی نەکردۆتەوە.

١٩٠٠- حديث إبن عباس. قَالَ ابْنُ أَبْزَى سَلِ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ) وَقَوْلِهِ ( لاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ) حَتَّى بَلَغَ ( إِلاَّ مَنْ تَابَ ) فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ لَمَّا نَزَلَتْ قَالَ أَهْلُ مَكَّةَ فَقَدْ عَدَلْنَا بِاللَّهِ وَقَتَلْنَا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَأَتَيْنَا الْفَوَاحِشَ ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ (إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا) إِلَى قَوْلِهِ ( غَفُورًا رَحِيمًا )[١٩٠٠]

ئیبنو ئەبزا فەرمووی: لە بارەی ئەم ئایەتەوە ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُّتَعَمِّداً فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا﴾ وە هەروەها لە بارەی ئایەتی ﴿لاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ هەتا ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ﴾ پرسیار کرا لە ئیبنو عەبباس، منیش پرسیارم لەم بارەیەوە لێی کرد، فەرمووی: کە ئەم ئایەتانە دابەزین، خەڵکی مەککە گوتیان: ئەم شتانەی کە لەم ئایەتانەدا باس کراون‌و بە تاوانی گەورە دانراون، ئێمە هەموویانمان کردووە، هاوەڵمان بۆ خودا بڕیار داوە، کەسیٚ کە خودا کوشتنی ئەوی ناڕەوا کردووە، ئەو جۆرە کەسانەمان کوشتووە، وە تاوانە گەورە شەرم ئاوەرەکانمان کردووە، جا بەم بۆنەیەوە خودا ئەم ئایەتەی

---

[١٩٠٠] بڕوانە ژمارە: (١٨٩٩). (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٢٥).

تـرى نـارده خـوارەوە: ﴿إلاَّ مَـنْ تَـابَ وَآمَـنَ وَعَمِـلَ عَمَـلاً صَـالِحًا﴾ هـەتا كـە دەفەرموێ: ﴿غَفُورًا رَحِيمًا﴾.

بڕوانە ژمارە: (١٩٠١) لە پاش ئەم ژمارەیەوە.

١٩٠١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَقِيَ نَاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَجُلاً فِي غُنَيْمَةٍ لَهُ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ. فَأَخَذُوهُ فَقَتَلُوهُ، وَأَخَذُوا تِلْكَ الْغُنَيْمَةَ، فَنَزَلَتْ: (وَلاَ تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا) وَقَرَأَهَا ابْنُ عَبَّاسٍ (السَّلَامَ). (الحديث ٧٤٦١ شيحا = ٧٤٩٦ فم. ف.م = فتح الملهم شرح صحيح مسلم. بخاري. تفسير: ٤٧٦٢. نسائي. تحريم الدم: ٤٠١٢. تحفة الأشراف: ٥٥٩٩).[1901]

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەشانی ئەم ئایەتەدا، خەڵکی کووفە قسەیان جیا جیا بوو، منیش سواربووم چووم بۆلای ئیبنو عەبباس، کەلەم بارەیەوە لێیم پرسی، فەرمووی: ئەم ئایەتە {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا} دواشتە کەلەم بارەیەوە هاتە خوارەوە، وە هیچیش هەڵی نەوەشاندۆتەوەو حوکمو بڕیارەکەی وەك خۆی ماوە).

گفتەی ئەبوداوود، کەلەباسی فیتنەدا ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە ئاوایە:

کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی کەلەسوورەتی فورقان دایە، کەدەفەرموێ: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا} (سورة الفرقان-٢٥/٦٨).

بەندەباشەکانی خودای میهرەبان ڕەوشتێکی بەرزی تریشیان هەیە کە ئەوەیە: بەس خودای گەورەو مەزن دەپەرستنو داوای هەمووشتێ هەر لەخودا دەکەن، وەکەسێ کە خودا کوشتنی ئەوی قەدەغە کردبێ ناکوژن، مەگەر

---

[1901] بخاری. تفسیر: ٤٥٩١. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٣٣ = ٧٥٠٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٤).

لەبەرهۆیەکی ڕەوای هەق بەپێی شەرع، وەلەهەمان کاتا داوێنپیسی ناکەنو، داوێنپاكو رووپاكو رووسورن، کاتێ کەئەم ئایەتە هات، هاوبەش پەیداکەرەکانی مەککە گوتیان: ئێمە ئەم تاوانانەمان هەموو کردووە، کەواتە ئیسلام بوونمان چی سوودی هەیە بۆئێمە، جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا} (سورة الفرقان-٢٥/٧٠).

کەواتای وایە: هەرکەسێ یەکێ لەم تاوانانە بکا، دەگا بەتۆڵەی سەختی تاوانی خۆی، مەگەر ئەوکەسە نەبێ کە لەپاشکردنی ئەم گوناهانە تەوبە بکاو وازیان لێ بهێنێو موسوڵمان ببێو چڵکی کوفر بەنووری ئیسلام بشۆرێو دەست بکا بەکردنی کردەوەی باشو کردارو ڕەفتاری خۆی باش بکا، ئەوە ئەمانە خودای مەزن گوناهەکانیان دەپۆشێو خراپەکانیان بۆدەکا بەچاکەو خودای میهرەبانو گەورە هەمیشە میهرەبانو تاوان بەخش بووەو هەروایش دەبێو دەرگای ڕەحمەتی لەئەزەلەوە هەتا ئەبەد هەروازە!.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەی ئەم ئایەتەیە بۆ شەرحی حاڵی ئەمانە بوو، هەتا ڕێگەی ئیسلامبوونیان بۆخۆش بکا، بەڵام ئەو ئایەتەی کەلە سوورەتی نیساء دایە، کەدەفەرموێ:

{وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا} (سورة النساء-٤/٩٣).

واتە: هەرکەسێ موسوڵمانێ بەناڕەوا، بەقەستی بکوژێ، ئەوە پاداشی ئەو بکوژە سزای دۆزەخە، هەتا هەتایە لەوسزا سەختەدا دەمێنێتەوە، سەرەڕای ئەومیشە خودا رقو قاری لێ دەگرێو پەیتا پەیتا نەفرەتو نەفرینی لێ دەکاو

هەتا بێت دوورتری دەخاتەوە لەمیهرو سۆزی خۆی، وەبەدەستی خۆی سزایەکی پڕئێش‌و ئازاری بۆ ئامادەکردووە.

بەڵام ئەم ئایەتە جیایە لەوەی پێشوو، ئەمە بۆ کەسێکی وایە کەلەپاش ئەوە شارەزای یاسانامەی ئیسلام ببێ، بچێ بەئارەزوو، بەقەستی، بەناڕەوا، موسوڵمانێ بکوژێ، دەی ئەم بکوژە بەلای منەوە، سزای ئاگری دۆزەخە، تەوبەو پەشیمانی بۆ نییە، راوی (قسە گێڕەوە) دەڵێ: بەڵام کەئەم قسەیەم باس کرد بۆ موجاهیدو پێم گوت کە ئیبنو عەبباس ڕای وایەو دەڵێ بکوژ تەوبەی بۆنییە، موجاهید فەرمووی: (هەرکەسێ لەهەرتاوانێ تەوبە بکا تەوبەی گیرایە!). (تاج/٤ ز/٥ ژ/٣٨١ – سوورەتی نیساء).

**ڕوونکردنەوە:**

ئیمامی موجاهید موفەسیرێکی گەورەی ناسراوە، یەکێکە لەشاگردە ناودارەکانی ئیبنو عەبباس، ناوی تەواوی (موجاهیدی کوڕی جەبری المكيّ المقرئ) لەساڵی بیست‌و یەکی کۆچی دا، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا لەدایك بووە، گێڕانەوەی لەهاوەڵانی زۆرەوە هەیە، وەك عائیشەو ئوم سەلەمەو جووەیرییەو ئەبو هورەیرەو جابری کوڕی عەبدوڵلاو هەرچوار عەبدوڵلاکان‌و هاوەڵانی تریش، هەروا کۆمەڵێ لەتابیعینیش گێڕانەوە لەموجاهیدەوە ئەنجام دەدەن، وەك عەطاءو عیکریمەو قەتادەو ئەعمەش‌و خەڵکێکی زۆری تریش، لەپیاوان (رِجال)ی شەش پەڕاوەکەیە، کە ناسراون بە بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبوداودو تەرمەزی‌و نەسائی‌و ئیبنو ماجە.

زاناترین کەس بوو بەتەفسیری قورئانی پیرۆز لەسەردەمی خۆی دا، فەضلی کوڕی مەیمون دەفەرموێ: لە موجاهیدم بیست دەیفەرموو: (٣٠) سیی

جار دەوری قورئانم کردۆتەوە بۆ ئیبنو عەبباس، هەتا بەجوانی ڕەوانی بکەم‌و واتاکەی بەباشی بزانم. سەلەمەی کوڕی کەهیل دەفەرموێ: کەسم نەدیوە وەك ئەم سێ کەسە، کەزانست‌و عیلمەکەیان ساخ لەبەر ڕەزای خودابێ. عەطاء‌و طاوس‌و موجاهید.

کەئەم سێ کەسە لەشاگردو فەقێ باشەکانی ئیبنو عەبباس بوون، ئەعمەش دەیفەرموو: موجاهید دەیفەرموو، ئەگەر فێری قیرائەتی ئیبنو مەسعوود ببومایە، پێویستم بەوە نەبوو، کە پرسیار لەئیبنو عەبباس بکەم، لەبارەی زۆر لەمەعنای ئایەتەکانی قورئان!.

موجاهید خۆی دەفەرموێ: سێ جار سەراسەر قورئانم دەورکردەوە بۆ ئیبنو عەبباس، ئەویش گوێی لێ دەگرتم، لەسەر هەموو ئایەتێ دەوەستام پرسیاری ئەوەم لێ دەکرد، کەبەچی بۆنەیەکەوە هاتووەو دابەزیوە، وە ئایەتەکە چۆنەو چییە. ئیبراهیمی کوڕی موهاجیر دەفەرموێ: موجاهید دەیفەرموو: گەلێ جار کاتێ ئیبنو عومەر سواری وڵاخەکەی دەبوو، من ئاوزەنگیەکەیم دەگرت بۆی!

قەتادە دەیفەرموو: باشترین کەس لەپێشینانە تەفسیر زانەکان کەمابێ موجاهیدە.

موجاهید زانایەکی گەورەی شەرعزان بوو، زۆر بەتەقوا بوو، زۆر خوا پەرست بوو. نەتەوەی ئیسلام بەکۆی دەنگ موجاهید بەپێشەوای خۆیان دادەنێن‌و فەرمایشت‌و ڕاوبۆچوونەکانی جێگەی متمانەیانەو بەڵگەسازییان پێ دەکەن.

ڕاجیایی لەساڵی کۆچی دوایی دا هەیە. ئیبنو حیببان دەفەرموێ: ساڵی سەدو دوو، یا سەدو سێی کۆچی، لەمەککە، لەتەمەنی هەشتاو سێ ساڵی دا کۆچی دوایی دەکاو بەبەهەشتی بەرین شاد دەبێ خوای لێ خۆش بێ.

١٩٠٢- عَنْ أَبِى إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ يَقُولُ: كَانَتِ الأَنْصَارُ إِذَا حَجُّوا فَرَجَعُوا لَمْ يَدْخُلُوا الْبُيُوتَ إِلاَّ مِنْ ظُهُورِهَا - قَالَ - فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَدَخَلَ مِنْ بَابِهِ فَقِيلَ لَهُ فِى ذَلِكَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ( لَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا ). (الحديث ٧٤٦٥ رقم الحديث في شرح الإمام النووي لصحيح مسلم، حَسْبَ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٥٠١ فم. بخاري. تفسير: ١٨٠٣، ٤٥١٢. تحفة الأشراف: ١٨٧٤).[١٩٠٢]

ئەبو ئیسحاق فەرمووی: لەبەرائم بیست دەیفەرموو: جاران یاریدەدەران (الأنصار) کە حەجیان دەکردو دەگەڕانەوە، لەقنگەبانەوە دەلاقەیەکیان دەکردە خانووەکەیانو لەوکوونەوە لەپشتەوە دەچوونەماڵەوە، هەتا جارێ پیاوێ، لە یاریدەدەران لەحەج دەگەڕێتەوەو لەدەرگاوە دەچێتەوە ماڵەوەی، ئەوانیش سەرزەنشتی دەکەنو دەڵێن بۆچی واتکرد؟، جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُواْ الْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا} (البقرة- ٢/١٨٩)

واتە: چاکەو کردەوەی باش ئەوە نییە کە هاتنەوە بۆماڵەوە لەقنگە بانەوەو لەپشتی خانووەوە بچنە ژوورەوە، بەڵکوو چاکە ئەوەیە کەپیاو لەخودای گەورە بترسێو پارێز لەنافەرمانی ئەو بکا، لەدەرگای ئاسایی ماڵەکانتانەوە بچنە ژوورەوەو هاموشۆبکەنو بۆ هەموو مەبەستێ لەدەرگاو ڕێگەی ئاسایی خۆیانەوە بڕۆن.

---

[١٩٠٢] بخاری. تفسیر: ١٨٠٣. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٢٤ - ٧٤٦٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٦ رقم الباب/١٨).

(٤) باب في قوله تعالى: ﴿أولـئك الذين يدعون يبتغون إلى ربهم الوسيلة﴾

١٩٠٣- حديث عبدالله بن مسعود ( إِلَى رَبِّهِـمِ الْوَسِيلَةَ ) قَـالَ كَـانَ نَـاسٌ مِـنَ الإِنْسِ يَعْبُدُونَ نَاسًا مِنَ الْجِنِّ ، فَأَسْلَمَ الْجِنُّ ، وَتَمَسَّكَ هَؤُلاَءِ بِدِينِهِمْ . زَادَ الأَشْجَعِيُّ عَنْ سُفْيَانَ عَنِ الأَعْمَشِ. (قُلِ ادْعُواْ الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ)[١٩٠٣]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رەزای خودای لێ بێ) لە بارەی ئایەتی ﴿إِلَى رَبِّهِمِ الْوَسِيلَةَ﴾ەوە، فەرمووی: کۆمەڵێ مرۆڤ کۆمەڵێ جنۆکەیان دەپەرست، جا جنۆکەکان ئیسلام بوون، بەڵام مرۆڤەکان هەر مانەوە لەسەر هەڵەکەی خۆیان.

(٥) باب في سورة براءة والأنفال والحشر

باسی سورەتی بەرائەتو ئەنفالو حەشر

١٩٠٤- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ سُورَةُ التَّوْبَةِ؟ قَالَ: آلتَّوْبَةِ قَـالَ: بَلْ هِيَ الْفَاضِحَةُ، مَا زَالَتْ تَنْزِلُ وَمِنْهُمْ وَمِنْهُمْ. حَتَّـى ظَنُّـوا أَنْ لاَ يَبْقَـى مِنَّـا أَحَدٌ إِلاَّ ذُكِرَ فِيهَا. قَالَ: قُلْتُ: سُورَةُ الأَنْفَالِ؟ قَالَ: تِلْـكَ سُـورَةُ بَـدْرٍ. قَـالَ: قُلْـتُ فَالْحَـشْرُ؟ قَـالَ: نَزَلَتْ فِي بَنِي النَّـضِيرِ. (الحـديث ٧٤٧٤ = ٧٥١٠فـم. بخـاري. تفـسير: ٤٦٤٥، ٤٨٨٢، ٤٨٨٣، ٤٠٢٩، تحفة الأشراف: ٥٤٥٤).[١٩٠٤]

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم بەعەبدوڵڵای کوڕی عەبباس کە ئامۆزای پێغەمبەرە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەئیبنو عەبباس بێ) هۆی هاتنی سوورەتی تەوبە چی بوو؟ فەرمووی: سوورەتی تەوبەی چی؟! بۆ ناڵێی سوورەتی ئابڕو بردنو ڕیسوا

---

[١٩٠٣] بخاری. تفسیر: ٤٧١٤. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٤٥ = ٧٤٧١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/١٧).

[١٩٠٤] بخاری. تفسیر: ٤٦٤٥. پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٤٢ = ٧٤٧٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٥٩).

کردنی ناپاكو مونافقەکان! لەکاتی خۆی دا هەموو جارێ کە ئایەتەکانی ئەم سوورەتە دەهاتنە خوارەوەو کۆمەڵ کۆمەڵ ناپاکەکانیان کەشف دەکردو دەیانفەرموو: هەندێکیان حاڵیان ئەمەیەو هەندێکی تریان حاڵیان ئەوەیەو واوایە، ناپاکەکان زەندەقیان دەچوو، لەدڵەوە دەیانگوت: وابڕوات کەسمان لێ دەرناکا، یەك بەیەکمان، هەموومان کەشف دەکاو پەردەی نیفاق لەڕوومان لادەباو ڕیسوامان دەکا.

گوتم: ئەی هۆی هاتنی سوورەتی ئەنفال چی بوو؟ فەرمووی: لەبارەی جەنگی بەدرەوە هاتە خوارەوە. گوتم: ئەی سوورەتی حەشر؟ فەرمووی: لەبارەی جوولەکەکانی هۆزی بەنی نەضیرەوە هاتە خوارەوە. (تاج/٤ ز/٤٢ ژ/٤١٥٦ — سوورەتی حەشر).

## (٦) باب في نزول تَحْرِيم الخَمْرِ
## له بارەی چۆنێتی نادروستبوونی مەی

١٩٠٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) قَالَ: خَطَبَ عُمَرُ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، أَلاَ وَإِنَّ الْخَمْرَ نَزَلَ تَحْرِيمُهَا يَوْمَ نَزَلَ وَهْيَ مِنْ خَمْسَةِ أَشْيَاءَ: مِنَ الْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرِ، وَالزَّبِيبِ، وَالْعَسَلِ، وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ، وَثَلاَثَةُ أَشْيَاءَ وَدِدْتُ أَيُّهَا النَّاسُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَانَ عَهِدَ إِلَيْنَا فِيهَا: الْجَدُّ، وَالْكَلاَلَةُ، وَأَبْوَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا. {الحديث: ٧٤٧٥ =تجريد/٤، رقم: ١٦٥٧م = ٤٦١٧، ٢٤٦٤، ٤٦٢٠، ٥٥٨٠، ٥٥٨٢، ٥٥٨٣، ٥٥٨٤، ٥٦٠٠، ٥٦٢٢، ٧٢٥٣}:[١٩٠٥]

[١٩٠٥] تجريد = مختصر صحيح البخاری = مختصر صحيح البخاری بالكردی/٣، ژمارە: ١٦٥٧م = ٤٦١٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٦٩ = ٧٤٧٥ شیحا - ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٤ رقم الباب/٥).

ئیبنو عومـەر (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: ئیمامی عومـەر (رەزای خودای لێ بێ) لەمەدینە، لەسەر دوانگەکەی پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە مزگەوتەکـەی پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەســەر بـێ) وتـارێکی دا، سوپاسی خودای کردو وەسپێکی جوانی خـودای کـرد، لەپاشـا فـەرمووی: لـەپاش سوپاس‌و ستایشی خودا، بزانن کەمەی لە قورئانا حەرام کراوە، ئـەو سـەردەمەی کە نادروست بوونی مەی دابەزی لە قورئانا، مەی لەم پێنـج شتە دروست دەکـرا: لە گەنم‌و لەجۆو لـە خورمـاو لـەمێوژو لـە هـەنگوین، وە خـەمریش ئەوەیـە کـە هۆش داپۆشێ. واتە: هەرشتێ لەم پێنـج شتە دروست بکرێ، یا لەهەر شتێکی تـر دروسـت بکـرێ، بەمـەرجێ هـۆش لابـەرێ دادەنـرێ بەمـەی‌و نادروسـتە. عومـەر فەرمووشی: ئەی خەڵکینە! سێ شتی تریش هـەن، حـەزم دەکـرد، کـە پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) بەرلـەوە مـەرگ ببـێ بـەمیوانی، ئـەم سـێ شـتەی بۆمان روون بکردایەتەوە: یەکەم بەشە کەلەپووری باپیرە، دووەم: باسـی کەلالـە، کەجۆرە مردوویەکە، سێیەم: چەند بابەتێ هەیە لە سوود، وەك (رِبَا الفَضْلِ) کە بڕیارەکەی چییەو چی نییە. {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٣١، زنجیرە: ٢٥، ژمـارە: ٢٧٣٧ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

## (٧) باب في قوله تعالى: ﴿هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ﴾
## باسى فەرمایشتی خودای گەورە ﴿هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ﴾

١٩٠٦- عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ يُقْسِمُ قَسَمًا إِنَّ (هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ) إِنَّهَا نَزَلَتْ فِي الَّذِينَ بَرَزُوا يَوْمَ بَدْرٍ حَمْزَةُ وَعَلِيٌّ وَعُبَيْدَةُ بْنُ الْحَارِثِ وَعُتْبَةُ وَشَيْبَةُ ابْنَا رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ. (الحديث ٧٤٧٨ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٥١٤ ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح مسلم. بخاري. مغازي. ٣٩٦٦، ٤٩٦٨، ٣٩٦٩، ٤٧٤٣. ابن ماجه. جهاد. ٢٨٣٥. تحفة الأشراف: ١١٩٧٤).[١٩٠٦]

ئـەم فەرموودەیـە لـەتاجول ئوصـولا ئاوایـە، دەیكـەین بـە ڕاڤـەو ڕوونكردنەوە بۆ ئێرە:

ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لەڕۆژی زینەوەدا، من یەكەم كەس دەبم، كەلەبەردەمی خودای گەورەو میهرەباندا بەچۆكا دێم و سكالای حاڵی خۆم دەكەم لەدەست ناحەزەكانی خۆم.

قەیسی كوڕی عوباد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: لەئەبو زەڕم بیست دەیفەرموو (ڕەزای خوای لێ بێ): سوێندی دەخوارد لەسەرئەوە كەئەم ئایەتە: {هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِم} (الحج/٢٢/١٩) لەشانی ئەم دوو دەستەیەدا هاتە خوارێ، كە لەڕۆژی غەزای بەدردا چوونە مەیدان بۆیەكتری، دەستەی موسوڵمانەكان، عەلی و حەمزەو عوبەیدە بوون، دەستەی بێباوەڕەكانیش شەیبەی كوڕی ڕەبیعەو عوتبەی كوڕی ڕەبیعەو وەلیدی كوڕی

---

[١٩٠٦] بخاری. مغازی: ٣٩٦٦. پوختەی موسلیم - مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢١٥٢ = ٧٤٧٨ شیحا - ترقيم وتخريج الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٨).

عوتبە بوون. (تاج/٤ ز/٥ ژ/٣٩٩٨- سوورەتی حەج). ئـەم فەرموودەیـە دواهـەمین فەرموودەیە لەصەحیحی موسلیم، هەروا لە (اللؤلؤ والمرجان)دا

ئێستایش لە کۆتای ئەم نامە پیرۆزەدا، (واتە: لەکۆتایی اللؤلؤ والمرجان)دا کە بریتیە لەو فەرموودانـەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) کـە هـەم پێـشەوا بوخـاریو هـەم پێـشەوا موسـلیم گێڕاویاننەتـەوە، ژیاننامـەی ئیمـامی بوخاریو ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) دەنووسین:

پێشەوا بوخاری (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) نـاوی: (ئـەبو عەبـدوڵلا، محمدی کوڕی ئیسماعیلی کـوڕی ئیبراهیمـە) لـە ڕۆژی سیازدەی مـانگی شـەووال ساڵی (١٩٤)ی کۆچی، لە ڕۆژی هەینی، لە پاش نوێژی هەینی، لە بوخارا لە دایك بووە، وە لەشەوی جەژنی ڕەمەزانا، کە ڕێکەوتی شەوی شەممە دەکات، لـە سـاڵی (٢٥٦)دا، لـە خەرتـەنگ، کـە یەکێکـە لـە گونـدەکانی سـەمەرقەند، گیـانی پـاکی سـپاردو بـە دەردی خـودا دەمـرێ، لـە تەمـەنی (٦٢) شەسـتو دوو سـاڵیدا، لـە سەرەتای بە کوردیکردنی تەجریدی بوخارییەوە، لـە بـارەی ژیاننامـەی پێشەوا بوخارییەوە ئەمەم نووسیوە:

ئەم پەڕاوە پیرۆزەیە (واتە: پوختەی بوخـاری) کـەواین لەخزمەتیـدا خـوا بەکەرەمی خۆی لەپیتو فەڕی بێبەشمان نەکات، جوانترین پوختەی صـەحیحی بوخارییـە، کـەناوداره بـە موختەصـەری زوبەیـدی. صـەحیحی بوخـاری خـۆی (٧٢٥٧) فەرموودەیـە، بەشـێکی زۆری فـەرموودەی موسـنەدی متـصلی پێغەمبـەر خۆیەتی، کەبریتییە لەم تەجریدە صەریحە. پێـشەوا بوخـاری (ڕەزاو ڕەحمـەتی خودای لـێ بێ) بەشازدە ساڵ صەحیحی بوخـاری دانـاوە، گەشـتێکی گـەورەی بـۆ ئەم مەبەستە پـیرۆزە ئـەنجام داوە، لەسـەرەتاوە لـەبوخاراو سـەمەرقەندو دەورو بەریانەوە دەستی پێکردووە، هەتا لەتەمەنی هەژدە سـاڵی دا لەخزمـەت دایکـیو

ئەحمەدی برای دا دەچن بۆ حەج، بەسەر سارای قرمو ئەفغانستانو ئێرانو عێراقو شامو دەریای سووردا دەڕۆن هەتا دەگەنە حیجاز.!

دەبێ چ سۆزو ئەشقو شەوقێ پاڵی پێوەنابن کە سەفەرێکی ئاوا دورو درێژو پڕ مەترسیی بگرنە بەر. جا لەپاش حەج دایکیو ئەحمەدی برای گەڕانەوە بۆ بوخارا، پێشەوا بوخاری بڕیاری دا کە لە مەککە لەخزمەت بەیتا بمێنێتەوە، بۆ وەرگرتنی زانست، ماوەیەکی باش لەزاناکانی مەککەو مەدینە، فەرموودەیەکی زۆری وەرگرت، ئەوجا بەرەو عێراق درێژەی بەگەشتەکەی دا، ماوەیێ لە کووفەو بەصرەو بەغدا مایەوە، پێنج ساڵ لەبەصرە بوو، هەر پێنج ساڵەکە حەجو عەمرەی کرد، لەبەغدا بەخزمەت ئیمامی ئەحمەد دەگا، دەبێ بەفەقێی، کاتێ ئیمامی ئەحمەد دەمرێ، بوخاری لەجێگەی ئەو کرا بە ماموستای زانستگای حەدیث لەبەغدا.

بەڵێ جەنابی شێخی بوخاری لەپێناوی خزمەتو ڕاژەی سوننەتی پێغەمبەردا ساخ بۆ ڕەزای خوداو بەس، بوخاراو سەمەرقەندو حیجازو شامو عێراقو میصرو زوربەی وڵاتەکانی ئاسیا گەڕاوە، قەبووڵی غەریبیو ئاوارەییو برسێتیو تونێتیو خەتەری ڕێگەو بانی پڕ لەخەتەری کردووە، بەهەزاران میل ڕێگەی بڕیوە، سەرماو گەرمای زۆری چەشتووە، بەهەزاران کۆڕی زانستیی بەستوە، بەسەدان ماموستاو فەقێی بووە، هەموو جارێکیش لەپاش کۆششو لێکۆڵینەوەیەکی باش، کاتێ فەرموودەیەکی بەدڵی خۆی دەست دەکەوت، کەدەقەکەی بێ گەردبێو ڕشتەکەی (واتە: سەنەدەکەی) بێ نەنگ بێ، دەسنوێژێکی جوانی دەگرت، غوسڵێکی سوننەتی دەکرد، ئەوجا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی سوپاسی خوای لەسەر ئەم بەهرە گەورەیە دەکرد، کەئەو فەرموودەیەی دەست کەوتووە، ئەوجا فەرموودەکەی لەبەر دەکردو لەپاشا لەناو

